# کورد

## له گەمەی دەقە یاساییەکاندا

وردبوونەوە لە دەستووری هەمیشەیی "العراق"

جوهر نامق سالم

# کورد

## لە گەمەی دەقە یاساییەکاندا

وردبوونەوە لە دەستووری هەمیشەیی "العراق"

جوهر نامق سالم

ناوی کتێب: کورد لە گەمەی دەقە یاساییەکاندا - وردبوونەوە لە دەستووری هەمیشەییی "العراق"
نووسینی: جوهر نامق سالم
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٦٤٢
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: تاریق عومەر نامیق
دەرهێنانی بەرگ: عومەر جاف
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٧
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٩٨٠)ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

## ئەم بەرهەمە پێشکەشە:

بە (نێرگز)ی هاوسەرم، بۆ ئەو هەموو ماندووبوون و بایەخدانەی سەبارەت بەرەخساندن و دابین کردنی کەش و ژینگەیەکی گونجاوی ناو ماڵ ومنداڵ، بەو ئاستەی کە بتوانین ئەم ئەرکە بە جێ بێنین و، هەندێ جاریش راوێژکار وراستکەرەوەی هەندێ لایەنی زمانەوانی...
بە کاکە یاوەری برام، کە ئەرکێکی گەورەی لایەنەکانی کۆمەڵایەتی دەرحەق بە خۆمان و کەس و کارو خزمان و دۆستانی ئێمەی خستۆتە ئەستۆی خۆی.
بە (٣) جگەر گۆشەکەم کاکە (سیروان) و کاکە (ئاران) و خاتوو (ساهی).

# پێشەکی

ئەزموونی زیاتر لە ١٦ ساڵی دەسەڵاتی (ئازادی) خۆماڵی کورد لە (هەرێمی) کوردستان و، زیاتر لە (٤) ساڵ لە (رزگار)ی العراق، هەرچەندە لە واقیعدا، نە ئەو (١٦) ساڵەی (ئازادی هەرێمی کوردستان) بە فیعلی کۆمەڵگای کوردەواریمان ئازاد بوو و، نە ئەو (٤) ساڵەی رزگاری (العراق)یش وەکو واقیع رزگار بووین، چونکە لە قۆناغی (ئازادی هەرێمی کوردستان) لە پاش ساڵی ١٩٩١و، دامەزراندنی (دەسەڵاتی خۆجێیەتی)و، بە هۆی (تۆڕێکی) نەخشەو پلان و بڕیاری ناوخۆ و عێراقی و ئیقلیمی و نێودەوڵەتی، ئەم هەرێمە گەمارۆ درابوو، مەترسییەکانی دەرەکی و ناوەکی، وەکو شمشێری (دیمکۆلیس) گشت ئازادییەکانی کۆمەڵگای کوردەواریمانی لە قالب دابوو، لە بواری جیاجیاشدا پێشێل دەکراو رووداوی ناخۆش و تراجیدیاییشی لێ دەکەوتەوە...

ناوچە تەعریب کراوەکانیشمان کە رووبەری پتر لە (٥١٪)«١»ی خاکی کوردستانی باشوورمانەو، رێژەی کوردەکەشی لە سنووری (٥٠٪)ی کۆی گشتی دانیشتوانیەتی، زوڵم و زۆرو موعاناتیان دووبارو سێ باری ناوچە (ئازادەکەمان) بوو، کە قۆناغی (رزگاری العراق) دەستی پێ کرد کوردو گشت پێکهاتەکانی (العراق)، لە مێردەزمەی سەدام و سەدامییەکان رزگار بوو، زۆری پێ نەچوو (العراق) بە کوردستانیشمانەوە داگیر کراو، بوو بە ناوچەیەکی جەزبی ئیرهاب و شەڕی تایفەگەری و رەگەزی و تیرۆرو مەڵبەندی یەکەمی گەندەڵی سیاسی و ئابووری و ئیداری لە جیهاندا.

واتا گۆڕینی پرنسیپی (رزگاری) بە (داگیرکردن)و، توندوتیژی و شەڕی ناوخۆ و قەیرانی ئابووری و نەبوونی خزمەتگوزاری لە ئاستی پێویست و قڕو قاتی و گرانی، کە شان بە شانی تیرۆرو گەندەڵی، بەهاو ناوەڕۆکی ئەو (رزگاریی)یەی بەتاڵ کردەوە، یان هەر هیچ نەبێت لەکەدار و کەم کردەوە.

---

**«١» بڕوانە خشتەی ناوچە دابڕاوەکان و رێژەی دانیشتووان و پانتاییەکانیان لە پاشکۆی ژمارە «٩»**

کوردستانیش لە هەر هەموو ئەو دیاردانە بێ بەش نەبوو، سەرەڕای مانەوەو بەردەوام بوونی تەعریب و تەهجیر وەکو بیروبۆچوون و سیاسەتیش، بگرە لە هەندێ بواردا زەق و ترسانکترە، بە تایبەتی شەڕی رەگەزی و تیرۆری کورد لەسەر ناسنامەو کردنەوەی دەرگای هەرێمی کوردستان بەرامبەر گشت بەرژەوەندییە دەرەکییەکان، مەنەپۆل کردنی بوارەکانی سیاسی و ئابووری و هوشیاری، لەژێر چەتری (بازاڕی ئازاد)و وەبەرهێنان، سەروەت و سامان و خاکی کوردستان بەرەو فرۆشتن و تالآن کردن دەڕوات و، خەڵکەکەشی رووبەرووی قەیرانێکی ئابووری و سیاسی و کۆمەلآیەتی بووەتەوەو، سیما سەرەکییەکانی:
پاوەنخوازی و قڕو قاتی و گرانی و نەبوونی سەرەتاکانی خزمەتگوزاری وەکو پێویست، بە تایبەتی کارەبا و ئاو و سووتەمەنی و، بلآوبوونەوەی ڤایرۆسی گەندەڵی لە شادەمارەکانی ژیانی ئیداری و کۆمەڵگاو، پشت بەستنی دەسەلآتە فەرمییەکەی بە بێگانە، لە بارەی ئابووری و بواری ژیانی رۆژانەی خەڵکی کوردستان و، رەهن کردنی چارەنووسی پرسەکەی بە بەرژەوەندی زلهێزی ئەمریکاوە، بێ هیچ گەرەنتییەکی فەرمی دیکۆمێنت کراو لە نێوان هەردوولا، ئەمەش وای کردووە کە ئاسۆی دۆزی کورد لە کوردستانی باشوور، تەڵخ بێت. دیارە گەمەی سەرانیشی لەسەر هاوپەیمانیەتی ئەمریکا بێ بنەمایە..!
ئەمریکا یەکەم زلهێزی جیهانی ئەمڕۆیەو، ولآتێکە لەسەر فەلسەفەی پراگماتیکی بنەمای دیموکراتی دروست بووەو دەوڵەتێکی موئەسەساتییەو، مەودای مناوەرەو بادانەوەی زۆرەو خۆی بە قسەی سەرزارەکییەوە نابەستێت، ئیدارەکەی لە العراق و لە ناوچەکە تووشی کۆمەڵێک گیروگرفت بووە. لە پێناو رزگار بوون لەو گیروگرفتانە چەندجار بە خۆیدا چۆتەوەو، ژمارەیەکی زۆر لە لێپرساوان و دانەرانی ئەو سیاسەتە ناچار کران، یان دەست لە کار بکێشنەوە، یان دەرکرێن. هەر بۆ نموونە: (کۆلن پاوڵ) وەزیری دەرەوەو (رامسفیلد) وەزیری بەرگری و، پێشتریش بریکاری هەمان وەزارەت و سەرۆکی (CIA) و، (گارنەر)و، (برێمەر) سەرۆکی ئیدارەی داگیرکەری ئەمریکا لە العراق و (خەلیل زاد)و، چەندین بەرزە لێپرساوی دیکە. هەر هەمان سیاسەت و ئیستراتیجیەتی بۆش و ئیدارەکەی لەمەڕ العراق هۆکاری سەرەکی دۆڕاندنی حزبی کۆماریی ئەمریکا بوو لەهەڵبژاردنەکانی پارساڵی کۆنگریس، کە دیموکراتەکان زۆرینەی هەردوو ئەنجومەنیان وەدەست هێناو، بەمەش

رۆژ له دوای رۆژ (بۆش)و ئیدارەکەی تەنگاو دەکرێن، تاکو ئەو رادەیەی ئیدی نە (بۆش) خۆی و، نە بەرزە لێپرسراوەکانی باسی پرۆسەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە، یان رۆژهەڵاتی نوێ نەکەن، کە لە قامووسی راگەیاندنی خۆیاندا سڕیانەوەو، لە دوا ئیستراتیجیەتی راگەیەندراوی (بۆش)«٢» بە هیچ شێوەیەک زاراوەی ئەو پرۆسەیە بە گەورەو بچووک و نوێوە نابینرێت و، باسی گۆڕین و بەدیموکراتی بوونی ناوچەکە و شارستانیەت تاکو دێت لاوازو سیس دەبێتەوەو، ئێستا پەنا بۆ ولاتانی (میحوەری شەڕ) دەبەن بۆ هێور کردنی بارودۆخەکەو دۆزینەوەی رێگاچارەیەک بۆ رزگار بوون لە زەلکاوی العراق و، راپۆرتی (بیکەر- هاملتۆن)و، راپۆرتەکەی گروپی قەیرانەکانی نێو دەوڵەتی..هتد، گوزارە لە روویەکی دیکەی ئەو ئیستراتیجیەتە دەکەن...

لە نوێترین هەوڵی تاوتوێ کردنی بارودۆخی هێزەکانی ئەمریکاو ئیستراتیجیەتی ئیدارەی بۆش لە (العراق) راپۆرتی دەزگای (CIA) لە رۆژی ٢٠٠٧/٥/٢٤ کە ئاژانسەکانی هەواڵ ئاماژەیان بۆ کردووە وەکو هەڵسەنگاندنێکی ئەم دەزگایە سەبارەت بە بارودۆخی (العراق)، کە نیاز وایە بخرێتە پێش کۆنگریسی ئەمریکی، وەلێ هەڵسەنگاندنی بارودۆخی العراق لەلایەن جنەراڵ (دوگلاس لوت) لەبەرامبەر کۆنگریسی ئەمریکا بە دڵی(بۆش)و هەندێ لە بەرزە لێپرسراوانی ئیدارەکەی نەبوو، کاتێک ناوبراو بەراشکاوی جەختی لەسەر ئەوە کرد کە بەش بە حاڵی خۆی چی بەرەو پێش چوونێکی ئەوتۆ لە رەوشی عێراق بەدی ناکات، ئەگەر هەبێتیش زۆر کەمەو، جنەراڵ (لوت) لەو باوەڕەدایە کە «چارەسەری سەربازی سوودی نییە»، ئەو راپۆرتە ددان بەوەدا دەنێت کە هەم ئەو شەڕە لە عێراق شەڕی ناوخۆیەو، هەم بوونی ئەمریکا لە العراق نەک هەر یاریدەدەری هێمن کردنەوەی دۆخەکە نییە، بەڵکو ئاڵۆزی دەکات و هاندەری تیرۆریشە.

سەرباری هەر هەموو ئەوانەی سەرەوە، باری ئابووری و سیاسی ناوخۆ، خەڵکی کوردستانی نارەحەت کردووەو، دیاردەیەکی خەتەرناک و هەڕەشەیەکی جیدیە لەسەر ئاسایشی نەتەوایەتی..!

وا لەم (هەرێمە) دوو چینی لەیەک جودا بە دی دەکرێت و، رۆژ لە دوای رۆژ شێوەو شێوازی ژیان و بیرکردنەوەو هەڵوێستیان بەرامبەر بە یەک و رووداوەکان لە یەکتر

---

«٢» بروانە دەقی ئیستراتیجیەتی نوێی بۆش لە پاشکۆی ژمارە «٨»

دەترازێن و، پانتایی و قوڵایی لە نێوانیاندا فراوان و زەقتر دەبن و، شان بەشانی ئەمەش وا چینێکی مشەخۆرو فرسەت تەڵەب بەسوود وەرگرتن لەبازنەی تەسکی دەسەڵات و نەبوونی بەدواداچوون و چاودێرییەکی یاسایی و ئیداری، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە پەرەسەندندایەو دۆخەکەش تەشەنە دەکات، گومان لەوەدا نییە کە واقیعی ئەمڕۆی کوردستان و کێشەی کورد، کە خودی ئەم دیاردەیە لەسەر دوا ڕۆژی ئەزموونەکە دەبێتە مەترسییەکی دیکە.

پێش ئێستاو لە چەند بابەتێکماندا هەمیشە جەختمان لەسەر ئەوە کردووە کە ناوەڕۆکی کێشەی کورد لە کوردستانی باشوور واقیعی تەعریب و سنووری کوردستان و سەروەت و سامانەکەیەتی. دیارە هەر لە پاش رزگاری (العراق)و دواتر (داگیر کردنی) لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاوە، لە بەهاری ۲۰۰۳دا، قۆناغ دوای قۆناغ کێشەی گەڕانەوەی ناوچە دابڕاوەکانمان بەرەو بن بەست دەڕوات و نەخشەی ڕێگا لەبەرنامەی (المالکی)دا، بۆ جێبەجێ کردنی مادده (۱٤۰)، لە مێژەوە چەقیوەو، ژمارەیەکی بەرچاوی لایەنی زۆرینەی عەرەبی هاوپەیمان لە حکومەت و لە ئەنجومەنی نوێنەرانی العراق، لەگەڵ توندڕەوەکان و شۆڤینیەکان خەریکی مردار کردنەوەین، هەر بۆ نموونە بۆ یەک ئیمزای (مالکی) لەسەر چوار بڕیاری لیژنەی باڵای ماددەی(۱٤۰)، زیاتر لە مانگ و نیوێک لەسەر مێزەکەی بوو. بەو هەموو لیژنەو ئەو هەموو وەزیرو گزیرەی کوردو، ئەنجومەنی سەرۆکایەتی و جێگری سەرۆک وەزیرانی العراق کە کوردەو لیستی ئیئتلافی کوردو حکومەتی هەرێمی کوردستان و سەرۆکایەتی هەرێم و، ئەو هەموو دۆستایەتیەی لایەنی کوردی لەگەڵ ئەمریکا..هتد..!، دەڵێین سەرەڕای هەر هەموو ئەمانە، پاش نزیکەی دوو مانگ سەرۆک وەزیرانی (العراق)ی هیواو ئاشتی..!، ئەوجا (٤) بڕیاری لیژنەکەی پەسەند کرد، وەلێ:

* پاش دوو مانگ لەدواخستنی، واتا پاش ئەوەی قۆناغی یەکەمی ئاسایی کردنەوە تەواوبوو، کە لە خاڵی (۲۲)ی بەرنامەی حکومەتی مالیکیدا تەسبیت کراوە و، بڕیاربوو لە پێش ۲۰۰۷/۳/۳۱ جێبەجێ بکرێت، ئەو پەسند کردنەش پاش هەندێ دەستکاری کردن بوو بە تایبەتی:

١ . کەم کردنەوەی قەرەبوو کردنەوەی خێزانە کوردە تەرحیل و تەهجیر کراوەکان (کە دەیانەوێت بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان) لە(١٠) ملیۆن دینار بۆ(٥) ملیۆن دینار، بۆ ئەو خێزانانەی کە لەدەرەوەی سنووری شارەوانییەکانن«٣».

٢. جەخت کردن لەسەر ئەوەی کە گەڕانەوەی هاوردەکان ئارەزوومەندانەیە. بڕوانە سەرەتای بڕگە (اولا)ی نوسراوی سەرەوەی ئاماژە پێکراو،

* پاش پەسند کردنیان، بە دەنگدان لەلایەن ئەنجومەنی وەزیران، ڕاسپاردەکان نێردران بۆ ئەنجومەنی سەرۆکایەتی و ئەنجومەنی نوێنەران تاکو ئەوانیش ڕەزامەندی لەسەر بدەن و پەسندیان بکەن بەپێی نوسراوەکانی ژمارە(٥٨٢٨و ٥٨٢٩و ٥٧٣٠و٥٨٣١و٥٨٣٢) لە ٢٠٠٧/٤/٥.(**بڕوانە پاشکۆی ژمارە «٧»**).

* پاش ئەوەی ئەنجومەنی وەزیران ئەو بڕیارانەی بە دەنگدان پەسند کردو نێردرا بۆ هەردوو ئەنجومەنی ئاماژە پێ کراو، بەنوسراوی ژمارە (٥٧٣٠) لە ٢٠٠٧/٤/٥ ئاگاداری گشت وەزارەتەکان کرایەوە کە دەبێت ئەو چوار ڕاسپاردانەی لیژنەی(١٤٠) جێبەجێ بکرێت، بەڵام پاش ئەوەی لەلایەن ئەنجومەنی سەرۆکایەتی و ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقەوە پەسند دەکرێن«٤».

ئەم جۆرە مامەڵەیەو دەستکارییەکی وەها لەگەڵ خودی دواخستنەکە، نامەیەکی ڕاستەوخۆ و هاندەر بوو بۆ گشت تەعریبچییەکان و هەتاکو ئەوانەشی کە بەڕاستی دەیانەویست بگەڕێنەوە کە نەگەڕێنەوەو لە ناوچە تەعریب کراوەکانمان بمێننەوە، ئەگەرنا بۆ:

١- دواخستنی ئیمزا کردنی ئەو بڕیارانە کە ماددەی (١٤٠) جەختی لەسەر کردووەو وەکو هەنگاوی یەکەم ماددەیەکی دەستووریی فەرز کراوەو سەرۆک وەزیران لەبەرنامەی کاری خۆیدا تەسبیتی کردووەو، خشتەکەشی پەسند کردووە، هەم وەکو خاڵێکی ڕێککەوتننامەی نێوان هەردوو لیستی (کوردستانی و شیعە)و، هەم وەکو بەرنامەی حکومەتەکەی کە لەلایەن ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری العراق پەسند کراوە، لەکاتێکدا سەرۆک وەزیران

---

**«٣»(بڕوانە نوسراوی سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران ئەمینداریەتی گشتی ئەنجوومەنی وەزیران) ژمارە (٥٨٣١) لە ٢٠٠٧/٤/٥، بڕگە (اولا - ب). پاشکۆی ژمارە «٧».**

**«٤» بڕوانە پاشکۆی ژمارە «٧»**

دەیزانی دەبێت ئەو بڕیارانە پێش ۲۰۰۷/۳/۳۱ جێبەجێ بکرێت و لیژنەکەش جەختی لەسەر ئەوە کردووە، کەچی سەرۆک وەزیرانی ناوەندی (العراق) لەسنووری دوو مانگ لای خۆی دوای دەخات و، بە یەک دوو ڕۆژ لە پێش ۳/۳۱ بەو هەموو دەستکارییەوە ئیمزای (۳)یان دەکات و باسی چوارەمیانی نەکردووە. تاکو ئێستاش نازانین ئایا ئەو هاوردانە کە دەیانەویست بگەڕێنەوە بۆ پاشگەز بوونەوە. خۆ مالیکی دەزانێت خودی ناوەڕۆکی ماددەی (۱٤۰) سەبارەت بە گەڕانەوەی ئاوارەکان ئیجباری نییەو (بە ئارەزووە)، هەر ئەمەش خۆی لە خۆیدا جێگای ڕەخنەو گومانی کوردستانییەکانە لە جدیەتی ناوەندی بەغدا لەمەڕ بنبڕ کردنی پرۆسەی تەعریب.

۲- بێ دەنگی سەرۆک وەزیرانی ناوەندی بەغدا سەبارەت بە بڕیاری چوارەمی لیژنەکە لەمەڕ هەڵوەشاندنەوەی گشت گرێبەستە کشتوکاڵییەکان کە بە مەبەستی تەعریب، حکومەتی سەدام ئەنجامی داوە، نیازی ئەم حکومەتە بە زەقی وەدەر دەخات و، مانەوەی ئەو زەویوزارانە کە لە کوردەکان (زەوت کراوە) وەکو بزمارەکەی (جوحا) لەو ناوچانە دیارە هەر دەمێنێتەوە.

سەیر لەوەدایە لە سەرەتای خاوکردنەوەی قۆناغی یەکەمی ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی کەرکوک و گشت ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان هیچ جۆرە ڕەتدانەوەیەک یان جموجۆڵ و هەوڵێکی فەرمی، یان ڕاگەیاندن یان جەماوەریمان نەبینی و نەبیست، جگە لە هەندێ گلەوگازندەی ژێر لێوان.

(٥۱ ٪) لە خاکی وڵاتەکەمان تەعریب کراوە، کە ڕووبەرەکەی (٤)جار لە ڕووبەری وڵاتی لوبنان و، دووجار لە ڕووبەری فەڵەستین زیاترە کەچی بۆ چەند هەنگاوێکی هەتیو سەبارەت بە ماددەیەکی دەستووریی و مولزەم، نەماندیت نوێنەرانی کورد لە بەغدا هەڵوێستێکی کوردانە بنوێنن، هەر چی نەبێت لەسەر دواخستنی ئیمزا کردن و ئەو دەستکارییە، یان نەمان دیت فراکسیۆنی کوردستانی لە ئەنجومەنی نوێنەران سەرۆک وەزیران ڕاکێشن بۆ ئەنجومەن بۆ ئەوەی (استجواب) بکرێت سەبارەت بە کەم تەرخەمی و، وەلاوە نانی جێبەجێ کردنی کێشەیەکی وەها گرنگ کە هەم دەستوورییەو، هەم خاڵێکی گرنگی هاوپەیمانی لایەنی کوردستانییە لەگەڵ ئیئتلافی شیعی کە بووە مایەی ئەوەی باوەڕ بدرێت بە (المالکی) بۆ ئەوەی ببێت بە سەرۆک وەزیران کە دواتر دەنگیشی لەسەر درا لە ئەنجومەنی نوێنەران.

ئەگەر ئەو زاتانە هەڵوێستی وەهایان نواندبێت، ئەوە خەڵکی کوردستان هێشتا لای شاراوەیە، یان ئەگەر نیازیشیان بێت هەڵوێست وەربگرن دیارە سەرکردایەتی فەرمی کوردستان هاندەریان نەبووە. ئەم واقیعە بە هەردوو رووەکەیەوە واتا دیاری نەکردنی هەڵوێست و نەبوونی دەستپێشخەری نوێنەرانی کورد لە ناوەندو، جۆرە بێ دەنگییەکەی سەرکردایەتی فەرمی کوردستان لەمەڕ ئەو دیاردەیە، گومان و دوودڵی لای خەڵکی کوردستان دروست کردووە. ئەمە ئەزموونێکی رابردوومان بیر دێنێتەوە کە زۆر جار لەبازنە جیاجیاکانی کۆمەڵگای کوردەواریمان ئاماژە بە وتەیەکی بە نرخی بارزانی نەمر دەکرێت کە لە دوای مۆر کردنی رێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ ئاراستەی وەزیرو لێپرسراوانی ئەودەمی کردبوو کەبەنوێنەرانی کورد لە بەغدا دەست بەکار بوون: (**بۆمباو تۆپ و تانکی دوژمن نەیشکاندین هۆشتان هەبێ بە ترۆمبێل و کۆشک و کورسی و پلەو پایە دوژمن کێستان لێ نەهێنێ، با ئەوەی بە خوێن دەستمان کەوت بە دینار لێمان نەسێنێ**)«٥».

سەیرە هاوپەیمانیەتی کوردستان لە ئەنجومەنی نوێنەران لە دانیشتنی ئەنجومەن کشانەوە لەبەر ئەوەی داوا کرابوو لە سنووری (٧) ملیۆن دۆلار لە بودجەی (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی کۆمار) کەم بکرێتەوە، کە کەمتر بوو لە (١٪)ی ئەو بودجەیە، کەچی ئامادە نەبوون تەنانەت هەڕەشەی کشانەوەش بکەن ئەگەر هاتو سەرۆک وەزیران پرۆسەی ئاسایی کردنەوەی کەرکوک لەکاتی خۆیدا ئەنجام نەدات. وەکو لە خشتەکەدا هاتووە.

هەڵوێستی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی العراق سەبارەت بە چوار بڕیارەکەی لیژنەی باڵای ماددەی (١٤٠)، ئەگەر چی پاش مشتومڕێکی زۆر و فشاری لایەنی کوردستانی، **لەپاش بەسەردا چوونی کاتی قۆناغی یەکەمی پرۆسەی ئاسایی کردنەوە هەڵوەشایەوە**، بەڵام ناوەڕۆکی ئەو هەڵوێستەو رۆحی ئەو چوار نووسراوەی ئەنجومەنی وەزیرانی ناوەندی بەغدا هێشتا زیندووەو تەعبیرێکی راست و دروست لە دڵ و دەروونی ئەوان دەکات، راستە ناچار کران رایگرن وەلێ تاکو نووسینی ئەم دێرانە چوار بڕیارەکەی ئەو لیژنەیە جێبەجێ نەکراوە. گشت کوردێکی دڵسۆز بە گەل و نیشتمان سوورە لەسەر نەهێشتنی تەعریب و گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتی، وەلێ

---

**«٥» سەرچاوە: کتێبی بیری نەتەوایەتی و کوردایەتی لای بارزانی نەمر- پ.د.شوکریە رەسول-ل٢٢.**

ئەگەر زۆر بە هێمنی و بە سەرێکی ساردو بە وردی لەو چوار نووسراوەی ئەو ئەنجومەنە بکۆڵێتەوەو، لە چۆنیەتی خاوکردنەوەی و کاردانەوەی (رد فعل)ی سەرکردایەتی فەرمی کوردستان بنوارین، چەند لایەنێکمان بۆ روون دەبێتەوە:

١- ئەم ئەنجومەنەو گشت دام و دەزگاکانی لەوپەڕی لاوازیدان و گیرۆدەی داگیرکەری ئەمریکان و، گوایە ئەمریکییەکانیش هاوپەیمانی کوردن، کەچی ئەوە هەڵوێستیانە!.

٢- سەرۆکایەتی ئەم ئەنجومەنەو گشت ئەندامانی هەتاکو ناوچەی سەوزی بەغدایان پێ ناپارێزدرێت و لەحاڵەتی شەڕێکی تایفەگەری و رەگەزیدا ئەژین. وەلێ بەرامبەر بە کورد و کێشەکەی نەک هەر سازشکەر نین، بەڵکو مافە سەلمێنراوەکانیشی پێ نادەن..!

٣- ئەم ئەنجومەنە گوایە تەعبیر لە عێراقی نوێ دەکات (عێراقی هیواو ئاشتی)و، دیموکراتی و فیدراڵی هەر وەکو لە دیباجەی دەستوورەکەیاندا هاتووە کە گوایە عیبرەتیان لە رووداوەکان و کارەساتەکانی پێشووی ئەم وڵاتە وەرگرتووە«٦». کەچی نەک تەنها نەفەس و گیانی شۆڤینیزم و رەگەزپەرستی تێدا زاڵە، بەڵکو هەردوو باڵەکەی پەتای تایفەگەری بەرامبەر بە کورد یەکگرتوون و تاکو دێت هەڵدەچن و لە هێرشدان.

٤- هەر وەکو سەرانی کورد هەمیشە جەختی لەسەر دەکەن کورد تەرەفێکی بەهێزو کاریگەرو هاوکێشەی دەسەڵاتن و، بێ کورد هیچ لەم عێراقە ناکرێت و لە هەموویشی گرنگتر سوور بوونیان لەسەر ئەوەی کە هیچ بڕیارێکی چارەنووسساز لە بەغدا وەرناگیرێت بێ کوردو هەموو بڕیارەکانیش بە (تەوافق)ە، کەچی ئەو چوار بڕیارە لە ئەنجومەنی وەزیران بە دەنگدان بوو. ئەمەش نەک تەنها لادان بوو لە بەرنامەی حکومەتی (المالکی)و پرنسیپی (التوافق)، بەڵکو لادانیش بوو لە دەستوورو، بوونی کورد لە ناوەند جارێکی دیکەش دەخاتە ژێر پرسیارەوە!.

٥- واتا هەڵوێستی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران لەسەر چوار بڕیارەکەی لیژنەی باڵای ماددەی (١٤٠)، دژی خودی دەستووری (العراق)ەو پرنسیپی (التوافق)! و، دەسەڵاتی لیژنەکە بوو.

«٦» بڕوانە دیباجەی دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق لە پاشکۆی ژمارە «١».

٦- هەڵوێستی دروستی لایەنی زۆرینەی عەرەبی باڵادەستی العراق ئەوەیە، هەروەهایشە وەکو (قاعیدە)یەک ئەوەی کە پاشگەزبوونەوە لێی (ئیستثنایە)و، سەیر لەوەدایە سەرانی فەرمی کوردستان رۆژانەو لە مێژەوە ئەم راستییە دەزانن، هەندێ جاریش بەشدارن لە پتەوکردنی، کەچی لە راگەیاندن و کۆبوونەوەکانیان لەگەڵ خەڵکی کوردستان نکۆڵی لێ دەکەن و هەوڵی ئەوە دەدەن ئەو خەڵکە چەواشە بکەن و راستییەکانی لێ بزر بکەن.

بەندە لەو باوەڕەدایە چەند بیروبۆچوون و هەڵوێستی دەسەڵاتی ناوەندی بەغداو، فشاری ئیقلیمی و، ئەمریکا، جێگای مەترسیمان بێت لەمەڕ ناوچە دابڕاوەکانمان و، خودی کێشەی سنووری کوردستان و، دوا رۆژی (تەعریب)و، دژی خواست و ویستی خەڵکی کوردستان بێت، ئەوەندەش لەو بیروبۆچوون و تەنزیرەی هەندێ لە بەرپرسانی ئەمڕۆی کورد دەترسم، بە تەحدید ئەوانەیان کە داکۆکی لە بە هێز کردنی ناوەندی بەغداو یەکێتی خاکی عێراق دەکەن و، ئەو هەموو (عێراقچیەتەی) لێیان دەبارێت کە بە موناسەبەو بێ موناسەبە خۆیانی پێوە هەڵدەکێشن و، لە کاتێکدا (٥١ ٪ )ی خاکی کوردستانی باشووریان کرد بە ناوچەیەکی (المتنازع علیها)و مافیان دا بە عەرەبە تەعریبچییەکان وەکو کورد بەرگری لە مافی خۆیەتی ئەو خاکە بکەن! و چارەنووسی ئەو ناوچانەیان خستە دەستی ریفراندۆم و بڕیاری زۆرینەی عەرەب و، لەبیری خۆیان بردوەتەوە کە ئەوان بە دەست و بازووی خۆیان ئەو پۆستانەیان لە بەغدا وەرنەگرتووە، بەڵکو نوێنەری خەڵکی کوردستانن و، هەر لەبەر ئەوەی کە نوێنەری کوردن دەبێ داکۆکی لە مافی کورد بکەن و نەهێڵن ناوەند ئەجینداکانی خۆی فەرز بکات یان بەسەریاندا دەربازی بکات. یان ئەوانەی کە لە ژێر پەردەی لیبراڵ و ناسیۆنالیزم و پراگماتیک و مۆدێرن و شارستانی، هەوڵی سڕ کردنی هاووڵاتیانی کوردو خاو کردنەوەی پرۆسەی نەهێشتنی تەعریب و تاڵان کردنی سەروەت و سامانی کوردستان دەدەن و، وا دەکەن هەندێ لە مافەکانی دیکەشمان پشتگوێ بخرێت، بە پاساوی ئەوەی کە جارێک بارودۆخەکە نالەبارەو نابێت پەلە بکرێت و، دەوروبەر لە خۆمان ئاڵۆز بکەین و، پرۆسەی ئەمریکا لە عێراق و ناوچەکە تووشی کۆسپ و گیروگرفت بکەین و، با تورکمان و عەرەبی برامان لە خۆمان نەکەینە دوژمن، لەوەش تاوانتر ئەوەیە کە دەڵێن با ئەم (فرسەتە)و

ئەم (دەسکەوتەی) کە ئەمڕۆ هەمانە لە دەستیان نەدەین لە پێناوی کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکانی دیکەمان، (مەگەر ئەوە ئێمە نین حوکمی بەغداو کوردستان دەکەین..!)، سووریش دەبنەوە کاتێک باسی ناوەندی بەغدا دەکەن و لە مالیکی و حکومەتەکەی زیاتر دیفاع دەکەن لە عروبەت و یەکێتی و بەهێز کردنی (العراق)، تەنانەت مرۆڤ ئەوەی نییە لای ئەمانە باسی ئەمریکاو هەڵوێستی ئەمریکا بکات، کە باسی ئەم دوولایەنە دەکەیت یەکسەر دەماری ملیان ئەستوور دەبێت و گیف دەبنەوەو چەند بار دووپاتی هەمان مەنەلۆگ دەکەنەوە کە حکومەتی مالیکی پابەندە بە جێبەجێ کردنی ماددەی (١٤٠)ـەوە. گوایە ئەمریکا لەگەڵ ئەوەیە کە ماددەی (١٤٠) جێبەجێ بکرێت. ئەمە ماددەیەکی دەستوورییە! وەکو بڵێیت ماددەی دەستوور (ئایاتی قورئانە)!!.
کەی ئەم حکومەتە یان ئەوانەی پێش ئەمانەش، مولزەم بوونە بە یاساو دەستوور، ئەوە نییە ئەوەی ڕێزی لێ نەگیرێت و حیسابی بۆ نەکرێت لەوێ و لێرە، یاساو دەستوورە! ئێمەش دەڵێین نە ناوەندی بەغدا و نە ئەمریکا نکوڵییان نەکردووە لە ماددەی (١٤٠)، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە کێ و چۆن و کەی جێبەجێ دەکرێت؟!.
ئەم فەریکە لیبراڵ و (موتەئەمریکانە) هەندێ جار کێشەکە وا ئاڵۆز دەکەن لە خەڵکی ستەمدیدەی کوردستان، تا ئەو ڕادەیەی خەڵک وا بزانێ کە ئەگەر هاتوو لایەنی کوردی سوور بێت لەسەر ئەو پرنسیپانە ئەوە باری عێراق و ناوچەکە ئاڵۆزتر دەبێت و دوور نییە شەڕێکی ئیقلیمی و نێودەوڵەتی لەسەر کەرکوک و ناوچە دابڕاوەکان دروست بێت! ئەمانە لایان وایە لاسایی کردنەوەی ژیانی ئەمریکی و بەکار هێنانی زاراوەکانی عەولەمەو شەفافیەت و دیموکراتی و ئیرهاب ئیدی تەواو بوون بە مۆدێرن، بەقیاساتی ئەمریکا، واتە ماف و خواستی میللەتی خۆت پشتگوێ بخەیت لە پێناوی بەرژەوەندی خەڵکی تر، ئەمەش بە دیدی ئەمانە یەک لە پێوەرەکانی بوون بە دیموکراتی و مرۆڤ دۆستی و شارستانی و ئاشتیخوازییە.
کەی شۆڤینییەکانی عەرەب کە هەمیشە و تاکو ئێستاش خاوەن دەسەڵاتن لەم عێراقەدا نیازیان پاک بووە لەگەڵ کورددا. کەی تورکیاو وڵاتانی دراوسێ ددانیان بە کوردو کێشەکەیدا ناوەو، کەی ئەمریکا راستی کردووە لەگەڵ ئەم نەتەوەیە. بۆ لەسەر کێشەی تەعریب و گەڕانەوەی کەرکوک بۆ باوەشی هەرێمی کوردستان، ئاشتی ئیقلیمی و جیهانی تێک دەچێت، ئەمەی کە پێی دەڵێن دەسکەوت کامەیەو

چییه که له کیسی کورد دەچێت..؟! چەند پۆستێکی بێ دەسەڵات له بەغدا، یان پاڵدانی خەڵکەکەی بۆ تەمبەڵی دوور له گیانی لێپرسراویەتی و له دایک بوونی رۆژانەی ملیۆنێرەکانی بازنەی دەسەڵات و، تەهجیرو راونان و تیرۆری کوردەکانی ناوچه تەعریب کراوەکانمان و تێکدانی ژێرخانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی گەلی کوردستان... هتد! کەی دەستکەوتن..؟!
ئەگەر کار وا بڕوات دەبێت خەڵکی ناوچه دابڕاوەکانمان ئیدی بیرێک له خۆیان و دوا رۆژیان بکەنەوە، تاکو ئەم جۆرە پاساو و تەنزیرەش له کایەدا بێت، ئەوا ئەو ناوچانەو خەڵکی ئەو ناوچانه ناگەڕێنەوە بۆ باوەشی کوردستان. ئەم تەنزیرچییانه(!) دەسەڵات و فیدراڵیەت و سەربەخۆیی خۆیان وەرگرتووەو که قەوماش وەکو بەرزەکی بانان بۆی دەردەچن. که کارەساتیش قەوما هەر خەڵکی ئەو ناوچانه به پلەی یەکەم دەبنه قوربانی و تراجیدیاکەش بەشی ئەم گەل و نیشتمانەیە!!
ئەم بابەتانەی که ناوەڕۆکی ئەم کتێبەیە له بنەڕەتدا زۆربەی زۆری زنجیره وتارێک بوون له کاتی خۆیدا له رۆژنامەو سایتەکانی ناوەوەو دەرەوەی وڵات بڵاو کراونەتەوە، به تایبەتی له رۆژنامەی «خەبات» و «هاوڵاتی» و سایتی «دەنگەکان» و «کوردستان نێت» له نێوان کۆتایی ساڵی ۲۰۰٦ و سەرەتای ئەمساڵ. لێرەدا وەکو خۆی له نێو ئەم کتێبەدا کۆ کراوتەوە لەگەڵ هەندێ بەڵگەو دیکۆمێنت که باسەکانمان پشتی پێ بەستووە وەک له بەشی پاشکۆکاندا هاتوون، به ئومێدی ئەوەی توانیبێتمان وەڵامی هەندێ پرسیاری پەیوەندار به کێشەکانمان دابێتەوەو، رەش و رووتی گەلەکەمان لێ ئاگادار کردبێتەوەو، جەخت کردنمان لەسەر بارودۆخی ناوخۆی کوردستان مۆرانەی گەندەڵی و کەڵکەڵەی دەسەڵات و هەڵپه هەڵپەی کۆکردنەوەی سەروەت و سامان و پشتگوێ خستنی داخوازییه رەواکانی خەڵکی کوردستان و خاوکردنەوەی کێشەکەی و گرێدانی بەسیاسەت و دەسکەوتی رۆژ، که خاڵی هەرە لاوازی لایەنی کوردستانییه لەم ململانێیەدا، به ئومێدی ئەوەیه که هەموو لایەک به جیددی و هوشیارتر هەوڵی رێگاچارەیەک بدەن!.. داوای لێبوردن له خوێنەرانی ئازیز دەکەین سەبارەت به کەم و کورتی زمانەوانی و بیروبۆچوون و تەرح و خوێندنەوەی جودامان وەکو چاودێرێک لەمەڕ کێشه هەنوکەییەکان.

دوور نییه، وەکو چاودێرێکی سیاسی کوردو، لە بارودۆخی ئەمڕۆی ئێمەدا، باس کردن و بە دواداچوونی پرسە هەنوکەییەکانی سەر گۆڕەپانی کوردستان، ئەوەندە ئاسان نەبێت. لەگەڵ ئەوەش هەندێ جار لە ژێر فشاری ڕووداوەکان و هەست کردن بە بەرپرسیاریەتی وەکو هاووڵاتییەک و مرۆڤێکی تاکی ئەم نیشتمانە، ناچار خۆمان لە هەندێ لایەنی ئەو پرسە بدەین و، گەڕان بەدوای بەڵگەنامەو دیکۆمێنت و ڕاستییەکان، هەل و کات و بیندرێژی و هاوکاری زۆری دەوێت، هیوادارین لەگەڵ گشت ئەو تەنگوچەڵەمانەدا توانیبێتمان هەندێ لە خاڵەکانی مەبەستمان پێکابێت.
لەکۆتایی ئەم پێشەکییەدا بە پێویستی دەزانم سوپاسی مامۆستا خالیدو، کاکە تاریقی برازام و، کاکە عومەر جاف بکەم، کە لە پێداچوونەوە بە دەقەکان و ڕاستکردنەوەو چاپکردن و ڕێکخستنیان هەر لە سەرەتاوە تاکو گەیشتنی بە چاپخانە هاوکارمان بوون.
هەروەها سوپاس بۆ گشت ئەوانەش کە بە شێوەیەک لە شێوەکان یارمەتیدەر و هاوکارمان بوونەو، تەمەنای لەشساغی و تەمەن درێژی و بەختەوەری و کامەرانییان بۆ دەکەین. خودای گەورە یارو یاوەری هەموو لایەکمان بێت...

**جەوهەر نامق سالم**

هاوینەهەواری پیرمام- سەرەتای حوزەیرانی/٢٠٠٧

## بەشی یەکەم

# تێپەڕاندنی دەستوورو سەپاندنی ئاکامی ریفراندۆم

---

ئەم بابەتە لە ژمارەکانی (٢٣١٦ تا ٢٣٢٥) رۆژنامەی «خەبات» لە رۆژانی ٦ تا ١٥/١١/٢٠٠٦ بڵاوکراوەتەوە.

دەستووری هەمیشەیی کۆماری (العراق)، لە ریفراندۆمی رۆژی ۲۰۰۵/۱۰/۱۵و، بە زۆرینەی دەنگی (عێراقییەکان)، (تەرحیل)و، پەسند کرا.
بەڵام ئەوەتا پاش ریفراندۆم و پەسند کردنی جارێکی تریش بە هەموو ماددەو بەندەکانیدا دەچنەوە وەکو بڵێیت هیچمان لە هیچ.
لە رۆژی دروست بوونی ئەم (العراق)ـەو لە ماوەی زیاتر لە (۸٤)ساڵی تەمەنی، ئەم دەستووره حەوتەمین دەستووری ئەم وڵاتە دەستکردەیەو، ئەوەی زیاتر سەرنج راکێشە لەم بارەیەوە:

* هەر یەک لەم حەوت دەستوورەی ئەم وڵاتە، لە هەل و مەرجێکی تایبەتی و نائاسایی لە دایک بووە.
* لە کۆی گشتی ئەم (حەوت) دەستوورە، (دووانیان) هەمیشەیی بووەو، (٥)یان کاتی.
* یەکەم دەستووری عێراق، دەستووری هەمیشەیی ساڵی ۱۹۲٥ بوو، ئەو دەم دەوڵەتی عێراق، دەوڵەتێکی پادشایی بوو. دووەم دەستووری هەمیشەیی (العراق) دەستووری ئەم ساڵە، واتە ئەمەی کە لە ریفراندۆمی رۆژی ۲۰۰۵/۱۰/۱۵، دەربازو تەرحیل و پەسند کرا، کە دەوڵەتی (العراق) دەوڵەتێکی (کۆماری ئیتیحادی)ـە.
* هەردوو دەستوورە هەمیشەییەکەی (العراق) لە دوای شەڕێکی گەورەو شکست خواردنی دەسەڵاتدارانی و، پاش ئەوەی لەلایەن گەورەترین هێزی سەردەمەوە داگیر کراوەو، سەر لە نوێ دروست کراوەتەوەو دامەزرێندراوەتەوەو هاتوونەتە ئاراوە.
* ماوەی نێوان هەردوو دەستوورە هەمیشەییەکەی (العراق)، (۸۰) ساڵە (۱۹۲٥-۲۰۰٥) و، هەردووکیشی لە لایەن هێزی داگیرکەرەوە پێشنیارو بگرە فەرزیش کراوەو، بە خەڵکی عێراقیشیان قەبڵاندووە.
* هەردوو دەستوورە هەمیشەییەکەی العراق (بە کۆن و نوێیەوە)، داگیرکەر، وای کردووە کە دەسەڵات لەسەر بنەمایەکی رەگەزی و (تایفەگەری) زۆرینەی عەرەبی دابمەزرێت..!، (داگیرکەری بەریتانی «عەرەبی سوننە»و، داگیرکەری ئەمریکی «عەرەبی شیعە»).

* پێنج دەستوورە کاتیەکانی العراق لە ژێر دەسەڵاتی کۆمەڵێکی عەسکەری ئینقیلابچی و دیکتاتۆرو تاکڕەو ئامادە کراوەو، هەر خۆیانیش پەسندیان کردووەو، زۆربەیان بە شێوەیەک لە شێوەکان هەوادار و بە کرێگیراوی هەمان دەسەڵاتی داگیرکەری (ئینگلۆ ـ ئەمریکی) بوونە.

هیچ دەستوورێک لە مێژووی ئەم (العراق)ـە بە رادەی ئەم دەستوورە (واتە دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق ساڵی ٢٠٠٥):

* هێزی داگیرکەر (ئەمریکا) راستەوخۆ بۆچونی خۆی فەرز نەکردووە بە زەقی.
* هات و هاوارو دووبەرەکی لەسەر دروست نەبووە.
* مایەی دەستتێوەردان و فشاری ئیقلیمی و نێودەوڵەتی نەبووە.
* بێ حوورمەتی و رەفتاری نایاسایی لەگەڵدا نەکراوە.
* ماددەو دەقەکانی پڕ لە فرتوفێڵ و کەمین و درێژ دادڕی و گومان نییە.

ئەگەر هاتوو بۆ زۆربەی زۆری نەوەی ئەمڕۆ، تێگەیشتنی واقیعی لە دایک بوونی (٦) دەستوورەکەی پێش ئەم دەستوورە، تێگەیشتنی هەندێ ئاسان نەبێت، بەڵام (کەی...بۆ... و چۆن..)ی لە دایک بوونی دەستووری هەمیشەیی ئەم جارەیان، کە جێگای باسەکەمانە، لای زۆربەی خەڵکی کوردستان، بەتایبەتی پسپۆڕان و رۆشنبیران و سیاسەتمەداران زەق و روونە.

وەکوو مەعلومیشە، بیرۆکەو بنەمای دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق، دەگەڕێتەوە بۆ پێش ساڵی ٢٠٠٠، ئەو دەم ئۆپۆزسیۆنی عێراقی و بە چاودێری وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکاو، لە رێگای چەند پسپۆڕێکی ئەوانەوە، هێڵە سەرەکییەکانی پرۆژەی دەستوورێک بۆ عێراقی دوای (رژێمی سەدام) ئامادە کراو، پاشتر ئەو پرۆژەیە بە هاوکاری چەند یاساناس و، نوێنەرانی لایەنە سەرەکییە سیاسییەکانی عێراقی و چەند پسپۆڕی دیکەی بیانی، دەوڵەمەندتر کراو، لە قۆناغی (رزگار)ی و (داگیر) کردنی عێراق، ئیدارەی مەدەنی داگیرکەری ئەمریکی، گواستنەوەی بۆ قۆناغی حکومەتی کاتی، ئەو پرۆژەیەی خستە بەردەم (ئەنجومەنی دەسەڵاتی کاتی عێراق) پاش ئەوەی دەقە (ئینگلیزییەکەی) وەرگێڕدرا بۆ عەرەبی و، لە نێو دوو - سێ پرۆژەی دیکەدا، ئەو پرۆژەیە بووە بنەمای پرۆژەی (یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە)و، لە ٢٠٠٤/٣/٨، لە لایەن سەرۆکی ئیدارەی مەدەنی ئەمریکا لە عێراق (پۆل بریمەر)ـەوە پەسند کراو هەر

(٢٥) ئەندامی (ئەنجومەنی دەسەڵاتی کاتی عێراق) مۆریان کرد، ئیدی ئەو یاسایە بووە دەستووری کاتی قۆناغی (کاتی) و (گواستنەوەی) العراق و، هەر ئەم یاسایە بووە بنەمای ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی العراق و، لە ١٥/١٠/٢٠٠٥، هەر وەکو لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد، پەسند کرا.

پۆل بریمەر لە کتێبەکەیدا ئەڵێت: (عندما طرحت فكرة الدستور على الباچچي تلقفها ووافق على عرضها على المجلس بأكمله على انها فكرته... في الليلة التالية في منزل الطالباني، أبلغني الزعيم الكردي ان الباچچي طلع بفكرة وضع دستور مؤقت في اجتماع مجلس الحكم هذا الصباح. "ما رأيك بالفكرة يا سعادة السفير؟ من المفيد معرفة موقف الأئتلاف قبل المضي بها قدماً" اضطررت لأكتم ابتساماتي، فقد تبنى الباچچي خطة سلطة الائتلاف المؤقت على انها فكرته، والآن يصدق الطالباني فكرة الباچچي)«٧».

کاتی خۆی، بەندە، بە زنجیرە وتارێک لە ڕۆژنامەی (خەبات) بە دوورو درێژی باسی (یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە)مان کرد (بە تایبەتی ئەو ماددەو پەرەگرافانەی کە پەیوەندییان بە مافی کوردەوە هەبوو)و، پاشتریش ئەو باسەو چەند وتارێکی دیکە لە توێی کتێبێدا کۆ کرایەوە بە ناوی (ئایا فیدرالیەت وەکو خیارێکی سیاسی لە عێراق پیادە دەکرێت؟).

ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق لە ڕۆژی ١٤/١٠/٢٠٠٥، واتە یەک ڕۆژ پێش دەنگدان، دەقی پەسند کراوی فەرمی تەواو بوو. ئەگەر چی پێش ئەوە بە چەند ڕۆژێک ڕاگەیەندرا گوایە تەواو بووەو (UN)ی لێ ئاگادار کراوەتەوە.

پێش ئەوەو پاش ئەمەش، دەزگاکانی ڕاگەیاندنی (العراق) بە گشتی و، هەرێمی کوردستان بە تایبەتی و، لە زاری چەند بەرزە لێپرسراوێکی لایەنە سیاسییەکان، جاڕی بۆ درا، لە کاتێکدا هێشتا پرۆسەکە لە قۆناغی چاکسازیدا بوو، بە هۆی دەستتێوەردان و فشارو پاڵەپەستۆی ئەمریکاو وڵاتانی عەرەبی و، تەوژمی تیرۆریستان و پێ داگرتنی عەرەبی سوونە لەسەر ناشەرعیەتی ئەو ڕەشنووسەو، سوور بوونیان لەسەر سەر لەنوێ داڕشتنەوەی و، هەڕەشە کردنیان بە پەککستنی ئەم

---

«٧» عام قضيتة في العراق. النضال لبناء غد مرجو. السفير پول بريمر بالاشتراك مع مالكولم ماك-كونل) ترجمة عمر الايوبي. دار الكتاب العربي- بيروت- لبنان - ٢٠٠٦ ص٢٧٤.

رەشنووسە، بە سوود وەرگرتن لە ناوەڕۆکی مادده (٦١-ج)ی یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە، ئەوە بوو ڕۆژی ٢٠٠٥/١٠/١٤، واتە یەک ڕۆژ پێش دەنگدان، پاش ئەوەی زیاتر لە (٣) جار ڕەشنووسی ئەم دەستوورە خرایە بەردەمی کۆمەڵەی نیشتمانی، لایەنە فشارکەرەکان، هەر یەک بە مەبەستێ توانیان بۆ دواجار، دەستکاری چەند ماددەو بڕگەیەک بکەن و کەم و زیادی بخەنە سەر، پێشەکی لایەنە سیاسییەکان و پاشتر کۆمەڵەی نیشتمانی پەسندی کردو، بەو ئیزافە کردنەوە درایە ریفراندۆم و، بەپێی یەک لەو مادده ئیزافە کراوانە بە عەمەلی(دەستووری هەمیشەیی العراق) تەرحیل کرا بۆ دوای تەواو بوونی لیژنەی پێداچوونەوە بە داڕشتنەوەی دەستووری هەمیشەیی لە کارەکانی. (بڕوانە مادده «١٤٢»ی زیاد کراو).

**المادة (١٤٢):**

أولا ـ يشكّل مجلس النواب في بداية عمله لجنة من أعضائه تكون ممثلة للمكونات الرئيسية في المجتمع العراقي مهمتها تقديم تقرير إلى مجلس النواب، خلال مدة لا تتجاوز أربعة أشهر، يتضمن توصية بالتعديلات الضرورية التي يمكن إجراؤها على الدستور، وتحلّ اللجنة بعد البت في مقترحاتها.

ثانيا ـ تعرض التعديلات المقترحة من قبل اللجنة دفعة واحدة على مجلس النواب للتصويت عليها، وتعد مقرة بموافقة الاغلبية المطلقة لعدد أعضاء المجلس.

ثالثا ـ تطرح المواد المعدلة من قبل مجلس النواب وفقا لما ورد في البند (ثانيا) من هذه المادة على الشعب للاستفتاء عليها خلال مدة لا تزيد على شهرين من تاريخ إقرار التعديل في مجلس النواب.

رابعا ـ يكون الاستفتاء على المواد المعدلة ناجحاً بموافقة أغلبية المصوتين وإذا لم يرفضه المصوتين في ثلاث محافظات أو أكثر.

خامسا ـ يستثنى ما ورد من هذه المادة من احكام المادة (١٢٦) المتعلقة بتعديل الدستور، الى حين الانتهاء من البت في التعديلات المنصوص عليها في هذه المادة.

بۆ ئەوەی خوێنەرانی بەڕێز هەر لە سەرەتاوە ئاشنابن لەسەر ئەو گۆڕانکارییانەی کە فەرز کرا لەسەر ڕەشنووسی ئەم دەستووره لە شەوی(١٤) لەسەر (١٥)ی١٠/٥/٢٠٠٥، وا لە خوارەوە دەقی ڕاگەیاندنی (لیژنەی دەستووری) کۆمەڵەی نیشتمانی، سەبارەت بە دوا دەستکارییەکان لەسەر ئەو ڕەشنووسە تەسبیت دەکەین:

## «بيان حول التعديلات»

اصدرت اللجنة الدستورية المنبثقة عن الجمعية الوطنية العراقية نص التعديلات النهائية على مسودة الدستور العراقي حيث تم ادخالها ضمن فقرات الدستور المقرر الاستفتاء عليها غداً السبت.

وفيما يلي نصها:

اولاً: قررت الجمعية الوطنية الأنتقالية اضافة بعض النصوص واجراء بعض التعديلات على مسودة الدستور.

ثانياً: تعد المواد المضافة الى مسودة الدستور، والتعديلات التي اجريت على بعض النصوص جزءاً من مسودة الدستور التي ستجري الاستفتاء العام عليها في ١٥ اكتوبر- تشرين الاول.

الباب الأول :

المادة (١) (النص الجديد) : (جمهورية العراق دولة اتحادية واحدة مستقلة، ذات سيادة كاملة نظام الحكم فيها جمهوري نيابي (برلماني) ديمقراطي، وهذا الدستور ضامن لوحدة العراق).

المادة (١) النص القديم: (جمهورية العراق دولة مستقلة ذات سيادة، نظام الحكم فيها جمهوري نيابي(برلماني) ديمقراطي اتحادي.

المادة (٣) النص الجديد: (العراق بلد متعدد القوميات والأديان والمذاهب، وهو عضو مؤسس وفعال في جامعة الدول العربية وملتزم بميثاقها، وهو جزء من العالم الأسلامي).

المادة (٣) النص القديم: (العراق بلد متعدد القوميات والأديان والمذاهب، وهو جزء من العالم الأسلامي وعضو مؤسس وفعال في جامعة الدول العربية وملتزم بميثاقها)

المادة (٤): ثالثاً: النص الجديد: (تستعمل المؤسسات الأتحادية والمؤسسات الرسمية في اقليم كردستان اللغتين العربية والكردية).
المادة (٤) : ثالثاً: النص القديم: (تستعمل المؤسسات والأجهزة الأتحادية في اقليم كردستان اللغتين).

اعادة ترتيب المادة (١٨):
اولاً: (الجنسية العراقية حق كل عراقي، وهي اساس مواطنته).
النص القديم : اولاً: (العراقي هو كل من ولد لأب عراقي أو لأم عراقية.)
ثانياً: (يعد عراقيا كل من ولد لأب عراقي أو لأم عراقية، وينظم ذلك بقانون).
النص القديم: (ثانياً): (الجنسية العراقية حق لكل عراقي، وهي أساس مواطنته).
وتبقي الفقرات الباقية على حالها.

اضافة مادة برقم (٣٥): (ترعى الدولة النشاطات والمؤسسات الثقافية بما يتناسب مع تأريخ العراق الحضاري والثقافي وتحرص على اعتماد توجهات ثقافية عراقية أصيلة).
اضافة مادة برقم (٣٦): ممارسة الرياضة حق لكل عراقي، وعلى الدولة تشجيع أنشطتها ورعايتها، وتوفير مستلزماتها).

اضافة المادة الآتية بين (١٠٩) و (١١٠) صارة المادة (١١٣): (تعد الآثار والمواقع الآثرية والبنى التراثية والمخطوطات والمسكوكات من الثروات الوطنية، التي هي من أختصاص السلطات الأتحادية، وتدار بالتعاون مع الأقاليم والمحافظات، وينظم ذلك بقانون).

اضافة الى المادة (١٣١) صارة المادة (١٣٥) في الدستور:
خامساً: (مجرد العضوية في حزب البعث المنحل لا تعد اساسا كافيا للأحالة الى المحاكم،ويتمتع العضو بالمساواة أمام القانون والحماية، ما لم يكن مشمولاً بأحكام اجتثاث البعث، والتعليمات الصادرة بموجبه).

سادساً: (يشكل مجلس النواب لجنة نيابية من اعضائة بمراقبة ومراجعة الأجراءات التنفيذية للهيئة العليا لأجتثاث البعث ولاجهزة الدولة، لضمان العدل والموضوعية والشفافية، وبالنظر في موافقتها للقوانين وتخضع قرارات اللجنة لموافقة مجلس النواب).

اضافة مادة قبل المادتين الأخيرتين وصارت المادة (١٤٢) في الدستور:
(اللجنة البرلمانية، مهمتها تقديم تقرير الى مجلس النواب، خلال مدة لا تتجاوز أربعة أشهر، يتضمن توصية بالتعديلات الضرورية التي يمكن اجراؤها على الدستور، وتحل اللجنة بعد البت في مقتراحاتها).
ثانياً: (تعرض التعديلات المقترحة من قبل اللجنة دفعة واحدة على مجلس النواب للتصويت عليها، وتعد مقرة بموافقة الأغلبية المطلقة لعدد اعضاء المجلس.)
ثالثاً: (تطرح المواد المعدلة من قبل مجلس النواب وفقاً لما ورد في البند (ثانياً) من هذه المادة على الشعب للأستفتاء عليها خلال مدة لاتزيد على الشهرين من تأريخ اقرار التعديل في مجلس النواب.)
رابعاً: يكون الأستفتاء على المواد المعدلة ناجحاً بموافقة أغلبية المصوتين، واذا لم يرفضه ثلثا المصوتين في ثلاث محافظات أو أكثر.)
خامساً: يستثنى العمل بالمادة (١٢٦) (المتعلقة بتعديل الدستور) من الدستور، ويعاد العمل بموجبها بعد البت في التعديلات المنصوص عليها في هذه المادة.)

مادده (١٢٦) ی دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق دەڵێت:
المادة ١٢٦:
اولاً: لرئيس الجمهورية ومجلس الوزراء مجتمعين، او لخمس (١/ ٥) اعضاء مجلس النواب، اقتراح تعديل الدستور.
ثانياً: لا يجوز تعديل المبادئ الأساسية الواردة في الباب الأول، والحقوق والحريات الواردة في الباب الثاني من الدستور، الا بعد دورتين انتخابيتين متعاقبتين، وبناءاً على موافقة ثلثي أعضاء مجلس

النواب عليه، وموافقة الشعب بالأستفتاء العام، ومصادقة رئيس الجمهورية، خلال سبعة أيام.

ثالثاً: لايجوز تعديل المواد الأخرى غير المنصوص عليها في البند ثانياً من هذه المادة، الاّ بعد وموافقة ثلثي اعضاء مجلس النواب عليه، وموافقة الشعب بالأستفتاء العام، ومصادقة رئيس الجمهورية خلال سبعة ايام.

رابعاً: لايجوز اجراء أي تعديل على مواد الدستور، من شأنه أن ينتقص من صلاحيات الأقاليم التي لا تكون داخلة ضمن الأختصاصات الحصرية للسلطات الأتحادية، الا بموافقة االسلطة التشريعية في الأقليم المعني وموافقة أغلبية سكانه باستفتاء عام.

خامسا:

أ ـ يعد التعديل مصادقاً عليه من قبل رئيس الجمهورية بعد انتهاء المدة المنصوص عليها في البند (ثانياً) و (ثالثاً) من هذه المادة، وفي حالة تصديقه.

ب ـ يعد التعديل نافذاً، من تأريخ نشره في الجريدة الرسمية.

واته بەم زیاد کردنەو، بە تەحدید برگە (خامساً) لە دوا ماددەی ئیزافە کراوی ماددە (١٤٢)ی دەستووری هەمیشەیی، هەموو دەسەلاتێکی بە لیژنەی پێداچوونەوەو دارشتنەوەی دەستووری هەمیشەیی داوە کە بە گشت ماددەو برگەکانی ئەم دەستوورەدا بچێتەوە بە سەرەتا بنچینییەکانی بەشی یەکەم و ماف و ئازادییەکانی و بەشی دووەمی ئەم دەستوورە، هەروەها ئەو ماددانەی کە پەیوەندییان بە دەسەلاتی هەرێمی کوردستانەوە هەیە، بە کورتی چ پێویست نەبوو پاش پەسند کردنی لەلایەن سەرانی سیاسی بەشداربووی کۆمەڵەی نیشتمانی گواستنەوەو خودی کۆمەڵەیش یان ریفراندۆم، کە پاش یەکەم دانیشتنی ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری العراق لیژنەی پێداچوونەوە دروست بکات جارێکی تریش بەم دەستوورەدا بچنەوە، هەر وەک لە سەرەوە باسمان کرد..! و قەتیس کردنی ماددەی (١٢٢-رابعا)و رێگادان بەم لیژنەیە بەو رەهاییە، رێگای والا کردووە بۆ دەستتێوەردان و ئەگەری گۆرینی دەسەلاتەکانی هەرێمی کوردستانیش.

**سەیر لەوەدا بوو:**

سەرکردایەتی سیاسی کوردو راگەیاندنەکانیان، وەکو بلێیت نە بایان دیوەو نە باران و، دوور لە بەرجەستە کردنی ناوەڕۆکی ئەم دەستوورەو، باس کردنی ماهیەتی و راستی و دروستی ماددەو بڕگە پەیوەندارەکانی بە پرس و مافی کوردو، وەلاوە نانی خەتە سوورەکان، ئەو سازشکارییانە بە ئیزافە کردنی ئەو چەند ماددەیە لەسەر دەقی کۆتایی پرۆژەی ئەم دەستووره. شەوی پێش پەسند کردنی، لەوانە:

١. المادة (٣) النص الجديد: (العراق بلد متعدد القوميات والأديان والمذاهب، وهو عضو مؤسس وفعال في جامعة الدول العربية وملتزم بميثاقها، وهو جزء من العالم الأسلامي).

٢. المادة (٤): ثالثاً: النص الجديد: (تستعمل المؤسسات الأتحادية والمؤسسات الرسمية في اقليم كردستان اللغتين العربية والكردية).

٣. اضافة مادة برقم (٣٥): (ترعى الدولة النشاطات والمؤسسات الثقافية بما يتناسب مع تأريخ العراق الحضاري والثقافي وتحرص على اعتماد توجهات ثقافية عراقية أصيلة).

٤. اضافة المادة ١١٣: (تعد الآثار والمواقع الأثرية والبنى التراثية والمخطوطات والمسكوكات من الثروات الوطنية، التي هي من أختصاص السلطات الأتحادية، وتدار بالتعاون مع الأقاليم والمحافظات، وينظم ذلك بقانون).

٥. اضافة الى المادة (١٣١) صارة المادة (١٣٥) في الدستور: خامساً: (مجرد العضوية في حزب البعث المنحل لا تعد اساسا كافيا للأحالة الى المحاكم، ويتمتع العضو بالمساواة أمام القانون والحماية، ما لم يكن مشمولاً بأحكام اجتثاث البعث، والتعليمات الصادرة بموجبه).

٦. اضافة مادة قبل المادتين الآخيرتين وصارت المادة (١٤٢) في الدستور: (اولاً: اللجنة البرلمانية، مهمتها تقديم تقرير الى مجلس النواب، خلال مدة لا تتجاوز أربعة أشهر، يتضمن توصية بالتعديلات الضرورية التي يمكن اجراؤها على الدستور، وتحل اللجنة بعد البت في مقتراحاتها). ثانياً: (تعرض التعديلات المقترحة من قبل اللجنة دفعة واحدة على مجلس النواب للتصويت عليها، وتعد مقرة بموافقة الأغلبية المطلقة لعدد اعضاء المجلس.) ثالثاً: (تطرح المواد المعدلة من قبل مجلس النواب وفقاً لما ورد في البند

(ثانياً) من هذه المادة على الشعب للأستفتاء عليها خلال مدة لاتزيد على الشهرين من تأريخ اقرار التعديل في مجلس النواب.) رابعاً: يكون الأستفتاء على المواد المعدلة ناجحاً بموافقة أغلبية المصوتين، واذا لم يرفضه ثلثا المصوتين في ثلاث محافظات أو أكثر.) خامسا: يستثنى ما ورد في هذه المادة من احكام المادة (١٢٦) (المتعلقة بتعديل الدستور)، الى حين الانتهاء من البت في التعديلات المنصوص عليها في هذه المادة.)

٧. مادة (١١١) (النفط والغاز هو ملك كل الشعب العراقي في كل الأقاليم والمحافظات.)، هەروەها مادده (١١٠- هەشتەم) مادده ١١٤- حەفتەم)..هتد.

ئەڵێین سەرەڕای ئەمانە لایەنی کوردستانی، یەک تەرەفە:

بەردەوام بوون لە هەڵدان بە شان و باڵی ئەو رەشنووسە تاکو ئەو رادەیەی کە وتەبێژی شاندی سەرکردایەتی کورد (ئازاد بەرواری- ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و ئەندامی شاندی کورد بۆ بەغدا) لە قسەکانی بۆ راگەیاندنەکانی کوردستان، سەبارەت بە ئەنجامی دوا گفتوگۆو بڕیاری کۆتایی سەرکردایەتی سیاسی لایەنە پەیوەندارەکانی (العراق)، لەمەڕ حەسم کردنی ناکۆکییەکانیان لەسەر رەشنووسی دەستووری هەمیشەیی (العراق) رایگەیاند کە:

* "٩٨٪ نەوەت و هەشت لە سەدی داخوازییەکانی کورد لەو رەشنووسەدا تەسبیت کراوە..!" لە کاتێکدا هەر لەو دیمانەیەدا جار لە دوای جار جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە کورد بە تەنها ئەو رەشنووسەی دانەڕشتووە، بەڵکو لایەنەکانی دیکەش بەشدار بوونە، واتە عەرەب بە شیعەو سوونەیانەوەو تورکمان و کلدۆئاشوورییەکان و.. هتد!
* بۆ پینە کردنی ئەو لێدوانەی سەرەوە ئەندامێکی تری شاندی کوردستانی لە بەغدا (فەلەکەدین کاکەیی) رێژەکەی هێنایە خوارەوەو کردی بە (٧٥٪) پاش ئەوەو لە مانگی ئابی ٢٠٠٦ کاکە فەلەکەدین لە هەموو ئەوانە پەشیمان بووەوە هەتا بە دەنگدانیشی بۆ ئەم دەستوورە. (بڕوانە گۆڤاری گوڵان ژمارە «٦٠٠» لە٢٠٠٦/٨/٢٤)
* لە چوارچێوەی ئەم لێدوانەی (بەرواری)، کە بووە مانشێتی لاپەڕەکانی رۆژنامەو گۆڤارەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و، هەواڵی گشت کەناڵەکانی راگەیاندن

به رادیۆ و تەلەفزیۆن و سایتەکانی ئەنتەرنێت، رۆژانە لە رێگای دیدارو کۆڕو کۆبوونەوەوە جەخت لەو دەستکەوتە مەزنەی شاندی کورد دەکراو، خەڵکی بێ ئاگایان چەواشە دەکردو، بە ئاگاشیان زیز دەکردو، لەلایەکی دیکەوە لایەنە نەیارەکانی کوردیشیان هان دەدا کە زیاتر جادەی خۆیان بخرۆشێنن و هاندەن دژی کوردو، ئەمە بەڵگەو خزمەتێکی گەورەش بوو بۆ ئەمریکا و هاوپەیمانانی لە عێراق، هەروەها بۆ لایەنە عەرەبییە هاوپەیمانەکانی کورد لە بەغدا، بۆ خۆیان و بۆ رای گشتیان، وەکو کارتێکی پێزانین و فشاری دوو دەمە، دژ بە هەر نارەزاییەکی کورد، چ وەکو جادەی کوردی خۆی، یان رۆشنبیران و هەر لایەنێکی سیاسی.

ئەم جۆرە (افراط وتفریط)ـە، بە ناوەڕۆکی کێشەی کوردو، رێز نەگرتن لە هەست و خواستی جەماوەرو، ئیستغلال کردنی بێ ئاگاداریبیان لە وردەکاری و سازشکارییەکان و، ئەو باوەڕییەی کە بە شاندی خۆی دابوو، تەعبیر لە پلەو ئاستی دیدو بۆچوونی ئەم جۆرە کەسانە دەکات و،...هتد

دەرئەنجامی دانوستاندنی شاندی کوردی سەبارەت بە مافەکانی خەڵکی کوردستان، ئەوەی لێی دەرکەوت و، لە توێی چەند ماددەو بڕگەیەکیدا جێگیر بووە، بە پێچەوانەی وتەبێژەکانی شاندەکە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو مافانە و گشت مافەکانی تر کە لەو دەستوورەدا هاتووەو خەڵکی کوردستان و گشت عێراقییەکان لە ریفراندۆمی ١٥/١٠/٢٠٠٥ دەنگی بۆ دا، بە یەک بڕگەی هەمان دەستوور ریسەکەی کردەوە خوری..!

شاندی چی میللەتێک، یان بزاڤێک یان حزبێک، لە ئەنجامی دانوستاندنی لەگەڵ لایەنە بەرامبەرەکانی، توانیویەتی (٩٨٪) نەوەت و هەشت لە سەدی داخوازییەکانی خۆی بەسەر لایەنی بەرامبەردا بچەسپێنێت؟!.. بەدەر لە حاڵەتی (تەسلیم بوونی بەرامبەر بێ مەرج)..

بەو رێژەیە واتە (٩٨٪)ـەکەی "بەرواری و کەسانی وەکو ئەو" یان:

* ئاگایان لە ناوەڕۆکی ئەم رەشنووسە نەبووەو، بە تەحدید ماددەو بڕگە تایبەتەکان بە مافی رەوای خەڵکی کوردستان، یان نەیاندیوەو، ئەگەر دیبێتیشیان ئەوە باش لێی تێنەگەیشتوون و، ئەگەر پێیان زانیوەو لێی تێگەیشتوون دیارە:

- ئەوەندەو تاکو ئەو رادەیە لە کێشەکە گەیشتوون و، ئەوەندەیشان لا مەبەستە، ئەگەر هەر لە ئەسڵدا کێشەی کوردیان لەلا مەبەست بوو بێت..!

ـ یان ئەوەتا دەیانزانی بەڵام:
ـ دەیانویست خەڵکی کوردستان چەواشە بکەن.
هەر یەک لەم (یان)انە، تەعبیر لە رادەی بایەخدانی ئەم جۆرە (نوێنەرانە) دەکات، سەبارەت بە دیدو بۆچوونیان لەمەڕ پرسە رەواکەمان..! ئەگەر وا نییە، بۆ یەکێک لە ئەندامانی ئەو شاندە، یان یەکێک لە بەرزە بەرپرسانی کورد (بەرواری)ی بە درۆ نەخستەوەو، راستییەکانی روون نەکردەوە..؟.

دەستوور هەر وەکو یاساناسان و پسپۆڕان پێناسەی دەکەن:
* گرێبەستێکی کۆمەڵایەتییە لە نێوان لایەنە پەیوەندارەکانی هەر کۆمەڵگایەک، بنەماو ماف و ئەرکەکانی تێیدا بە دەق تەسبیت دەکرێت، لەوانە دان پێدانان:
ـ بە شێوەو شێوازی دەوڵەت..
ـ بە پرنسیپە گشتییەکانی تاک و کۆمەڵ..
ـ بە ماف و ئەرکەکانی تاک و رێکخراو و دەزگاکان.. بە دەسەڵات و بە سنووری دەسەڵاتیان..هتد
* چەند باری نەتەوایەتی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی ئاڵۆز بێت و، توانای دەستتێوەردان و فشاری دەرەکی لە ئارادا بێت و، کێشەکان کۆن و قوول و بەرین بن، ئەوەندە سەلماندن و تەسبیت کردنی ماف و خواستەکانی لایەنە جیا جیاکان زەحمەتە. بۆیە:
هەر وڵاتێک بارودۆخی تایبەتی خۆی هەیەو، ناوەڕۆکی دەستووریش رێگا چارەیەک بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان و، گەیشتن بە چارەسەر کردنی کێشەکان و چەند هۆکارێک کاریگەری خۆی لەسەریان هەیە، لە پێش هەمووشی تەرازووی هێزو لێهاتوویی و سووربوونی لایەنەکان و نوێنەرانی..هتد، دەستووری هەمیشەیی کۆماری (العراق)یش دوور نییە لەو بنەمایەو کێشەکانیش زۆر و ئاڵۆزن، نەخاسمە بۆ پرس و کێشەیەک وەکو پرس و کێشەی کوردو، لە بارودۆخی ئەمڕۆی کوردستان و عێراق و ناوچەکەو دڵنیام شاندی کوردستان هەر ئەوەندەی پێ کراوە کە لەم دەستوورەدا هاتووەو، بەڕای بەندە چ پێویست نەبوو بەو هەموو هات هاوارو داپۆشینی لایەنە لاوازەکان، یان ئەوەتا ئەو دەقانە بە هەر شێوەیەک بێت بە سەر لایەنی کوردستانیدا فەرز یان دەرباز کراون.

راگەیاندنی (فەرمی) کوردستان، یەک لایەنە درێغییان نەکرد لە پیاهەڵدان بە شان و باڵی دەستووری هەمیشەیی کۆماری (العراق)و، داپۆشین و، وەلاوەنانی ماددەو بڕگە نێگەتیڤەکانی سەبارەت بە مافی خەڵکی کوردستان، یان باس و تەفسیر کردنیان بە دەر لە ناوەڕۆکیان دیسان بە یەک لایەنەو، جەخت کردنی بەرزە لێپرسراوانی هەردوو حزبی دەسەڵاتدار (پارتی و یەکێتی)، لەسەر گرنگی ئەو دەستکەوتەو، هاندانی خەڵکی کوردستان بۆ بەشداری لە پرۆسەی دەنگدان بە (بەڵێ) لەسەری.
پروپاگەندەو هەڵمەتی راگەیاندن بۆ راکێشانی خەڵکی بۆ دەنگدان، شێوەو شێوازێکی دیماگۆکی و دواکەوتووی وەها بوو کە لە زۆر بواردا گەیشتبووە ئاستی ئیرهابی فیکری:
* خوێنی شەهیدان و..
* قوربانییەکان و کارەساتی ئەنفال و..
* هەڵەبجەی شەهید و..
* چارەنووسی کەرکووک و..
* تەعریب و..
* سەروەت و سامانی کوردستان و..
* بەشی کورد لە پۆستە سیادییەکانی (العراق) و دەسەڵاتی ناوەند و..
* گرانی کورد لەسەر بڕیاری سیاسی عێراق و چارەنووسی کورد و..
* گرانی کورد لە ئاستی عێراق و ناوچەکەو نێودەوڵەتی.
ریفراندۆم لەسەر ئەم دەستوورە، لە ژێر فشارێکی راگەیاندنی یەک تەرەفەو چەواشەو پەردە پۆش کردنی لایەنێکی گرنگی راستییەکان، بەڕێوەچوو.
بە پێچەوانەی ئەو هەموو هەڵدانە بە شان و باڵی رەشنووسی دەستووری هەمیشەیی کۆماری (العراق)و، ئەو هەموو فشارو هەڕەشەیە، تاکو کار گەیشتە ئەو ئاستە، بەڕێز جەلال تاڵەبانی (سەرۆکی کۆماری العراق کاتی ئەو دەم) دەنگدانی بە (لا= نەخێر) لەسەر ئەو رەشنووسە بە (خیانەت و تاوان) لە قەڵەم داو، ئەوەی هەڵوێستی وەهای هەبێت (تیرۆریستە)..! دیارە بەڕێز تاڵەبانی ئەوەی لە بیر نەبوو، کە خودی ئەو دەستوورە مافی بە گشت دەنگدەران دابوو، کە بە (نعم = بەڵێ) یان (لا = نەخێر) دەنگ بدەن، ئەوەش مافێکی دەستووری ئەوانە، جا ئەگەر

دەنگدان بە (لا = نەخێر) خیانەت و تیرۆر بێت، بۆ بەڕێز تاڵەبانی وەکو یەک لە سەرکردەکانی کوردو سەرۆکی لیستی هاوپەیمانی کوردستان و، ئەندامێکی کاراو لێهاتوو و یاساناس، مەودای دا (نەخێر) وەکو (بەڵێ) ئازاد بێت بۆ دەنگدەران لە دەستوور، بە واتایەکی تر، بۆ بەڕێز تاڵەبانی و گشت ئەوانەی کە هەمان هەڵوێستیان هەبوو، ڕێگەیان دا تاکی کوردو غەیرە کورد (ئەوانەی بە (لا= نەخێر دەنگیان دابو)، تاوانی وەها بکەن..؟!
لەگەڵ هەر هەموو ئەمانەشدا، ڕێژەی بەشداربووانی هەرێمی کوردستان بە گشتی لە پرۆسەی ریفراندۆم، لە سنووری (٢٠-٣٠٪) کۆی گشتی دەنگدەرانی بوو..!!
ئەم جۆرە بەشداربوونەو ئەم ڕێژەیە، وەڵامێکی ڕاستەوخۆو نامەیەکی کراوەی نارەزایی خەڵکی خۆڕاگرو ستەمدیدەی کوردستان بوو، بۆ سەرکردایەتی سیاسی کوردو هاوپەیمانانی و بۆ ئەمریکاو گشت لایەنە پەیوەندارەکانی دیکەیش.
ئەوە یاداشتێکی نارەزایی جادەی کوردستان بوو، لەمەڕ ڕۆڵ و هەڵوێستی شاندی کوردو، لە ناوەڕۆکی دەستووری کۆماری (العراق)ی هیواو ئاشتی، کە دەرئەنجامی گفتوگۆکانیان بوو.
سەیر لەوەدایە هەردوو ئیدارەکەی هەرێمی کوردستان (هەولێرو سلێمانی) ئەو دەم، لەسەر هەمان ڕێبازی تاکڕەوی و یەک لایەنەو دوور لە هەست و خواستی جەماوەرەکەی، لە زۆر ناوەندی دەنگدان دەستکاری دەنگەکانیان کردو یارییان بەو هەڵوێستە کرد..
ئەوەی لە ریفراندۆمی ڕۆژی ١٥/١٠/٢٠٠٥ ڕووی دا، لە هەرێمی کوردستان، دیاردەیەکی وەها نییە مرۆڤ لە ئاستیدا بێ دەنگ بێت، یان هەروا بە ئاسانی بەسەریدا باز بدات، بە تایبەتی شێوەی کاردانەوەکەی سەرکردایەتی پارتی و یەکێتی لە چۆنیەتی تەعبیر کردنیان لە رای ئەو جەماوەرە.
ئەم کارە هەرچی بێت هۆ و هۆکارو پاساودانی، خەتایەکی گەورەیەو لایەنی سلبی زۆری هەبوو لەوانە:
یەکەم:
بێ خواستی خەڵکی کوردستان، سەرکردایەتی سیاسی کورد بە میزاجی خوێندنەوەی خۆی دەستکاری ڕاو بۆچوونی ئەو خەڵکەی کرد. بەمەش نەک هەر ڕێزی لە هەڵوێستی جەماوەری خۆی نەگرت، بەڵکو خودی پرۆسەی

دەنگدان و دەستوورو گشت پرنسیپە دیموکراتییەکان، کە هەمیشە جەختی لەسەر دەکەن و دووپاتی دەکەنەوەو خودی ئەو جەماوەری پێ ساز دەکەن، کەوتە ژێر گومان و، بووە مایەی نیگەرانی و پرسیاری خودی ئەو جەماوەرە.

دووەم:
بە زۆر سەپاندنی دەستوورەکە، لەلایەن سەرکردایەتییەکەی، دوور لە خواست و ویستی خەڵکەکەی، لە خزمەتی داگیرکەران و، عەرەبی باڵادەستی (العراق)ـە، بەتایبەتی (تەرحیل کردنی بەو مەرجانەی کە ئاماژەمان بۆ کرد).

بەمەش سەرکردایەتی سیاسی کورد بۆ یەکەم جار بە ڕەزامەندی خۆی.. بە گفت و مۆری خۆی، دژ بە هەڵوێست و رای زۆربەی هەرە زۆری جەماوەرەکەی و، بە گۆڕینی ئەو راو هەڵوێستە، لە پرۆسەیەکی دەنگدانی فەرمی، سابیقەیەکی دەستووری یاسایی فەرز دەکات بەسەر خەڵک و کێشەی ڕەوای خودی میللەتەکەی، کە هەر وەکو ئاماژەمان بۆ کرد، بەتەواوی تەعبیر لە خواست و ویستی پرسی کورد و قۆناغەکەو، زۆرینەی ئەو خەڵکە ناکات..!

پێش دارشتنی ڕەشنووسی دەستوورو ریفراندۆم و، لە دەرفەتە جیا جیاکاندا، توێژێکی زۆر لە رۆشنبیران و پسپۆڕان و خەڵکی خەمخۆر لە کێشەی میللەتی خۆی، بە وردی لایەنە پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانی (یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە)یان روون کردەوەو، کەم و کوڕییەکانیان باس کردو، پێشنیاری گۆڕین و چاکسازیشیان پێشکەش کرد، هەر بە هەمان شێوە لە قۆناغی دارشتنەوەی ڕەشنووسی دەستووری هەمیشەیی (العراق)یش. کە چی بە داخەوە دەرئەنجامەکەی دەقی ئەو دەستوورە پەسند کراوە، کە لەبەر دەستدایەو بابەتی باسەکەمانە.
ئەم دەستوورە(دەستووری کۆماری العراق)، پێک هاتووە لە پێشەکییەک و (٦) بەش:

## پێشەکیەکەی:

جگە لەوەی دوورو درێژ و (حشو) کردنی بە دروشمی جیا جیا، بەنەفەسێکی ئایینی سیاسی مەزهەبی نووسراوە. بە روونی زاڵبوونی بیروبۆچوون و هەڵوێستی تاک مەزهەبی عەرەبی شیعەی پێوە دیارەو، (٦) بەشەکەیشی پێکهاتووە لە:

**بەشی یەکەم**: بریتییە لە (١٣) مادده (لە مادده ١-١٣)، ئەم بەشە جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە:

* (العراق) دەوڵەتێکی سەربەخۆ و شکۆدارە، سیستمی حوکمڕانی تێدا (نەک خودی دەوڵەتەکە)، کۆماریی (پەرلەمانی) دیموکراسی یەکگرتووە. (مادده ١) هەر چەندە ئەم ماددەیە دەستکاری کرا (العراق)پێناسە کراوە وەکو (دەوڵەتێکی ئیتحادی)و، ئیسلام ئایینی فەرمی ئەم دەوڵەتەیەو سەرچاوەیەکی بنەڕەتی یاسادانانەو، نابێت هیچ یاسایەک لەم (العراق)ـە دەرچێت ناکۆک بێت لەگەڵ حوکمە نەگۆڕەکانی ئیسلام، چ سەرەتاکانی دیموکراسی و ماف و ئازادییە بنەڕەتییەکان، کە لەم دەستوورەدا هاتووە، شان بە شانی دووپات کردنەوەی پاراستنی ناسنامە ئیسلامییەکەی زۆرینەی زۆری گەلی (العراق)و، جەخت لەسەر مسۆگەر کردنی سەرجەم مافە ئایینییەکانی دیکەی تاکەکانی کۆمەڵگای (العراق) دەکات.

* وەکو شناسنامە (العراق) ئەندامیکی دامەزرینەرو کارای کۆمکاری عەرەبییەو پابەندی بەلیننامە (میساق)ـەکەیەتی و، بەشیکە لە جیهانی ئیسلامی.
* زمانی عەرەبی و کوردی زمانی فەرمین، هەروەها زمانی تورکمانی و سریانی دوو زمانی فەرمی دیکەن لەو یەکە کارگیرییانەدا کە زۆرینەی دانیشتوانەکانیان پیک دین و، بۆ هەر هەریمیک و پاریزگایەک هەیە هەر زمانیکی ناوچەی دیکەش بە زمانی فەرمی بناسیت، ئەگەر بیت و زۆربەی خەلکەکەی بە راپرسییەکی گشتی بریاری لەسەر بدەن.
* لەم بەشە ئاماژە بە رۆل و ئەرکی سوپای (العراق) کراوەو، هەموو جۆرە هیزیکی چەکداری نا فەرمی قەدەغە کراوە.
* لە کۆتایی ئەم بەشە، جەخت لەسەر پایەبەرزی ئەم دەستوورە دەکریت، کە بالاترین یاسایە لە سەرتاسەری (العراق) و هەموویان پیی پابەندن بی بەدەربوون (استثناء)و، نابیت لە سەرتاسەری العراق هیچ یاسایەک، یان دەقیکی یاسایی دابنریت، ناکۆک بیت لەگەل دەقەکانی ئەم دەستوورەو، هەر دەقیکیش لە دەستووری هەریمەکان، یان هەر دەقیکی دیکەی یاسایی لەگەلی ناکۆک بیت بە پوچەل دەژمیردریت.

**بەشی دووەم:**

بەشی (ماف و ئازادییەکان)، لە ماددە (١٤)ـەوە تاکو ماددە (٤٦)ـە. ئەمەش دابەش کراوە بەسەر دوو بەند، یەکەمیان (مافەکان)و، دووەمیان (ئازادییەکان). لەم بەشەدا جەخت لەسەر:

* یەکسانی گشت (العراق)یەکان دەکات، بەرامبەر بە یاسا، بی جیاوازی بە هۆی رەگەز، یان نەژاد، یان نەتەوە، یان رەسەن، یان رەنگ، یان ئایین، یان ئاینزا، یان باوەر، یان بۆچوون، یان باری ئابووری، یان کۆمەلایەتی، بەمەش ئەم دەستوورە زامنی هەموو مافەکانی عیراقییەکانە بی جیاوازی.
* دەولەت بەرپرسیارە لە دەستەبەر کردنی گشت ریکارەکانی پیویست بە بەدیهینانی هەلی کارکردن وەک یەک بۆ گشت هاوولاتیان (تکافوء الفرص)و، تەئمین کردنی ئەمن و ئاسایش و ئازادی و تایبەتمەندییەکانی تاک و، پیرۆزی مال و پاراستنی سەروەت و سامانی، لە چوارچیوەی

یاساو، پیاده کردن و بەشداری لە کاروبارە گشتییەکان: دەنگدان و هەڵبژاردن و خۆپالاوتن..

* ئەم دەستوورە مافی رەگەزنامەی (العراق)ی داوە بە گشت عێراقییەکان و بنەمای هاوولاتی بوونیەتی و، بۆیان هەیە چەندین رەگەزنامەیان هەبێت و، رەگەزنامەی عێراقی نادرێت بە مەبەستی سیاسەتی نیشتەجێ کردن، کە دەبێتە هۆی تێکدانی پێکهاتەی دیمۆگرافی لە عێراقدا.
* لەمەڕ مافە ئابووری و کۆمەلایەتی و فەرهەنگییەکان: دەستوور دەولەتی پابەند کردووە بۆ مسۆگەر کردنی، هەروەها ئەرکی چاکسازی باری ئابووری و گەشەپێدانیشی.
* مولکایەتی تایبەت پارێزراوەو، هاوولاتی عێراقی مافی ئەوەی هەیە لە هەر شوێنێکی عێراقدا مولکدار بێت و، رێگە نادرێت بە مولکداری بە مەبەستی گۆرینی دیمۆگرافی.
* خێزان بنەمای کۆمەلگایەو، دەولەت بیمەی کۆمەلایەتی (الضمان الاجتماعی) و تەندروستی دەستەبەر دەکات و، فێرکردنی بە خۆرایی مافی هەموو عێراقییەکانە لە هەموو قۆناغەکاندا.
* لە بواری ئازادییەکاندا، ئەم دەستوورە بە چەند ماددەو برگەی تایبەت جەخت لە زامن کردنی دەکات، بە تایبەتی ئازادی و ئابرومەندی مرۆڤ و ئازادی رۆژنامەگەری و چاپکردن و ئاگادار کردنەوە بۆ راگەیاندن و بلاو کردنەوەی ئازادی: دامەزراندنی کۆمەلەو پارتە سیاسییەکان و ئەندام بوون تیایاندا و، ئازادی کۆبوونەوەو، خۆپیشاندان....

**بەشی سێیەم:**

دەسەلاتە یەککگرتووەکان: پێک هاتووە لە چوار بەند، لە مادده (٤٦)ەوە تاکو مادده (١٠٨)ە. لەم بەشەدا دەستوور جەخت دەکات:

* لەسەر پرنسیپی جیاوازی دەسەلاتەکان و، چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەران، کە تەنها دەزگای یاسا دانان و، دەسەلاتی کارگێری بە هەردوو بالەکەیەوە (سەرۆک کۆمارو ئەنجومەنی وەزیران)و دەسەلاتی دادوەری دەستنیشان دەکات، هەروەها جەخت لەسەر پرنسیپی جیاوازی دەسەلاتەکان و، ئەرک و مافی هەر یەک لەو دەزگایانە کراوە.

**بەشی چوارەم:**

تایبەتمەندییەکانی دەسەڵاتە یەکگرتووەکان: ئەم بەشە بریتییە لە (٧) ماددە، ماددە (١٠٩-١١٥)و، باس لە دەسەڵاتەکانی ناوەندی یەکگرتوو دەکات و تەحدیدی کردوون.

**بەشی پێنجەم:**

تایبەتە بە دەسەڵاتی هەرێمەکان و، بریتییە لە (٦) ماددە، ماددە (١١٦-١٢١)و، دابەش کراوە بەسەر (٤) بەند. لە بەندی یەکەمی ئەم بەشەدا، دەستوور باس لە سیستمی کۆماری العراق دەکات:

* کە سیستمێکی (یەکگرتوو)ەو، (نیزامەکەی) (ئیتیحاد)یە، نەک-(وڵاتەکە «العراق»)-و، پێک دێت لە پایتەخت و هەرێمەکان و پارێزگاکان و شارەوانییەکان.
* ئەم دەستوورە لە کاتی جێبەجێ کردنیەوە، هەرێمی کوردستان بە دەسەڵاتەکانی ئێستایەوە، بە هەرێمێکی (یەکگرتوو)ی -اتحادی- دادەنێت. (هەرێمی کوردستان)یش کە ئاماژەی بۆ کراوە ئەو ناوچانەیە کە تاکو ٢٠٠٣/٣/١٩ لە ژێر کۆنترۆڵی هەردوو ئیدارەدا بوون (ئیدارەی هەولێرو ئیدارەی سلێمانی).
* هەروەها ئەم دەستوورە دان بەو هەرێمە نوێیانەدا دەنێت کە بە پێی حوکمەکانییەوە دادەمەزرێن.
* بۆ یەک پارێزگا، یان زیاتر لە یەک پارێزگادا هەیە (هەرێمێک) پێک بێنێت.
* رێگای جێبەجێ کردنی تایبەت بە پێکهێنانی هەرێمەکان بە یاسایەک دەبێت، کە ئەنجومەنی نوێنەران، بە زۆرینەی سادە (بسیطە) دەریدەکات و بڕیارو پەسندی دەکات.
* هەروەها ئەم دەستوورەو لەم بەشەیدا دەسەڵاتی هەرێمەکان دیاری دەکات، بە مەرجێک لە چوارچێوەو ناوەڕۆکی ماددەو بڕگەکانی دەرنەچێت، بۆیە:

- بە پێی ماددە (١٤١)ی ئەم دەستوورە، کار دەکرێت بە گشت یاساو بڕیارەکانی پەرلەمان و هەردوو ئیدارەو بڕیارەکانی دادگاکانی هەرێمی کوردستان کە لە ساڵی ١٩٩٢ـەوە دەرچوون، هەروەها هەر بەپێی ئەم

ماددەیە هەموو ئەو یاساو بڕیارو گرێبەستانە قابیلی پێداچوونەوەن ئەگەر هاتوو لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەم دەستوورەدا نەگونجاو بن، یان هەڵدەوەشێتەوە، یان هەمواری (تعدیل) تێدا بکرێت.

* بەندی دووەمی ئەم بەشە: پەیوەندی هەیە بەو پارێزگایانەوە، کە خۆیان لە هەرێمێکدا ڕێک نەخستووە، بە پێکهاتەو سنووری دەسەڵاتیانەوە..
* بەندی سێیەم پەیوەستە بە بەغدای پایتەخت و، نابێت بچێتە نێو هیچ هەرێمێکەوەو، باری ئەم پایتەختە بە یاسایەکی تایبەتی ڕێک دەخرێت.
* بەندی چوارەم: باسی ئیدارە خۆجێیەکانە.

**بەشی شەشەم:**

پەیوەندارە بە (حوکمەکانی کۆتایی و گواستنەوە)و، بریتییە لە دوو بەند:
بەندی یەکەمی: (حوکمە کۆتاییەکان)ـە، ماددە (١٢٦-١٣١).
بەندی دووەمیان: تایبەتە بە(حوکمە گواستراوەکان)، ماددە(١٣٢-١٤٤).

پوختەی ماددەکانی ئەم بەشە باس لە ئیجرائات و، هەل و، چۆنیەتی گۆڕینی دەستوور دەکات، هەروەها لە حوکمە گواستراوەکانیش باسی کێشەی ئەوانە دەکات کە لە کاتی ڕژێمی پێشوودا تووشی زەرەرو زیان بوونەو، بەردەوام بوونی دادگای سزای باڵا و دەستەی نیشتمانی باڵا بۆ ڕیشەکێش کردنی بەعس.

لەم بەندەو، لە ماددە (١٤٠)یدا دەسەڵاتی جێبەجێ کردنی ناوەڕۆکی ماددە (٥٨)ی (یاسای بەڕێوەبردنی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە) دەخاتە ئەستۆی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن، (دەسەڵاتی جێبەجێ کردنیش پێک هاتووە لە سەرۆک کۆمارو ئەنجومەنی وەزیران -ماددە ٦٦-)، بەڵام بە پێی ماددە (١٣٨- یەکەم)ی ئەم دەستوورە (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی)تاکو خولێکی دیکەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئایندەی کۆماری العراق ئەرکی (سەرۆک کۆمار ئەبینێت) بە پێی برگەی (شەشەم) دەسەڵاتەکانیشی بە کار دێنێت، واتە دەسەڵاتی جێبەجێ کردن بریتییە لە (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی- کە ئێستا کوردێک و عەربێکی شیعەو عەرەبێکی سونەیە-)، هەروەها (ئەنجومەنی وەزیران)یش، کە ئەویش هەمان پێکهاتەی هەیە.

هەروەها بەردەوام بوون لە کـارکـردن بەو یاسـاو بڕیارانەی کـە لە ١٩٩٢ بەولاوە لە هەرێمی کـوردسـتـان دانراون، مـەگـەر هەمـوار بکرێن، یان هەڵبـوەشـێندرێنەوە بە پێی یاسـاکـانی هەرێمی کـوردسـتـان لەلایەنی تایبەتمەندەوەو، بە مـەرجێـک ناکۆک نەبن لەگەڵ ئەم دەسـتـوورەدا (مـاددەی ١٤١)، هەر وەکو لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد. واتە: چارەنووسی ئەو یاساو بڕیارانەی (هەر سێ دەسەلاتەکەی) هەرێمی کوردستان کە لە میانی (١٩٩٢ - تاکـو پیـادە کـردنی ئەم دەسـتـووره) دەرچوون، بەندە بە تەبا بوونی لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەم دەستووره.

لە کۆتاییشدا: ئەم دەستووره بە کار پێکراو دەژمێـردرێت دوای رەزامەندی گەل بە راپرسی گـشـتی(ریفـراندۆم) لە سـەری. (مـاددەی ١٤٤)و، راپرسـیـیـەکـەش بە سـەرکـەوتوو لەقـەڵەم دەدرێت، ئەگـەر هاتوو زۆرینەی سادەی دەنگدەران رازی بوون لەسـەری و، ئەگـەر دوو لەسـەر سـێی دەنگدەرانی سێ پارێـزگـا، یان زیاتر رەتیـان نەکـردەوە (مـاددەی ١٤٢-چوارەم)و، بڵاوکـردنەوەی لە رۆژنامـەی فـەرمـیـداو دەست بەکار بوونی حکومەتی پێکهاتوو بە پێی ئەم دەستووره(ماددەی ١٤٤).

لەم باسـەمـاندا، بەش بە حـاڵی خـۆمـان، هەوڵ ئەدەین، بە پێی ناوەڕۆکی ئەم دەسـتـووره، تیشـک بخەینە سەر ئەو دەق و ماددەو بڕگانە، کە پەیوەندی بە مـاف و پرسی کوردەوە هەیەو، ئەو کەم و کورتییەی کە تێیدا رەچاو دەکرێت دیاری بکەین، چونکە:

گرنگی ئەم دەستووره بۆ ئێمەی کورد تەنها لەوەدا نییە کە هەر وەکو پێناسە کراوە، باڵاترین یاسـایە لە وڵات و، لەبەر ئەوەی باڵاترین یاسـایشـە، دەبێـتـە بنەمـاو سـەرچاوەی هەر یاسـاو بڕیارێـک کـە دواتر لە کـۆمـاری (العـراق) دەردەچێت. یان بنەماو سەرچاوەی دەسـتـووری هەرێم و، هەر یاساو بڕیارێکە، کە پاش پیـادەکـردنی ئەم دەستووره لە هەرێمی کوردستان دەردەچێت، ئەڵێین گرنگی ئەم دەستووره تەنها لەوانەی سەرەوەدا نییە، بەڵکو:

* بنەماو سەرچاوەو شەرعیەتی هەر یاساو بڕیارێکە، کە لە میانی (١٩٩٢- تاکو پیـادە کـردنی ئەم دەسـتـووره، دوای ٢٠٠٥/١٢/١٥)، (واتە پێش و پاش

دەرچوونی ئەم دەستووره)، کە لەلایەن هەر سێ دەسەڵاتەکانی هەرێمی کوردستان (پەرلەمان، حکومەتی هەرێمی کوردستان -بەهەردوو ئیدارەکەیەوە-، دادگاکان)و، ئەوەی کە پێی دەڵێن ئەزموونی کوردستان دەرچووە، هەر وەکو ماددەی (١٤١) دەڵێت:

- دەقە کوردییەکەی: (ئەو یاسانەی لە سالی (١٩٩٢) بەولاوە لە هەرێمی کوردستان دانراون بەردەوام کاریان پێ دەکرێت و هەموو بڕیارەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان ـ بە بڕیارەکانی دادگا و گرێ بەستەکانیشەوە ـ کاریان پێ دەکرێت مەگەر هەموار بکرێت یان هەڵبوەشێندرێنەوە بە پێی یاساکانی هەرێمی کوردستان لە لایەن لایەنی تایبەتمەندەوە، ئەگەر ناکۆک نەبن لەگەڵ ئەم دەستووره.)
- دەقە عەرەبییەکەی: (يستمر العمل بالقوانين التي تم تشريعها في اقليم كردستان منذ عام ١٩٩٢ وتعد القرارات المتخذة من قبل حكومة اقليم كردستان -بما فيها قرارات المحاكم والعقود- نافذة المفعول، ما لم يتم تعديلها او الغاؤها حسب قوانين اقليم كردستان من قبل الجهة المختصة فيها، ومالم تكن مخالفة لهذا الدستور.)

**لەوەش گرنگتر:**

* ئێمە وەکو کورد خاوەن (پرسێک)ین.. خاوەن کێشەیەکین، لە خودی ئەم بەشەی کوردستان و لەمەی کە پێی ئێژن (العراق) و، لە پێناویدا لافاوی خوێنمان داوەو، سەرکەوتنمان وەدەست هێناوەو، شکست و نسکۆمان بە سەر هاتووەو، میللەت و بگرە نەتەوەکەمان زۆر جار تووشی کارەسات بووەو، پوختەکەی، تاکو ئێستا: گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتی و تێکدانی بنەماکانی کۆمەڵگای کوردەواری و دەربەدەری و ئاوارەیی و قەڵاچۆ و جینۆسایدکردن بووە.

واتە پرسی گەل و نەتەوەیەکە بۆ رزگاری و ئازادی و بڕیاری مافی چارەنووسی خۆی، ئەم هەموو هەورازو نشێوەی بڕیوەو، لە وڵاتێکدا کە بە زۆری زۆردار کراوە بە بەشێکی......

ئەمانە هەر هەموو، ئەو مافەمان پێ دەدات وەکو کوردێک، هەروەها وەکو هاووڵاتییەکی ئەم (العراق)ش، بە وردی و بە مەوزوعیەت و، دوور لە دەمارگیری

دەسەڵات و پەردەپۆش کردنی ڕاستییەکان، بەو ماددەو دەقە پەیوەندارانە بچینەوەو، بەو ئەندازەیەی کە تێگەیشتووین و، بەو ئامانجەی کە ڕەش و ڕووتی وڵاتەکەمان لە ناوەڕۆکی ئەو دەقانە هوشیار بکەینەوە، بەرامبەر بە لافاوی ڕاگەیاندنی یەک تەرەفەو یەک لایەنەی دەسەڵاتدارەکانی کوردستان و، ئەو مەنەلۆگ و شایی لۆغان و، بە بەژن و باڵا گوتنانەیان، بە مسۆگەر کردن و تەسبیت کردنی (٩٨٪)ی مافەکانی گەلی کورد لەم دەستوورەدا.

لەم ڕووانگەیەوە، دوور نییە توێژێکی زۆر لە پسپۆڕو یاساناس و ڕۆشنبیرو کەسایەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کلتووری کورد، پێشترو پاشتریش، دەقەکانی ئەم دەستوورەیان شی کردبێتەوەو، بە چاوی ڕەخنەوە هەڵسوکەوت و مامەڵەیان لەگەڵ ڕەشنووسەکەی کردبێت و، ئەمەی ئێمەش جەخت و دووپات کردنەوەو پێداچوونەوەو هەڵسەنگاندنێکی دیکەیە، کە دوور نییە لە زۆر لایەنەوە لەگەڵ زۆربەی ئەو بۆچوونانە، کەم یان زۆر جووت بن، ئەمەش بە تەنها ڕاو بۆچوونی خۆمانەو دوور نییە قەبوڵکردنی ئەم دیدو بۆ چونانە لای هەندێ کەس وا، ڕاستەوخۆ و هەندێ ڕووت و بێ پەردە، هەزم کردنی ئەوندە ئاسان نەبێت، لەگەڵ ئەوەدا ئەمەش ڕایەکە بە ئومێدی ئەوەی پاش خوێندنەوەی ناوەڕۆکی ئەم باسە، هەندێ زیاتر وردببنەوە لەناوەڕۆکی ئەم دەستوورەو مافەکانی خەڵکی کوردستان...

پێشەکی بە باشمان زانی لێرەدا جەخت لەسەر ئەوە بکەین، کە بەشێکی بەرچاو لە یاساناسان و پسپۆڕان لە میانی یاسادا، لەو باوەڕەدان کە یەک لەخەسڵەتەکانی یاسا بە گشتی و دەستوور بە تایبەتی وەکو باڵاترین یاسای وڵات، ئەوەیە:

* کە نابێت هیچ یاسایەک، یان بەندێکی یاسایی، یان بڕیارو ڕێسایەک، ناتەبا بێت لەگەڵی، ئەگەر ڕوویشی دا، ئەوە کار بەو یاساو بڕیارو ڕێسایانە ناکرێت و، هەڵوەشاوەیە..

دووەم خەسڵەتی ئەوەیە:

* کە دەبێت دەقی ماددەو بڕگەکانی (کورت) و (ڕوون) بن و قابیلی ئیجتهاد نەبن و لێکدانەوەی دژ بەیەک و ناتەبا بە خۆیانەوە نەگرن..

خەسڵەتی سێیەم لەوەدایە:

* کە لە هەر یاسایەک و، دەقێکی یاسایی بە گشتی، مەبەستی یاسادانەر (موشەریع) گرنگە، جا ئەو موشەریعە یەک کەس بێت، یان لیژنەیەک بێت یان

دەزگایەک بێت، چونکە (قصد المشرع) وەکو تیغی دوو دەم وایەو، دەکرێت مافێک بە ماددەیەک، یان بڕگەیەک لە یەکێک لە بەشەکاندا دیاری بکات، بەڵام هەر لە هەمان ماددەو بڕگە، یان لە ماددەو بڕگەیەکی پێش یان پاشتر، بە گشتی یان بە (پچڕ پچڕ)، شتێکی لێ کەم بکاتەوە، یان گومانی بخاتە سەر، یان پەکی بخات.

خەسڵەتی چوارەم:

* گرنگی هەر یاسایەک، یان دەقێکی یاسایی تەنها لە خودی دەقەکاندا نییە، بەڵکو لە پراکتیزە کردنی دەقەکانیەتی لە واقیعدا، واتە ئەو دەقانە چەندو چۆن پیادە دەکرێن، هەروەها ئەو دەسەڵاتە، یان دەسەڵاتەکان کە پەیوەندارن، چەند باوەڕو توانای جێبەجێ کردنیان هەیە.

ئەگەر مرۆڤ بە تێکڕا تەماشای ماددەو بڕگەکانی دەستووری هەمیشەیی کۆماری (العراق) بکات، هەر لە سەرەتاوە بۆی دەردەکەوێت کە ئەم دەستوورە لە دوو خەسڵەتی سەرەکی بێ بەشە، واتە زۆربەی زۆری ماددە پەیوەندارەکانی و بە تەحدید ئەوەی پەیوەندارە بە مافی ئێمەی کوردەوە، زۆربەی لاوازو درێژ و تەڵخە، هەروەها لە هەر هەلێک کە بۆ (مشرع) گونجاو بێت، کە لەواقیعدا نوێنەری زۆرینەی عەرەبی عێراقە، هەوڵی پاشقول و کەمین و وەلاوەنان و پەکخستنی ئەو مافانەیان داوە، تاکو ئەو رادەیەی بۆیان لوا بێت.واتە:

ماددەو بڕگەکانی ئەم دەستوورە زۆر (بێژ) و کەم (تێزن)و، سەرەڕای ئەوەش لە زۆر رووەوە کێڵگەیەکی چێندراوە بە گومان و کەمین و پاشقول.

ئەگەر مرۆڤ پرۆژەکانی (٧) دەستوورەکەی دیکەی عێراق بخاتە روو و، تاوتوێی دەرئەنجامەکانیان بکات، هەروەها ئەزموونی قۆناغی (رزگار)ی و قۆناغی (داگیر)کردنی عێراق و هەڵسوکەوت و مامەڵەی ئەمریکا، چی لە قۆناغی (رزگار) کردن و چی لە قۆناغی (داگیر) کردن و، ئیدارە مەدەنییەکەی بە سەرۆکایەتی (برێمەر)، هەروەها ئەزموونی ئەو دوو حکومەتەی کە بەدەست و لە ژێر رکێفی ئەمریکاو هاوپەیمانانی دامەزراو حوکمڕانی ئەم عێراقەیان کرد، واتە حکومەتی کاتی د.ئەیاد عەلاوی و حکومەتی ئینتقالی د.ئیبراهیم جەعفەری، کە دەسەڵاتیان لە یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە وەرگرتبوو و، پیادەیان

دەکرد. ئەڵێین ئەو هەموو بیرەوەری و رووداو و ستەمانە، کە لە پاش هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی العراق لە ١٥/١٢/٢٠٠٥وە تاکو کۆتایی مانگی ٤ی ٢٠٠٦، کە دەکرێت بە قەیرانی (د.ئیبراهیم جەعفەری) پێناسە بکرێت و، تاکو ئەمڕۆ چی رووی داوە گەواهی بۆ ئەوە دەدەن کە لە پراکتیکدا دەسەڵاتدارانی عێراقی زۆرینەی عەرەب:

* بە (ملهوڕانە)و بە (تاکڕەو)ی -تاکو ئەو ئەندازەیەی دەسەڵاتدارانی ئەمریکا مەودای پێ داون و بۆیان لوا بێت- بڕیاریان داوە، بە وجودی لایەنی کوردیش لە نێو ئەو دەسەڵاتەو، بە (پۆستە سیادییەکانیشەوە)، کە زۆرینەی عەرەبی دەسەڵاتدار هەر کاتێک کەوتبێتە ژێر فشاری ئەمریکا، ئەوە هۆکاری ئەو فشارە کێشەو پرسی کورد نەبووە، ئەگەر چی نوێنەرانی کورد هەندێ جار خۆیان دەکەن بە تەرەف. هەر کاتێکیش دەسەڵاتی زۆرینەی عەرەب پاشگەزی کردبێت، ئەوە کاتی بووەو، کە هەلیشی بۆ رەخسا بێت ئەوا دیسان گەڕاوەتەوە بۆ سەر ڕێبازی خۆی.
* هەر کاتێکیش پەنایان بردبێت بۆ (التوافق)، ئەوە زۆر جار لەسەر حیسابی پرسی کورد بووە، یان بۆ کەسبی وەقت بووە..

واتە دەکرێت بە هەندێ حەزەرەوە بڵێین مافی خۆمانە بە گومانەوە تەماشای خەسڵەتی چوارەمیش بکەین، ئەویش رازونیازی دەسەڵاتی ناوەندی بەغداو، هەڵوێستی ئەمریکایە وەکو لایەنی خاوەن دەسەڵات و بڕیاردەر (تاکو ئەمڕۆ)، لە کۆماری (العراق)، بە تایبەتی ئەوەی پەیوەندی هەبێت بە پرسی کوردەوە..

دەستوورەکە بە گشتی و، بە تەحدید لە بەشە گشتییەکانیدا، زنجیرەیەک پرنسیپ و مافی تەسبیت کردووە، ناکرێت یاسایەکی ئەساسی لە پلەی دەستووردا بێت و، بۆ کەش و هەوایەکی دیموکراسی و شارستانی ئومێدخواز، لێی بێ بەش بێت و، ئەگەر پراکتیزە بکرێت بە تەئکید سوود بەخش دەبێت بۆ گشت خەڵکی (العراق)، کە زۆریشی ئێمەی کورد دەگرێتەوە.

لە سەرەتاوە ئاماژەمان بەوە کرد کە سەرچاوەی ئەم دەستوورە (یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراقە بۆ قۆناغی گواستنەوە)و، لەساڵی ٢٠٠٣و سەرەتای ساڵی ٢٠٠٥دا، بە زنجیرە وتارێک لە (خەبات) تیشکمان خستە سەر ئەو یاسایە، ئەو

یاسایەش لە ئەسڵدا پرۆژەیەکی ئەمریکی پێش قۆناغی رزگاری عێراق بوو، پاش تاوتوێ کردن و چاکسازی ئەو یاسایەی لێ دەرکەوت و هەر ئەویش بووە بنەماو پرۆژەی دانوستاندنی لایەنەکان و لیژنەی دەستووری پەرلەمانی عێراق و، دەرئەنجام ئەم دەستوورە هەمیشەییەی (کۆماری العراق)ی لێ کەوتەوە.
ئێمە لەو باسانەدا (کە دوایی بوو بە کتێبێک بە ناوی - ئایا فیدراڵیەت وەکو خیارێکی سیاسی لە عێراق پیادە دەکرێت..؟- لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٥ چاپ کراو بڵاو کرایەوە)، چەند بابەتمان وروژاند کە چەند ماددەو بڕگەیەکی ئەو یاسایەی لە خۆ گرتبوو، ئومێدەوار بووین لە داڕشتنی رەشنووسی دەستووری هەمیشەیی کۆماری (العراق) رەچاو بکرێت.
لە راستیدا هەندێکی چارەسەر کراوەو، زۆریشی یان وەکو خۆی ماوەتەوە یان دەستکاری کرا بە شێوەیەک وەک دەڵێن (خۆزەگە بە پار)..!

لەم کورتە باسەو ئەوەندەی بۆمان بلوێت لێرەدا، هەوڵ ئەدەین بە کورتی و لە چەند بەشدا، دەق و مادده پەیوەندارەکانی ئەم دەستورە، بە مافەکانی گەلی کوردەوە، بخەینە روو و، لە چوارچێوەی خودی ئەو مافانە، دەقە پەیوەندارەکانی شەن و کەو بکەین، بە ئومێدی ئەوەی شاندی کوردی بتوانێت لە پرۆسەی هەموارکردنی ئایندەدا، کە دەبێت لە ماوەی (٤) مانگدا (لە پاش یەکەمین دانیشتنی ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری العراق) دەست پێ بکات، هەموو کەم و کورتییەکان و ناڕۆشنی دەقە پەیوەندارەکان چارەسەر بکات.

لەم باسەدا هەوڵ ئەدەین تیشک بخەینە سەر ئەو بابەتانەی کە مایەی پرسیارو بایەخدانی خەڵکی کوردستانن، لە چوارچێوەی ئەم دەستوورەدا، وەک:

* ناوو پێناسەی دەوڵەتی عێراق.
* مافی چارەخۆنووسی گەلی کوردستان.
* فیدراڵیەت.
* کێشەی کەرکوک و گشت ناوچە تەعریبکراوەکانی کوردستان و جێبەجێ کردنی ماددەی(١٤٠).
* سەروەت و سامانی کوردستان.
* دەسەڵاتەکانی هەرێمی کوردستان.

لەم ماوەیەی دواییدا، بە هۆی چەند هەڵوێست و لێدوان و راو بۆچوونی جیاجیای ژمارەیەک لەکاربەدەستانی هەرێمی کوردستان، حزبی و ئیداری، یان ئەوانەی عێراقی غەیرە کورد، لەمەڕ ماف و داخوازییە چاوەڕوانکراوەکانی خەڵکی کوردستان، سەرنجی راکێشاین؛ چ ئەو ماف و داخوازیانە کە لە دەستووری هەمیشەیی کۆماری عێراق چەسپابوو و، چ ئەو ماددەو بڕگانەی تری ئەم دەستوورە، کە جێگای نیگەرانی و ناڕەزایی توێژێکی بەرچاوو بەهەند وەرگیراو، لەلایەن لایەنی دەستڕۆی ئەمریکاو هاوپەیمانانی لە ئەم (العراق)ـە، بەتایبەتی لایەنی سوننەی عەرەب بەعەلمانی و ئیسلامی سیاسییانەوەو، لایەنێکی توندڕەو و خاوەن هێزو بنکەی جەماوەری مەزهەبی شیعەو، سەرەڕای ئەمەش، ئەم دووجەمسەری دوایی (سوننەو توندڕەوی شیعە)، بە پێچەوانەی گشت ناکۆکییە سیاسی و مەزهەبییەکانیانەوە، قوڵایەکی ئیقلیمی و نێودەوڵەتیان هەیە لەپشتگیری و هاوکاری و تاکو رادەیەکیش دەکرێت بڵێین هاندانیش..

ئەم دیاردەیە لە تەک لێدوانەکەی بەڕێز «میشێل لو» (ئەندامی نووسینگەی پاڵپشتی دەستوورو نێردراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ یارمەتی کۆماری العراق «یونامی »، کە تیایدا ئێژێت«٨»: هەندێ کێشەو گرفتی جۆراوجۆر لە ناوەڕۆکی دەستووردا هەیە «ئەو دەستوورەی کە بەخێرایی نووسراوە»، دەبێ گفتوگۆی زێتری لە سەر بکرێت، چونکە کەم و کوڕی تێدایە. «لو» بە «الشرق الاوسط»ی ڕاگەیاند، نووسینگەی نێردراوی نەتەوە یەکگرتووەکان لە عێراق «٥» وۆرک شۆپی تایبەت بە نەوت و بەرووبوومی سروشتی و مافی ئابووری و کۆمەلآیەتی و بابەتی تری کردۆتەوە..).

هەروەها بابەتێکی بەڕێز «دکتۆر منذر الفضل» لە ژێر ناونیشانی «حوکمەکانی هەموارکردنی دەستووری کۆماری عێراقی فیدراڵ لە ڕۆژنامەی خەبات، کە بە دوو بەش لە ڕۆژانی ١و٢/٦/٢٠٠٦ لە هەمان ڕۆژنامەو لە لاپەڕە (٣) بڵاویکردبووەوەو تیایدا خاڵە ناکۆکیەکانی نێو دەستووری هەمیشەیی کۆماری عێراقی خستبووە ڕوو و، ئەگەری سەر لەنوێ باسکردن و مشتومڕی لێ دەکرد.

سەبارەت بە (دستووری هەمیشەیی کۆماری العراق)و (ماف و داخوازییەکانی خەڵکی کوردستان)، نیازمان وابوو پێش دەستبەکاربوونی (لیژنەی پێداچوونەوە بە دەستووری هەمیشەیی العراق) بڵاوی بکەینەوە. کە بە پێی ماددەی«١٤٢» (ئیزافەکراوی) سەر ئەو دەستوورە، دەبوایە هەر لەسەرەتای دەست بەکار بوونی ئەنجومەن، ئەو لیژنەیە پێک بێنێت و دەست بەکار بێت و، ماوەی کارکردنیشی دەبوایە لە (٤)مانگ زیاتر نەخایەنێت.

هەرچی بێت هۆ و هۆکار، ڕۆژی ١١/١٠/٢٠٠٦و بە ئامادەبوونی (١٤٠) ئەندام لەکۆی (٢٧٥) ئەندام، هەر وەکو ڕاگەیاندرا، ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری العراق، بڕیاری پێداچوونەوەی بەدەستووری هەمیشەییدا داو، بۆ ئەو مەبەستە لیژنەیەکی پێک هێناو، دەبێت ئەو لیژنەیە لە ماوەی یەک ساڵدا ئەرکەکەی تەواو بکات و پرۆژەی هەموارکردن بە ماددەو بڕگەکانی دەستوور بخاتە بەردەم ئەنجومەنی نوێنەران، چۆن و کەی ئەنجومەنی نوێنەران بڕیاری کۆتایی لەسەر ئەدەن، دیاری نەکراوە. دروست کردنی ئەو لیژنەیەو ئەرکەکەی، پاش داڕشتنی دەستووری هەمیشەیی و پەسند کردنی لەلایەن ئەنجومەنی نوێنەران، یەک لە مەرجەکانی

---

**«٨» خەبات ژمارە «٢١٨٨» ڕۆژی ٢٨/٦/٢٠٠٦، لاپەڕە ٣».**

هەندێ هێزو لایەنی سیاسی بەرهەڵستکاری عەرەبی العراق بوو(ئەگەر چی ماوە دەستووریەکەی بەسەرچوو)، چونکە ئەوانە کاتی خۆی ئەو دەستوورەیان لاپەسند نەبوو و، تەهدیدی پەک خستنیان دەکرد لە رێگای ریفراندۆمەوە، سەرەڕای توندوتیژی و کردەوە تیرۆریستییەکان.

کە بڕیاریشیان دا بەشداری گەمە سیاسییەکان بکەن، هەر لەسەرەتاوە، دوو جۆرە مەرجیان هەبوو، بۆ بەشداری کردنیان لە ریفراندۆم لەسەر دەستووری هەمیشەیی و، هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری العراق:

جۆری یەکەمی مەرجەکان: بە دەقی یاسایی(ماددەو بڕگە) بوو، لە پێش ریفراندۆمەکەو لە١٤/ ١٠/ ٢٠٠٥ تەسبیت و پەسند کراو، لە هەمووشی سەرنج راکێشتر، مەودا دان بوو بە دروست کردنی لیژنەیەک لە ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری العراق بۆ پێداچوونەوە بە گشت ماددەو بڕگەکانی ئەم دەستوورەدا، پاش دەرچواندنی لەلایەن خودی ئەنجومەنی نوێنەران و، پەسند کردنی لەلایەن خەڵکی العراق لە ریفراندۆمی رۆژی ١٥/ ١٠/ ٢٠٠٥، ئەمەش لەرووی پراکتیکەوە سڕ بوون و زیاتر پەراوێز کردنی ریفراندۆمەکەو، هەروەها گومان خستنە سەر خودی دەستووری هەمیشەیی العراق بوو.

ئەم مەرجە لە (ماددە ١٤٢)ی دەستووری هەمیشەیی العراق تەسبیت کرا کە جەخت دەکات لەسەر:

یەکەم: ئەنجومەنی نوێنەران لەسەرەتای دەست بەکاربوونی لیژنەیەک لە ئەندامانی پێک دەهێنێت و، ئەرکی ئەم لیژنەیە:

- پێداچوونەوەیە بە گشت ماددەو بڕگەکانی دەستووری هەمیشەیی العراق (بە دەر لەحوکمی ماددە (١٢٦)ی خودی دەستووری هەمیشەیی کە بەپێی بڕگەی پێنجەمی ئەم ماددەیە(هەڵوێر کراوە - استثناء) (چۆنیەتی هەموار کردنی دەستوور).
- پێشکەش کردنی ڕاپۆرتێک بە ئەنجومەنی نوێنەران تیایدا ئەو ڕاسپاردانە لە خۆدەگرێت و، پێویستە هەموار بکرێت (بەرای لیژنەکە).
- سەقفی زەمەنی لیژنەکە دیاری کراوە، کە نابێت لە چوار مانگ زیاتر تێپەڕ بکات (لەرۆژی دامەزراندنیەوە).

- پێشنیاری هەموارکردنی دەستوور، دەبێت بەپێی ئەم مەرجانەی خوارەوە بێت[9]:

١- دەبێت هەموار کردنەکان بەجارێک بخرێنە بەردەم ئەنجومەنی نوێنەران بۆ دەنگ لەسەر دانیان.

٢ - ئەم هەموار کردنانە بەڕەزامەندی زۆرینەی رەهای ئەندامانی ئەنجومەن بڕیاری لەسەر دەدرێت، واتە هەموار کردنەکە لە ١٣٨ دەنگ کەمتر بەدەست نەهێنێت.

٣- ماددە هەموار کراوەکان هەر هەموو وەک یەک پاکێت بخرێنە بەردەم میللەت بۆ ڕاپرسییەکی میللی لەماوەی دوو مانگ لەمێژووی بڕیار لەسەردانی هەموار کردنەکە لە ئەنجومەنی نوێنەران.

٤- ڕاپرسی لەسەر ماددە هەموار کراوەکان بەڕەزامەندی زۆرینەی دەنگدەران سەردەکەوێت، ئەگەر دوو لەسەر سێی دەنگدەران رەتی نەکەنەوە لە ٣ پاریزگا ، یان زیاتر. واتا ئەوانەی کە بەشدار دەبن لە دەنگدان نەک، ئەوانەی کە مافی دەنگدانیان هەیە.

جۆری دووهەمی مەرجەکان : بەلاوەنانی ئەنجامی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری العراق بوو، لە دامەزراندن و پێکهاتەی حکومەتی العراق و، دابەش کردنی پۆستە سیادییەکان.

ئەوەی مەبەست بێت لای ئێمەو لەم باسەدا، پرسی کوردە، بەپێی ماددەو بڕگەکانی دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق و ئەگەری گۆڕانکارییەکان و، مەبەستی هەندێ لەو هێزو لایەنانە سەبارەت بە پرسی کوردو مافەکانی.

بە پێی ئەم ماددە ئیزافەکراوەی سەر دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق، هەر وەکو لە بڕگەی (١)یدا هاتووە، بۆ ئەم لیژنەیە هەیە بەگشت ماددەو بڕگەکانی ئەم دەستوورەدا بچێتەوەو پێشنیاری گۆڕانکاری تێدا بکات، بێ ئەوەی روونی کاتەوە چۆن ئەم لیژنەیە بڕیار وەردەگرێت...؟ بەتەوافق... بە زۆرینە...؟

هەرچۆن بێت، ئەوەی لای ئێمە گرنگە، هەندێ لەو هێزانە لایەنگری فیدرالییەت نین، ئەگەر پێیان نەکرا گۆڕانکاری بکەن، ئەوە هەوڵ ئەدەن سنوورو دەسەڵاتی

---

(٩) بڕوانە بابەتەکەی بەڕێز(د.منذر الفضل ـ حوکمەکانی هەموارکردنی دەستووری کۆماری ئێراقی فیدراڵ ـ بەشی «١»)، رۆژنامەی « خەبات» رۆژانی ٢.١ /٢٠٠٦/٦، لاپەرە (٣).

ناوەندی بەغدا زیاتر بکەن و تاکو پێیانیش بکرێت دەسەڵات و مافەکانی کورد کەم بکەنەوەو گەمارۆی دەن، بۆ ئێمەی کوردیش هەلێکی زێڕینە، کە دوور نییە ئیتر دووپات نەبێتەوە، بۆ تەسبیت کردنی مافەکانمان ؛ چ ئەوەی لەدەستوورەکەدا هاتووەو، دارشتنەوەی ماددەو برگە تەم ومژاوی و پڕ لەپێچ و پەناکانی و، هەڵگرتنی لەمپەرو کۆسپەکانیان. چ ئەوەی لایەنی کوردی سەرنەکەوت لەتەسبیت کردنیان، یان بەسەریدا سەپا، یان بە سەریدا تێپەڕبوو...
گومان لەوەدا نییە نوێنەرانی کورد لە بەغدا، لە کاتی دارشتن و گفتوگۆیەکانی پێش پەسند کردنی دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق، هەوڵی زۆریان داوە سەبارەت بە تەسبیت کردنی ماددەو برگە پەیوەندارەکان بە ماف و داخوازییەکانی خەڵکی کوردستان، هەندێ شتیش بە سەریاند تێپەڕیوە، هەندێکی تریش لایەنی بەرامبەر رەفزی کردووە، یان لە کاتی دارشتندا لاوازو تەهمیش کراون، خۆیان و توێژێکی زۆر لە پسپۆڕانی مەیدانی دەستوورو یاساو رۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی وڵاتەکەمان ددان بەو راستیەدا ئەنێن، ئەگەر چ دوور نییە هێشتا هەبن هەر سوور بن لە سەر ئەوەی کە [ (٩٨٪ )ی مافەکانی کورد لەم دەستوورەدا تەسبیت کراوە..!] ، بۆیە پێداچوونەوە بەدەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق بەو شێوەی کە لە ماددەکەی سەرەوەدا، ئامەژەمان بۆ کرد، هەلێکی رەخساوە، کە لایەنی کورد جەخت لەسەر جەمسەرە سەرەکییەکانی مافی میللەتەکەمان بکات، لەوانەش:

## ناوو پێناسەی دەوڵەتی عێراق

لە نێو لیژنەی دارشتنی دەستووری هەمیشەیی، لەسەر ناوی « عێراق » ، وەکو دەوڵەت مشتومڕێکی زۆری لەسەر بووە، بۆ یەکلا کردنەوەی ئەم بابەتە زۆر گوتراو، و نووسرا. بۆ ئەمەش دەگەڕێینەوە بۆ یادەوەرییەکانی یەکێک لە ئەندامانی لیژنەی دارشتنی دەستووری هەمیشەیی العراق ئەویش بەڕێز «الدکتور محسن باقر القزوینی»ـە-ئەندامی لیژنەی دارشتنی رەشنووسی دەستووری هەمیشەیی العراق-، کە لە (موسوعة النهرین) رۆژی ٢٠٠٥/١٢/٣ ، بڵاویکردوەتەوە، لە ژێر ناونیشانی (الجمهورية العراقية الإسلامية الاتحادية) نووسیویەتی و دەڵێت:
" الجمهورية العراقية الإسلامية الاتحادية"
«حدث جدل واسع حول تسمية العراق فكانت المقترحات آلاتية:

أولا: العراق من دون أية عبارة أخرى.
ثانيا: جمهورية العراق وهي التسمية القائمة التي تم وضعها في عهد صدام حسين ولازالت موجودة.
ثالثا: الجمهورية العراقية وهي التسمية القديمة قبل أن تتغير في عهد صدام.
رابعا: الجمهورية العراقية الاتحادية وهي التسمية التي كان يصر عليها الطرف الكردي في لجنة كتابة الدستور.
خامسا: الجمهورية العراقية الاتحادية الإسلامية وهي التسمية التي اقترحها الطرف الشيعي في اللجنة.

وكان وراء كل تسمية مبرراتها، فالذين كانوا يريدون كلمة العراق وحدها من دون أية إضافة كانوا يستشكلون على كلمة الجمهورية ويرون أنها مستوردة من الفكر الغربي وهي تتناقض مع الفكر الإسلامي الداعي إلى سيادة الشريعة الإسلامية، وكان هؤلاء يرون أن عبارة الجمهورية تعني سيادة الشعب وسيادة الشعب تعني أنه صاحب السلطة في التشريع.

وكان الرد علي هذا الرأي واضحا جليا فـ(الجمهورية) لفظ مجرد لا يعني سيادة الشعب ولا يعني منح الشعب صلاحيات تشريع القوانين بمعزل عن الأحكام الشرعية. كما وأن اللفظ لتمييز شكل الدولة عن الدولة الملكية ومنحها صفة الشعبية.

أما عبارة جمهورية العراق فكانت حجة الذين اقترحوها أنها العبارة المناسبة التي حددها مجمع اللغة العربية ولا علاقة لصدام حسين بها وأن ظهورها في زمانه لا يعني انه المسئول عن إطلاقها وأنها لا تحمل أية ظلال بعثية كما يرى البعض.

أما الجمهورية العراقية فهي التسمية القديمة للعراق وكان المنادون بها يريدونها بديلا عن «جمهورية العراق » التي تحمل ضلالا من العهد البائد.

وقد رد هذا المقترح بأن العبارة غير سليمة من الناحية اللغوية، بينما لغة جمهورية العراق أصح وأسلم.

وإلى جانب هذه التسميات كان الأكراد يصرون على إضافة عبارة الاتحادية إلى الجمهورية العراقية أسوة بالجزائر وألمانيا ودول أخرى.

أما مقترح إضافة الإسلامية فكان ورائه فئتان، فئة من أعضاء اللجنة كانوا يريدون إسقاط عبارة الاتحادية ومساومة الأكراد على التنازل عنها فى قبالة

التنازل عن الإسلامية، إذ كانوا على يقين أن الأكراد سيرفضون تسمية العراق بالإسلامية.
وفئة أخرى كانت ترى ضرورة وجود هذه العبارة كإشارة إلى وجود الأكثرية الإسلامية وكنت من بين هذة الفئة ومن المتحمسين لإضافة الإسلامية من منطلق الحقيقة وليس المناورة.
وكان التخوف الكردي من العبارة ينطلق من تخوفهم من الدولة الدينية وادعائهم أن وجود هذه العبارة يعني أن العراق سيتحول إلى دولة دينية. وقد أخذت أطراف الحديث وتكلمت بإسهاب للرد على هذه الحجة فقلت :-إن وجود عبارة الإسلامية على اسم العراق لا يوحي بأن العراق دولة دينية بحتة لأن هذه العبارة موجودة على اسم دول عديدة كأفغانستان وموريتانيا مع أنهما ليستا بدول دينية، هذا من جانب ومن جانب آخر إن وجود عبارة الإسلامية فيه إشارة إلى تاريخ العراق وإلى وجود العتبات المقدسة وإلى وجود الأكثرية المسلمة فى العراق، كما وأن وجودها سيشكل مانعا من انحراف الحكومات عن الجادة الإسلامية ويحول دون الغزو الفكري الذي سيتعرض له العراق على أيدي القوى الغربية، إشارة إلى وجود تيارات مختلفة فى العراق تريد استباحة ثقافته وفكره وتحويله إلى قلعة للتغرب.
وفي الجانب الآخر كنت أرفض استخدام عبارة الإسلامية للمساومة مع الأكراد، وقد تحدثت إلى الإخوة الذين كانوا يعملون بهذا الاتجاه وقلت لهم: إن الإسلام اسم مقدس وليس من الصحيح المساومة عليه، وبم تجيبون الجماهير عندما يعرفون أنكم استخدمتم كلمة الإسلام للمناورة لإسقاط عبارة الاتحاديه.
وكانت النتيجة ما أراده هؤلاء إذ تنازل الأكراد عن عبارة الاتحادية في مقابل الطرف الآخر عن عبارة الإسلامية فأصبحت تسمية العراق باسم جمهورية العراق.

له دەقی ئەم باسەی بەڕێز (القزوینی) چەند شتێکمان بۆ روون دەبێتەوە :
* هەر لە سەرەتاوە، لەسەر ناوی عێراق خیلاف و مشتومڕێکی زۆر هەبووە و، دیارە داکۆکی لایەنە ئیسلامییەکانی نێو کۆمەڵەی نیشتمانی و، بە تەحدید لە نێو لیژنەی دەستوور، لەسەر زاراوەی (الاسلامیە) بۆ سازشکاری بووە لەگەڵ لایەنی کوردی، هەروەها :

* دیاره پێشوەخت زانیاری ئەوەیان هەبووە کە کورد رازای نابێت لەسەر ئەم زاراوەیە...! هەر وەکو بەڕێز (القزوینی) نووسیویەتی، (ئەمەش یەک لە هەڵەکانی دانوساندن وگفتوگۆیە، کە هەر لەسەرەتاوە بەرامبەر کارتی دەستت بخوێنێتەوە). پاشان دەرکەوت کورد ئامادە بووە تەنازول بکات لە زاراوەی (الاتحادی). بەمەش لایەنە ئیسلامییەکان گۆڵی خۆیان کرد.

هەروەها پێناسەی (العراق)یش هەر وەکو ناوەکەی مایەی باس و لێکدانەوەو گفتوگۆی جیا جیا بووە لە رەشنووسەکانی یەک و دووی ئەم دەستوورەو لە (مادده ١)یدا بەم شێوەیە پێناسەی (العراق) دەکرا:
دەقی عەرەبییەکەی: (جمهورية العراق دولة اتحادية واحدة مستقلة ذات سيادة كاملة، نظام الحكم فيها جمهوري نيابي (برلماني) ديمقراطي، وهذا الدستور ضامن لوحدة العراق.)
دیارە پاش ئەوەی شاندی کورد دەستی هەڵگرد لە (الجمهورية العراقية الاتحادية)و پاشەکشەی کرد لە (مافی چارەنووس)و چەند مافێکی تر وەکو دەقی دەستوور، پێناسەکە هەندێ دەستکاری کراو (الاتحادية) هێنراوەتە پێشەوە، لەراستیدا ئەمەش هەر وەکو (قزوینی) لە باسەکەیدا جەختی لەسەر کردووە لە رووی دارشتنەوە دروستترە، چونکە (فەدرەلە) کردنی (العراق)وەکو دەوڵەت نەک ئەوی تر کە فەدرەلەکردنی (نیزام)ـەکەی بوو.
پاش ئەو چاکسازییە کە کەوتە سەر ماددەی (١)ی دەستووری هەمیشەیی، بەندە بە هەنگاوێکی ئیجابی باشی دەیژمێرێت، بە گەرمی دەستخۆشی لە شاندی کوردستانی دەکرێت، چونکە هەر خودی ئەم چاکسازییە رێگای ڤاڵاو هاسان کرد بۆ تەسبیت کردنی خودی ناوی (کۆماری عێراق) لە (کۆماری العراق) بۆ کۆماری (عێراقی فیدراڵی) و هەروەها پاش ئەو چاکسازییە پاساوی لکاندنی (الاسلامیەی لەسەر ناوی عێراق مانای نامێنێت). ئەگەر لایەنە ئیسلامییەکان سوور بوون لەسەری ئەوە قابیلی دانوساندنە.
بەش بە حاڵی خۆم، مانەوەی ناوی دەوڵەتی (العراق) بە (کۆماری عێراقی فیدراڵی «ئیتحادی» ئیسلامی) لەم قۆناغە. بۆ کورد زۆر سوود بەخشتر دەبوو لە تەنازول کردن لە (الاتحادية= فیدراڵیە) بەرامبەر بە لادانی(الاسلامیة)، بە

تایبەتی پاش ئەوەی دەرکەوت بۆ شاندی کورد، کە لایەنی ئیسلامی ئامادە نین زاراوەی (کۆماری عێراقی یەکگرتوو) بێ زیاد کردنی (ئیسلامی) قەبووڵ بکەن چونکە:

١. بە پێناسەی ناوی عێراق وەکو کۆمارێکی (فیدراڵی ئیسلامی عێراق) ئەوە (دەوڵەتی العراق) دەبووە دەوڵەتێکی (فیدراڵی) و لە هەموو ناوەندەکانی نیشتمانی و هەرێمایەتی و نێودەوڵەتی، نەک وەکو ئێستا (جمهورية العراق)، هەر وەکو لە ناوەڕۆکی ماددەی(١)ی دەستووری هەمیشەیی العراق پاش چاکسازییەکە تەسبیت کراوەو دەڵێت: (جمهورية العراق دولة مستقلة ذات سيادة، نظام الحكم فيها جمهوري نيابي (پرلماني) ديمقراطي اتحادي) واتە (کۆماری عێراق دەوڵەتێکی سەر بە خۆو شکۆدارە، سیستمی حومکڕانی تیایدا کۆماری نوێنەرایەتی(پەرلەمانی) دیموکراسیی یەکگرتووە).
دیاریشە کە جیاوازییەکی زۆر هەیە لە پێناسەی (دەوڵەتی فیدرال) و (سیستمی= نظام)ێکی فیدراڵ...!

٢. بەم پێناسەیە(کۆماری عێراقی فیدراڵی..) ناوەڕۆک و شێوازی (دەوڵەتی ناوەند= دولة العراق) دەسڕایەوەو ناوەکەشی تەعبیری دەکرد لە واقیعی ئەم عێراقە بە گەلانی (کوردو عەرەب و تورکمان و کلدۆ ئاشوور..)و، بە خاکیەوە کە پێک هاتووە لە (کوردستانی باشوورو عێراقی عەرەبی). واتە (ناو) لە دوڵەتێکی (سادة = بسيطه) دەبووە دەوڵەتێکی (مرکب). ئەم راستییە چەسپاوتر دەبوو ئەگەر هاتوو پێناسەی عێراقیش گۆڕانی بێتە سەرو جەخت بکرێت لەسەر دوو لەتی خاکەکەی و نەتەوەکەی.
یەکەمیان ناوەڕۆک و سیمای دەوڵەتێکی (مەرکەزییە)و، دووهەمیان ناوەڕۆک و سیمای دەوڵەتێکی (فیدراڵە).

٣. هێنانە پێشی زاراوەی (الاتحادية) لە پاش (جمهورية العراق) کە ولاتێکی (اتحادي)یە لە دەوڵەتی العراق بۆ بە دەوڵەتێکی (اتحادي) وەلێ موقابیلی چ..؟
موقابیلی:
* تەسبیت کردنی ناوی عێراق بە (جمهورية العراق).
* ئیزافە کردنی (واحدة مستقلة) بۆ سەر ماددەکە.

* ئیزافەکردنی(کاملة) لە پاش (سیادة).
* ئیـزافـە کـردنی رسـتـەی (وهـذا الـدسـتـوور ضـامن لوحـدة العـراق) لەسـەر پێناسەی (العراق) و لە کۆتایی، ئەم ماددەیە دوو راستیمان بۆ دەردەخات:
أ. ئەم دەسـتـوورە کـە یەکـێـتـی خـاکی الـعـراق دەپارێزێت قـابیلی گـۆڕین و چاکسازییە لەئایندەدا.
ب. ئەم ئیزافە کردنە لە ماددەیەکی دەستووری، ئەو بۆچوونانە بەتاڵ دەکاتەوە گوایە ئەو دەقەی کە لەدیباجەی دەستوورەکەدا هاتووە: (ان الالتزام بهذا الدستور یحقق للعراق اتحادة شعبا وارضا وسیادة.) مانای (مافی چارە خـۆنووسین)ـە بۆ کـورد، چونـکە دەسـتـوورەکـەی نەک (ئیلـتـزام کـردن بە دەسـتـوورەکە = پابەندبوون) لە بەشی دووهەم هەندێ بەفراوانی باسی ئەم خاڵە دەکەین.
٤. کوردیش ئیـسـلامـەو زۆر دەوڵەتیش هەیە پێناسەی ناوەکـەی بە ئیـسـلامـییـەوە تەواو دەبێت، هەر وەکو بەڕێز القزوینی ئاماژەی بۆ کردووە،
٥. لەوە بوو تەنازول کـردنی لایەنی کـوردی لە زاراوەی (الفـیـدرالیـة) بەرامـبەر تەنازولی لایەنی عەرەبی لەسەر زاراوەی (الاسلامیـة)، لای زۆر کـەس پەسند بایە، ئەگەر هاتوو ئەم دەسـتـوورە بە کـردەوە، پێناسەی عـێـراقـی بکردایە وەکـو (دەوڵەتێکی عەلمانی).

کـە بە پێـچـەوانەوە ئێـسـتـا، ناوەڕۆکی ئەم دەسـتـوورە، زۆر بە زەقـی، ناسنامـەی (ئایینی و ئیـسـلامی و عـەرەبی کـۆمـاری العـراق)ی تەسـبـیت کـردووە، هەر لە سەرەتای دیباجەکەیەوە تاکو ناوەڕۆکی خودی دەستوورەکە ئەم سیفەتەی پێوە دیارە. هەر بۆ نموونە بڕوانە:
* بڕگەی (یەکەم)و بڕگەی (یەکەم-أ)و بڕگەی (دووەم)ی ماددەی (٢) کە دەڵێت: «(یەکـەم - ئیـسـلام ئایینی فـەرمـیی دەوڵەتەو، سـەرچاوەیەکی بنەڕەتییـە بۆ یاسادانان:
أ. نابێت یاسایەک دەرچێت لەگەڵ حوکمە نەگۆڕەکانی ئیسلامدا ناکۆک بێت...
دووهەم - ئەم دەسـتـوورە پاراسـتنی ناسنامە ئیـسـلامـییـەکـەی زۆرینەی گـەلی عێراق مسۆگەر دەکات...»

هەروەها ماددەی (٣)یش کە دەقە کوردییەکەی دەڵێت: (عێراق وڵاتێکی فرە ئایین و ئاینزایە و، بەشێکە لە جیهانی ئیسلامی و ئەندامێکی دامەزرێنەرو کارای کۆمکاری عەرەبییەو پابەندی بەڵێننامە («میثاق» کەیەتی)و، دەقە عەربییەکەشی دەڵێ: (العراق بلد متعدد القوميات والأديان والمذاهب، وهو جزء من العالم الأسلامي، وعضو مؤسس وفعال في جامعة الدول العربية، وملتزم بميثاقها.)..

پێناسەی العراق بەم شێوەیەو بە تەحدید کە دەوڵەتێکی ئیسلامییەو، (ئەندامێکی دامەزرێنەرو کارای کۆمکاری عەرەبییە)و، (پابەندی پەیماننامەکەیەتی) ناسنامە ئیسلامیەتی و(عروبەتی)ئەم وڵاتەی حەسم کردووە، چونکە:
لە ماددەی(١)ی پەیماننامەی کۆمکاری عەرەبی هاتووە دەڵێت: (تتألف جامعة الدول العربية من الدول العربية المستقلة الموقعة على هذا الميثاق، ولكل دولة عربية مستقلة الحق في أن تنظم الى الجامعة، فإذا رغبت في الانضمام، قدمت طلبا بذلك يودع لدى الأمانة العامة الدائمة، ويعرض على المجلس في أول اجتماع يعقد بعد تقديم الطلب.). واتە (کۆماری العراق) وڵاتێکی (عەربی)یە و، وڵاتیش یەعنی گەل و خاک...هتد!
هەروەها سوور بوونی لایەنی عەرەبی لەسەر (جمهوريه العراق) واتە ئیزافە کردنی (ال التعريف) لەسەر (ناوی ـ عێراق ـ کە نەکیرەیە، کرا بە«العراق» کە یەک عێراق هەیە نەک عێراقی عەرەبی و عێراقی غەیرە عەرەبی...هتد)، دیسان سوور بوون و جەخت کردن لەسەر یەک (عێراق)و، یەک خاک و یەک گەل، ئەم سووربوون و جەخت کردنە جارێکی تریش هەر لە ئیزافە کردنی (چەند زاراوەیەکی تر) لەسەر ئەم ماددەیە بە دی دەکرێت و دووپات دەبێتەوە، وەکو ئەم (عێراق)ـە (ئەندامێکی دامەزرێنەرو کارای کۆمکاری عەرەبەییەو پابەندی پەیماننامە «میثاق»کەیەتی) و، هەر وەکو باسمان کرد، کۆمکاری عەرەبیش پێکهاتووە لەوڵاتانی عەرەب. تەماشای ئەو هەموو تەئکید کردنە: (ئەندامێکی دامەزرێنەر... کارا... پابەند بە پەیماننامە...هتد..).
* دیباجەی دەستورەکە: (بسم الله الرحمن الرحيم) و (ولقد كرمنا بني ادم) یان (نحن ابناء وادي الرافدين، موطن الرسل والأنبياء، ومثوى الأئمة الأطهار...)

یان (وفوق ترابنا صلی الصحابة والأولیاء..) یان (واستجابة لدعوة قیاداتنا الدینیة... و اصرار مراجعنا العظام...)«١٠».

٦. کە لایەنی کوردی پێی نەکرا شەراکەتی کوردو عەرەب لەم دەستوورەدا تەسبیت بکات، یان کورد وەکو نەتەوەیەک شان بە شانی نەتەوەی عەرەب لەم عێراقەدا ساغ بکاتەوە، هەر وەک چۆن عەرەبەکان سەرکەوتوو بوون لە پێناسەی ناسنامەی عروبەتی عێراق وەکو گەل و وەکو خاک و، وەکو دەوڵەتێکی ئایینی، ئەڵێین کە ئەوان (عەلمانییەکانی عەرەب و لایەنەکانی تری غەیرە مەزهەبی و ئیسلامی سیاسی)، نەیتوانی عێراق پێناسە بکەن وەکو دەوڵەتێکی عەلمانی و مەرج نەبێت هەموو یاساو رێساکانی ئەم عێراقە لە (حوکمە نەگۆڕەکانی ئایینی ئیسلام دەرنەچێت)و ئایینی ئیسلام (سەرچاوەی بنەڕەتی) یاسادانان بێت، ئیدی شەرم کردن، یان پاشگەزبوونی لە زاراوەی (فیدراڵی= الاتحادی) لەبەر سڕینەوەی زاراوەی (الاسلامیه) بۆ چی و لە پای چی..؟!، هەر بۆ ئەوەی بڵێین کورد عەلمانییە...؟! یان: لە جیاتی لایەن و هێزو پرۆژەی خەڵکی تر، کە هەر ئەوان بوونە مایەی ئەوەی کە یەکەم جارە لە مێژووی ئەم عێراقە داتاشراوەی خۆیاندا، دەسەڵات بکەوێتە دەستی زۆرینەی هێزە ئیسلامییە سیاسییەکان و، تەوژمی ئایینی و ئاینزای توندڕەو لە پەرەسەندندا بێت«١١»و، دەستووری هەمیشەیی عێراقیش بە رەنگ و بەناوەڕۆک ئیسلامی بێت..!

ئیتر بۆ دیسان کچی خۆمان بکەینەوە بە قوربانی کوڕی خەڵکی...!

بۆیە دەکرێت لایەنی کوردی هەلی پێداچوونەوە بە دەستووری هەمیشەی و دەرفەتەکانی تریش بقۆزێتەوەو جەخت لە گۆڕینی ناوی عێراق بکات لە (کۆماری عێراق)بۆ (کۆماری عێراقی فیدراڵ)و، ماددەی (١)یش هەر وەکو خۆی بمێنێتەوە، واتە لە دەوڵەتێکی (سادە = بسیطە) بۆ دەوڵەتێکی (ئاوێتە = مرکبە)، چونکە (شکل ومضمون) لەخودی ناوو ناوەڕۆکی دەوڵەتی عێراق دەبێت (مطابق) بێت و، و شەراکەتی کورد (بە خاک و بە نەتەوە) لە پێناسەی ئەو (العراق)ـە زامن بکرێت....

---

**«١٠» بڕوانە دیباجەی دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق و، ماددە (١٠)ی دەستووری هەمیشەیی کۆماری عێراق (العتبات والمقامات الدینیة في العراق کیانات دینیة...) لە پاشکۆی ژمارە «١».**

**«١١» (لەکۆی گشتی ٢٧٥ لە ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران کۆماری عێراق زیاتر لە ـ ٧٠٪ یان ـ سەران و ئەندامان و نوێنەرانی لایەنە ئیسلامی ومەزهەبیەکانن ـ).**

لایەنی کوردستانی هەوڵی دابوو کە ئەم « پرنسیپە» لەدەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق تەسبیت بکات. بەندە لەوە دڵنیایە کە هەوڵ کۆششی زۆریانیش داوە. لایەنی غەیرە کورد لە لیژنەی دارشتنی ئەم دەستوورەدا، هەروەها ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری العراق و سەرانی لیستەکانی نێو ئەم ئەنجومەنە، دژ بوونە.
لەم بارەیەوە بەرێز «د.منذر الفضل» لەمەڕ مافی چارەخۆنووسینی کورد لە دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق، لە ژێر ناونیشانی (الفیدرالیة وقضیة شعب کوردستان في مسودة الدستور الجدید) و، لە پەرەگرافی (اولا : حق تقریر المصیر لشعب کوردستان self-determination) ئەڵێت: (رغم ان من حق الشعب الکوردي ان یقرر مصیره بنفسه وفي تحدید نوع العلاقة مع المرکز سواء في اختیار الفیدرالیة أم الکونفدرالیة أم أعلان دولته الکوردیة المستقلة علی ارضه طبقا لقواعد القانون الدولي والعهد الدولي الملحق بالأعلان العالمي لحقوق الأنسان والقرارات ذات االصلة الا ان مشروع الدستور لم یتضمن النص علی هذا الحق في مادة مستقلة بسبب اعتراضات من باقي الأطراف في اللجنة الدستوریة والقیادات السیاسیة الأخری.)
لە جیاتی ئەوەی لای سەرکردایەتی سیاسی کورد، ئەم پرنسیپە خەتی سوور بێت و پێ داگرێت لە سەری، دەبینین لەمەش خاو بووەوە، بەم رستەیەی خوارەوە کە لە دیباجەی دەستووری هەمیشەیی تەسبیت کرا، رازی بوو:
- دەقە عەربیەکەی: (ان الالتزام بهذا الدستور یحقق للعراق اتحاده الحر شعبا وارضا وسیادة)
دەقە کوردیەکەی: (پابەندبوون بەم دەستوورە یەکێتی سەربەستانەی گەل و خاک و سەروەری عێراق دەپارێزێت.)، بەوەش رانەوەستان، بەڵکو هەر پاش راگەیاندن و بڵاوبوونەوەی دەقی دەستوور، لە رێگای کەناڵەکانی راگەیاندنی هەردوو حزبی سەرەکی کوردستانەوە، دەست کرا بە هەڵمەتێکی پڕوپاگەندەی یەک تەرەفە، بۆ داپۆشینی ئەو خاوکردنەوەو تەصریف کردنی ئەو رستەیە کە گوایە ئەمە خودی ناوەڕۆکی پرنسیپی «مافی چارەخۆنووسینی خەڵکی کوردستانە».
ئێمەو بگرە توێژێکی زۆر لە پسپۆڕان و رۆشنبیرانی کورد، چ لە رێگای نووسین و شی کردنەوەکانیان یان لە کۆڕو سمینارو دیدارو چاوپێکەوتنەکانیاندا، لە دەزگاو میدیا جیا جیاکانی کوردستان و العراق و دەرەوەی وڵات، سەبارەت بە تەسبیت

کردنی مافی (چارەی خۆنووسین) لەلایەن کوردەوەو لە دیباجەی ئەم دەستوورەو، لە خوودی دستوورەکەش، لە بارەی مافی چارەخۆنووسینەوە هیچیان بەدی نەکردووە و، ئەو دەقەش کە پشتی پێ دەبەسترێت، بە هیچ شێوەیەک مانای (مافی چارەی خۆنووسین) بە کورد نابەخشێت. بۆیە هەر لە سەرەتاوە دەکرێت بڵێین لە واقیعدا ئەو دیباجەیە، نە لە دوور و نە لە نزیک بەلای ئەو پرنسیپەدا نەهاتووە.
جارێکی دیکەش دەگەڕێمەوە بۆ ئەوەی کە لە پێشدا گوتوومانە ئەوەیش ئەوەیە کە ئێمە دەقێکی (یاسایی)مان لە بەردەستدایە خەسڵەتی دەقی یاساییش مەعلوومە دەبێت چۆن بێت.....

لێرەدا مافی خۆمانە بپرسین ئەرێ گەلۆ :
ئەگەر نوێنەرانی غەیرە کورد لە کۆمەڵەی نیشتمانی العراق کە زیاتر نوێنەری زۆرینەی عەرەبی باڵادەستی کۆماری (العراق)ـە و، زۆرینەی لیژنەی داڕشتنی دەستوور بوونە، مەبەستیان لەو رستەیە (مافی چارەی خۆنووسین بووە بۆ کورد..)، باشە بۆ بە راشکاوی ئاماژەیان بەو پرنسیپە نەکردووە لەو دیباجەیەدا...؟ و، گرنگ تر لەدیباجەکەش، بۆ لە ماددەیەکی ئەم دەستوورەدا تەسبیت نەکرا.....؟!
هەتاکو ئەگەر ئەو رستەیە وا تەفسیر بکرێت کە مەبەست مافی چارەی خۆنووسینە، بۆ بەم شێوەیە بێت. ئەم ماستە هەڵبەتە بێ موو نییە، یان: وەکو پەندە فارسیەکە دەڵێت: (ئەگەر شما حیلە نەداری چرا لەفلەف میکوونی.)

## مافی چارەی خۆنووسین چیە..؟

مەبەست لە پرنسیپی مافی چارەی خۆنووسین بە کورتی ئەوەیە کە:
ـ هەموو نەتەوەیەک: بێ جیاوازیی قەبارە و ژمارەی هاوولاتییانی و، رەگەزو ئایین و ئاینزا، یان باری کۆمەڵایەتی و جیۆپۆلەتیک و ئابووری و کلتووری...، مافی ئەوەی هەبێت و بتوانێت، بە ئازادی و، بە سەربەستی و، بێ هیچ جۆرە خۆسەپاندن و ملهوڕی و ئیرهابی ماددی و فیکری، نێوخۆ، یان دەرەکی، پاشەڕۆژی خۆی بە شێوەیەکی فەرمی و ئاشکرا لەسەر خاکی خۆی دیاری بکات. ئەو مافەش گشتییە واتە (سیاسی و ئابووری و کلتوری و نەتەوایەتی و ئایینی و مەزهەبی..هتد)

پێش ئەوەش ئەم مافە وەکو پرنسیپ بناسرێت و پێناسە بکرێت و، لەلایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتی و دەزگا مرۆڤایەتییەکانەوە دانی پێدابنرێت و، لە زۆر وڵاتانی جیهان پیادە بکرێت، گەلان بە درێژایی مێژوو خەبات و قوربانییەکی زۆریان بۆ داوەو، لە پێناویدا سەدان کارەسات و نەبەردییان تۆمار کردووە و، ئەم کاروانە ئەگەر چی لە زۆربەی زۆری ناوچەکانی ئەم جیهانە بە ئەنجام گەیشتووە، بەڵام هێشتا لە هەندێ کون و قوژبنی، لە ململانێ و پێش و پاشدایە و، یەک لەو ناوچانە، رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە و، یەک لە قوژبنەکانیشی کوردستانە...

واتە ئەم دیاردەیە لەگەڵ لە دایک بوونی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی و دروست بوونی دەسەڵات و (کیان) و سەرهەڵدانی جیاوازی بەرژەوەندی...هتد، قۆناغ لە دوای قۆناغ، بوون و بایەخی، وەکو پێداویستییەکی مێژوویی، نەدەکرا پشتگوێ بخرێ و، لە پێش نزیکەی (٣) سەدەو لە ئەدەبیاتی رامیاری و یاسایی و کۆمەڵایەتی جێگربوو، وەک یەک لە بنەماکانی پرۆسەی رزگاری و ئازدای و یەکسانی گرنگ لە بیرو خەباتی کەسایەتییە پسپۆڕو رووناکبیرە پێشکەوتووخوازەکانی سەردەمەکان و، دواتریش بووە خاڵێکی گرنگی بەرنامەی رێکخراو و هێزە شۆڕشگێڕو نوێخوازەکان...

**ئیدی دوای ئەوە:**

- مافی چارەی خۆنووسین لە یاساو رێساو دیکۆمێنتە نێودەوڵەتییەکان چەسپاو، بوو بە بەندێکی بەرچاو لەنێو دەستوورو یاسا بنەڕەتییەکانی زۆربەی وڵاتانی ئازاد.
- بە پێی ئەم پرنسیپە نەتەوەیەکی زۆر، لەوانە نەتەوەی (عەرەب)، گەیشتن بە ئامانجی خۆیان بە دروست کردنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان کە ئەمرۆ ژمارەیان (٢٢) دەوڵەتەو هێشتا لە زیاد بوونیشدان..
- تەسبیت کردنی ئەم (پرنسیپە) وەکو خۆی، واتە (مافی چارەی خۆنووسین و تەحدید کردنی تاکو دروست کردنی دەوڵەتی سەربەخۆ) لە دەستووری العراق، مافێکی رەوا بوو، هەروەها تەعبیر بوو لە خودی ناوەڕۆکی ئەو پرنسیپەو، یەک لە بنەما سەرەکییەکانی ئامانج و ویستی خەڵکی کوردستان، کە لە پێناویدا رووباری خوێنی داوە، تاکو رادەی جینۆساید کردن و گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتی...

- نەبوونی دەقێکی وەها روون و زەق و رەها لەم دەستوورەدا، گومان دەخاتە سەر هەموو ماددەو دەقەکانی دیکەی، کە باس لە مافی گەلەکەمان دەکات و، ئەو کەسایەتی و لایەنانەی کە پشت بە دوا رستەی (ئەم دیباجە)یە ئەبەستن و، هەوڵی ئەوە دەدەن گوایە:
- ئەو رستەیە مانای مافی چارەی خۆنووسینە بۆ کورد، یان ئەوانەی کە دەڵێن:
- ئەو مافە بە دەستی کوردە هەر کات بیەوێت و بوێرێت رایدەگەیەنێت و پیادەی دەکات، بۆچوونێکی دروست نییە و، هەڵهاتنە لە واقیع و، پەردەپۆش کردنی سازشکاریەکەیانە (compromise) لەم پرنسیپە....
- دوور نییە بۆ ولاتێکی غەیرە (العراق) و، بۆ گەلانێک غەیرە گەلانی (العراق)و، بۆ نەتەوەیەک غەیرە نەتەوەی کورد، تەسبیت کردنی پرنسیپی (مافی چارەی خۆنووسین) هەمان گرنگی و ئەهمیەتی نەبێت وەکو بۆ کورد هەیەتی، چونکە بۆ ژمارەیەک لە نەتەوەو گەل و کەمایەتی تر و بە تایبەتی لە ولاتانی پێشکەوتوو (تەحصیل حاصل) بووە، بەلام بابەتەکەو لەم بارودۆخەداو، لە ولاتێکدا باسی لێوە دەکرێت کە پێی ئێژن (العراق)و، لە سەرەتای دەستوورەکەی بە (کۆماری العراق) تەسبیت کراوەو لایەنی زۆرینەو دەسەلاتداری عەرەب ئامادە نین ئەو پرنسیپە بە فەرمی قبووڵ بکەن، مەترسی پاشگەزبوونەوەشیان لێ دەکرێت لە هەندێ ماف و پرنسیپی تر، لەوەش گرنگتر هەر وەک ئاماژەمان بۆ کرد ئەم «العراق»ـە لەسەرەتای دامەزراندنەوەیەتی، کوردیش ستوونێکی گرنگی پرۆسەکەیەو قوربانییەکی زۆری داوە بۆ پاراستنی ناسنامەو بوون و مافەکانی خۆی سەرەڕای ئەمانەش چونکە:
- هەموو گەل و نەتەوەیەک گەورە بێت یان بچوک لەسەر خاکی خۆی، مافی رەوای خۆیەتی بە ئازادی و دوور لە جەورو جەفاو فشا ودەستتێوەردانی دەرەکی و، ئیرهابی فیکری ناوخۆیی، بە ئاشکرا بریاری پاشەڕۆژی رامیاری و ئابووری و کلتووری..هتد، خۆی بدات. واتە چارەنووسی بە دروست کردنی (کیان)ی خۆی لەسەر خاکی خۆی دیاری بکات...
- ئەم مافە وەکو پرنسیپ لە مێژ زەمانەوە خەبات و تێکۆشانی بۆ کراوەو، لە پێناویدا میللەتان لافاوی خوێنیان داوەو، بە قوربانییەکی یەک جار زۆر چەسپاوەو، وای لێ هات، ئەم مافە بوو بە بنەمایەکی گرنگی پەیڕەوی نەتەوە

یەکگرتووەکان، کە تاکو ئەمڕۆ (١٩٢) دەوڵەتی سەر ئەم زەمینە پەسندی کردووەو، بەو پێیە بونەتە ئەندام لەو دەزگایە کە لە دیباجەی پەیڕەوو پرۆگرامی و لە بەندی (١) یدا دەڵێت«١٢»:

١- (ان نؤكد من ايماننا بالحقوق الأساسية للأنسان وبكرامة الفرد وقدره وبما للرجال والنساء والأمم كبيرها وصغيرها من حقوق متساوية.) و، هەروەها لەبەندی (٢)ی (بەشی یەکەم) یدا هاتووە:

٢- (ان العلاقة بين الأمم على أساس احترام المبداء الذي يقضي بالتسوية في الحقوق بين الشعوب وبأن يكون لكل منها تقرير مصيرها وكذلك اتخاذ التدابير الاخرى اللازمة لتعزيز السلم العام.). هەروەها:

٣- مادەی ١ی پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە مەدەنی و سیاسییەکان) مافی چارەی خۆنووسین ـ کە دەڵێت:

١. هەموو گەلان مافی ئەوەیان هەیە خۆیان چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن، بە پێی ئەم مافەش ئازادن لە دیاری کردنی ناوەندی سیاسی خۆیان و، ئازادن لەوەدا کە هەوڵ بدەن بۆ بەدیهێنانی گەشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتوورییان.

هەر هەمان پرنسیپ لە برگە (٢)ی جاڕنامەی بەخشینی سەربەخۆیی بە وڵاتان و گەلانی داگیرکراو تەسبیت کراوە.

٢. هەموو گەلان، بەدوای ئامانجە تایبەتییەکانی خۆیاندا، مافی دەستکاری کردنی ئازادانەی سامان و داهاتە سروشتییەکانی خۆیانیان هەیە بە بێ پێشێل کردنی هەر وابەستەییەکی هەڵقوڵاوی پێویستییەکانی هاوکاری ئابووری نێودەوڵەتی کە لەسەر بناغەی سوود گۆڕینەوەو یاسای نێودەوڵەتی دامەزراوە. لە هیچ حاڵەتێکیشدا نابێت گەلێک لە هۆکارەکانی ژیانی تایبەت بە خۆی بێبەش بکرێت.

٣. دەبێت وڵاتانی ئەندام لەم پەیمانەدا، بەوانەیشەوە کە بەرپرسیارێتی بەڕێوەبردنی ئەو هەرێمانەیان لە ئەستۆدایە کە ئۆتۆنۆمییان نییەو ئەو هەرێمانەی چاودێری دەیانگرێتەوە، کار بکەن بۆ بەدی هێنانی مافی چارەی

---

«١٢» (بڕوانە دەستوورەکانی عێراق و لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاریی بە پێی پێوەرەکانی مافە دەستوورییە نێودەوڵەتییەکان «ل١٠٥ی کوردی» و ل٢٧٧ی عەرەبی).

خۆنووسین و ڕێز لەو مافە بگرن، بە گوێرەی بەڵگەنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان.

دەقە عەرەبییەکەی:

(المادة (١) العهد الدولي الخاص بالحقوق المدنية والسياسية «١٣» (حق تقرير المصير)ـ :

١. لجميع الشعوب حق تقريرمصيرها بنفسها. وهي بمقتضى هذا الحق حرة في تقرير مركزها السياسي وحرة في السعي لتحقيق نمائها الأقتصادي والأجتماعي والثقافي.

٢. لجميع الشعوب، سعيا وراء اهدافها الخاصة، التصرف الحر بثرواتها ومواردها الطبيعية دونما اخلال باية التزمات منبثقة عن مقتضيات التعاون الأقتصادي الدولي القائم على مبدأ المنفعة المتبادلة عن القانون الدولي.

٣. على دول الأطراف في هذا العهد بما فيها الدول التي تقع على عاتقها مسؤولية ادارة الأقاليم غير المتمتعة بالحكم الذاتي والأقاليم المشمولة بالوصايا، أن تعمل على تحقيق حق تقرير المصير وأن تحترم هذا الحق وفقا لأحكام ميثاق الأمم المتحدة. هەمان پرنسیپ دووپات بوەتەوە لە بڕگە (٣) لە ڕاگەیاندنی ماف لە گەشە کردندا (المنفعة المتبادلة عن القانون الدولي).

٤- لە هەر (٣) پرنسیپی سەرەوە لە ماددەی (١)ی پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتورییەکان دووپات بووەتەوە«١٤»:

٥- ماددەی (٢٥)ی پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافە ئابووری و کۆمەڵایەتی و کەلتوورییەکان ئەڵێت:

(هیچ حوکمێکی ئەم ماددەیە نابێت وەها لێک بدرێتەوە کە دەستدرێژی بێت بۆ سەر مافێکی ریشەیی گەلان لە ئازادی سوودمەندبوون و کەڵک وەرگرتنی تەواو لە داهات و سامانە سروشتییەکانیان.) هەمان سەرچاوە ل ١٠٦.

---

«١٣» انظر : الدساتير العراقية ودراسة مقارنة بمعايير الحقوق الدستورية الدولية ـ المعهد الدولي لقانون حقوق الانسان ـ كلية الحقوق بجامعة دي بول ـ الطبعة الاولي٢٠٠٥. ص٢٧٧. (*) هەمان سەرچاوەی پێشوو، لاپەڕە (٢٧٨).

«١٤» بڕوانە: دەستوورەکانی العراق و لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاریی بە پێی پێوەرەکانی مافە دەستورییە نێودەوڵەتییەکان.) هەمان سەرچاوە ل ـ (١٠٦) و دەقە عەرەبییەکەی ل (٢٧٨).

دەقە عەربیەکەی:
(المادة (٢٥) العهد الدولي الخاص بالحقوق الاقتصادية والاجتماعية والثقافية«١٥»:
(ليس في اي حكم من احكام هذا العهد ما يجوز تأويله علي نحو يفيد مساسه بما لجميع الشعوب من حق أصيل في حرية التمتع والأنتفاع كليا بثرواتها ومواردها الطبيعية.).

٦- جاڕنامەی بەخشینی سەربەخۆیی بە وڵاتان و گەلانی کۆلۆنیالکراو لە بڕگە (٢)ی هەمان ناوەڕۆکی خاڵی (٣)ی سەرەوە دووپات بووەتەوە، یان لەبڕگە (٣)یدا هاتووە:
«٣. هەرگیز ناکرێت دواکەوتنی ئامادەباشی لە بوارەکانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و زانستیدا بکرێتە پاساو بۆ دواخستنی سەربەخۆیی.»«١٦».
دەقە عەرەبیەکەی: (اعلان منح الأستقلال للبلدان والشعوب المستعمرة)«١٧»:
«٢. لجميع الشعوب حق تقرير مصيرها بنفسها. وهي بمقتضى هذا الحق حرة في تقرير مركزها السياسي وحرة في السعي لتحقيق نمائها الأقتصادي والأجتماعي والثقافي.»
«٣. لا يجوز ابدا ان يتخذ نقص الأستعداد في الميدان السياسي او الأقتصادي أو الأجتماعي أو التعليمي ذريعة لتأخير الأستقلال.»«١٨».

٧- ماددەی (١)ی ڕاگەیاندنی ماف لە گەشەکردندا «المنفعة المتبادلة عن القانون الدولي.»
«٣. على دول الأطراف في هذا العهد بما فيها الدول التي تقع على عاتقها مسؤولية ادارة الأقاليم غير المتمتعة بالحكم الذاتي والأقاليم المشمولة بالوصايا، أن تعمل على تحقيق حق تقرير المصير وأن تحترم هذا الحق وفقا لأحكام ميثاق الأمم المتحدة.».

---

«١٥» هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٢٧٨.
«١٦»(هەمان سەرچاوە ـ ل ١٠٧).پشتی پێبەستراو بڵاوکرایەوە بە سەرخەڵکیدا بە پێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ١٥١٤ (د – ١٥) لە بەرواری ١٤ [ کانونی یەکەمی ١٩٦٠.
«١٧»(المصدرالسابق ص ٢٧٨)، اعتمد ونشر على الملأ بموجب قرار الجمعية العامة للأمم المتحدة ١٥١٤ (د – ١٥) المؤرخ في ١٤ كانون الأول – ديسمبر ، ١٩٦٠.
«١٨» المصدر السابق ص ٢٧٨.

٨- ماددەی (١)ی ڕاگەیاندنی ماف لە گەشەکردندا.

١. ماف لە گەشەکردندا، مافێکە لە مافەکانی مرۆڤ و دەستکاری ناکرێت، بە پێی ئەم مافە هەموو مرۆڤێک و هەموو گەلێک مافی بەشداری و ڕۆڵگێڕانی هەیە لە بەدی هێنانی گەشەکردنی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و سیاسی و، سوودمەندبن لەو گەشەکردنە، کە دەتوانن لە ڕێگەیەوە پراکتیزە کردنی تەواوی هەموو مافەکانی مرۆڤ و ئازادییە بنەڕەتییەکان بکەن.

٢. هەروەها مافی مرۆڤ لە گەشە پێکردنی تەواوی مافی چارەی خۆنووسینی گەلانیش دەگرێتەوە، کە ئەمیش ئەو ئەحکامانە دەگرێتەوە کە پەیوەندارن بە هەردوو پەیمانی نێودەوڵەتی تایبەت بە مافی مرۆڤەوەو، مافی پیادەکردنیان، کە مافی دەستکاری کردنیان لە پیادەکردنی شکۆمەندی تەواویان بەسەر هەموو سامان و بەرهەمە سروشتییەکاندا نییە«١٩».

* پشتی پێ بەستراو بڵاوکرایەوە بەسەر خەڵکیدا بە پێی بڕیاری کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان (٤١) (١٢٨) لە بەرواری ٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٨٦) دەقە عەربیەکەی: (الماده (١) اعلان الحق في التنمية)

«١. الحق في التنمية من حقوق الأنسان غير قابل للتصرف وبموجبه يحق لكل انسان ولجميع الشعوب المشاركة والأسهام في تحقيق تنمية اقتصادية واجتماعية وثقافية وسياسية والتمتع بهذه التنمية التي يمكن فيها اعمال جميع حقوق الأنسان والحريات الأساسية اعمالا تاما.»

«٢. ينطوي حق الأنسان في التنمية ايضا الأعمال التام لحق الشعوب في تقرير المصير الذي يشمل مع مراعاة الأحكام ذات الصلة من العهدين الدوليين الخاصين بحقوق الأنسان ممارسة حقها، غير القابل للتصرف، في ممارسة السيادة التامة على جميع ثرواتها ومواردها الطبيعية.»«٢٠».

أعتمد ونشر على الملأ بموجب قرار الجمعية العامة للأمم المتحدة رقم (٤١) (١٢٨) المورخ في ٤ كانون الأول - ديسمبر ١٩٨٦.

---

«١٩» (هەمان سەرچاوە ل ـ ١٠٩).

«٢٠» (المصدر السابق ص ٢٧٩).

لەگەڵ ئەمانە هەر هەموویاندا، باشە:
- کۆماری (العراق) ئەندامە لە نەتەوە یەکگرتووەکان و مولزەمە بە پەیڕەوی و هەروەها بە یاساو ڕێسا نێودەوڵەتیەکان و، مادده (٨)ی ئەم دەستووره دووپات و جەخت لەسەر ئەم ڕاستییە دەکات و، دەڵێت:
(يرعى العراق مبادئ حسن حقوق الجوار، ويلتزم بعدم التدخل في الشؤون الداخلية للدول الاخرى، ويسعى لحل النزاعات بالوسائل السلمية، ويقيم علاقاته على أساس المصالح المشتركة والتعامل بالمثل، ويحترم التزاماته الدولية)، واته کۆماری العراق، ڕێز لە پابەندییە نێودەوڵەتییەکانی دەگرێ و، (مافی چارەی خۆنووسین) یەک لە پابەندیە نێودەوڵەتییەکانە).
باشە ئیتر بۆ (مافی چارەی خۆنووسین) وەکو خۆی نە لەو دیباجەیەو نە لە هیچ ماددەیەکی دەستووری هەمیشەیی العراق، تەسبیت نەکرا..؟
هەر وەکو سەرانی کوردو زۆر لە لایەنە سیاسییەکانی العراق سوورن لە سەری کە:
١. ئەم قۆناغە قۆناغی سەرەتایی سەرلەنوێ دامەزراندنەوەی کۆماری (العراق)ـە و، گوایە لە کەش و هەوایەکی دیموکراسی و ئازاد و ئارەزوومەندانەو، لە ڕێگای نوێنەرانی هەموو گەلانی ئەم (العراق)ـەوە بڕیاری لەسەر ئەدرێت ـ هەرچەندە (گەلانی العراق) لەم دەستووره بووەتە گەلی العراق.
٢. بە سەرپەرشتی و چاودێری ئەمریکا کە گەورەترین و بەهێزترین دەسەڵات و هێزە لەسەر ئەم زەمینە بەڕێوە دەچێت و،
٣. گوایە خودی ئەمریکا خاوەن ئیستراتیجیەتێکی بەرین و نوێخوازە بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و، (وەکو مەعلوومە کوردیش یەک لە نەتەوەکانی ئەم ناوچەیەیەو بگرە لە جیهاندا نەک هەر مەزلووم و ماف خوراوە، بەڵکو تاکو ئێستا بێ کیانە) و، لە مێژ زەمانەوە زلهێزەکان؛ بەریتانیاو ئەمریکا بە تەحدید، بەرپرسیارن لەو واقیعەو، لە نەهامەت و کارەساتەکانی ئەم نەتەوەیە لە لایەکەوەو،
٤. لە لایەکی ترەوە: هەر وەکو سەرانی کورد خۆیان ڕایانگەیاندووەو جەختی لەسەر دەکەن، گوایە کورد هەرچۆن لە نەخشەی ڕمانی ڕژێمی سەدام و دامەزراندنەوەی کۆماری العراق شەریکی ئیستراتیجی ئەمریکایە، لە نەخشەی (ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە)ش سەرەڕای ئەمانە هەر هەموو.

٥. کورد بێ قەیدو بێ مەرج (بەشداری) ئەو پرۆژەیەی کردووە.
٦. بە ڕەچاو کردنی کارەسات و جینۆسایدی کوردو ئەنفال و تەعریب و کاول کردنی کوردستان و، ئەزموونی ئەم ١٤ ساڵەی کورد بە ئیجابی وسەلبیاتیەوەو، مەوقیع و هێزو توانای خەڵکی کوردستان و، لاوازی و پەرتوبڵاوی و گیروگرفتی لایەنی زۆرینەی عەرەبی کۆماری العراق و، بەوانەیشەوە کە قوربانی زوڵم و زۆری ڕژێمی سەدام بوون و، هاوخەباتی کورد بوون لە بەربەرەکانێی ئەو ڕژێمەو گوایە سوودیان لە ئەزموونەکان وەرگرتووە، هەر وەکو لە پێشەکی خودی ئەم دیباجەیەدا هاتووەو، دەڵێت:

**دەقە کوردیەکەی :**

(ئێمەی گەلی العراق کە پەیمانی بە خۆ داوە بە هەموو پێکهاتەو ڕەنگەکانیەوە بە ئازادی و ئارەزومەندانە بڕیاری یەکگرتوویی خۆی بدات لەگەڵ خۆی و پەندی سبەینێی لە دوێنێ وەربگرێت....).

ئەڵێین لەگەڵ هەر هەموو ئەمانەدا، دەبینین زۆرینەی عەرەبی باڵادەستی کۆماری (العراق) ئامادە نین دان بە پرنسیپی (مافی چارەی خۆنووسین) بۆ کورد بنێن، کەچی لایەنی کوردی دوا ڕستەی ئەم دیباجەیەمان وا بۆ تەفسیر دەکەن کە گوایە، ئەمەیە دان پێنان بە مافی چارەی خۆنووسین و، کردوویانە بە دەستکەوتیش...!

هەرچەندە ئەو ڕستەیە دوورە لەو مانایەو لەگەڵ ئەوەش هەر لە هەمان دیباجەو لە سەرەتای هەمان ڕستەو لە خودی ماددەی (١)ی ئەم دەستوورەو، هەر وەکو لەسەرەوە ئاماژەمان پێ کرد، گەلانی (کۆماری العراق)ی بە یەک گەل تەسبیت کردووە، ئەویش (گەلی العراق)ـە واتە:

١. گەلانی العراق بە یەک گەل پێناسە دەکرێت کە (گەلی العراق)ـەو زۆرینەی هەرە زۆری ئەم گەلە (بە دیدی عەرەبان «٨٠ـ ٨٥٪» )ی عەرەبن و، ئەوە بۆ سنووری نزیکەی یەک سەدەیە نوێنەرانی زۆرینەی ئەم (گەلی العراق)ـە کە عەرەبن حوکمی ئەم (العراق)ـە دەکەن و، لە ژێر ئاڵاو شمشێرو دەسەڵاتی ئەمانە کورد چەوساوەتەوە، تاکو ڕادەی جینۆسایدو گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتی و هەڕەفاندنی ژێر خانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتووری و شارستانی و زیاد لەمەش و هەر لە سەرەتاوە:

٢. كوردستانی باشووریان کە ئەمڕۆ (کوردستانی العراق)ـە لای کوردو، لای عەرەبان، (شمالی کۆماری العراق)ـەو،
٣. ئەم (بەشەی کوردستان)بە زۆرو بێ ئارەزووی کوردو، بە هەڵوێست و بە دیکۆمێنتیش کورد دژی لکاندن و گرێدانی بوونە بەم (العراق)ـە دەستکردو داتاشراوەوە، با هەندێ لەسەرانی کورد، ئەمڕۆ بۆ دەرباز بوونی سیاسەتی رۆژ، ئەم راستییە سەرەولێژ بکەن و، خۆیان هەڵکێشن گوایە کورد لکاندنی کوردستانی باشوور بە گەل و خاکەوە وەکو پارچەیەک لە ئەم العراقە بە ئارەزووی خودی خۆی بووە..!
٤. زنجیرە شۆڕش و راپەڕین و ئەزموونی ١٤ ساڵی دەسەڵاتی خۆماڵی کوردو، ئەزموونی زیاتر لە(٣) ساڵی پاش (رزگار)ی العراق و دامەزراندنی سەرەتاکانی (بە دیموکراتیەت) کردن و بەشداری (فعال)ی کورد لە هەموو هەنگاوەکانی پاش بەهاری ساڵی (٢٠٠٣) بە هەموو قۆناغەکانیەوە: (رزگاری العراق) و (داگیر کردنی العراق)، قۆناغی (کاتی) و قۆناغی (گواستنەوە)و، قۆناغی دارشتنی (دەستووری هەمیشەیی العراق...هتد)، کەچی لە هەموو ئەو هەل و دەرفەتە نوێیانە تەوژمی (عروبەتی) العراق و تەهمیش کردنی کێشەی کورد تاکو لواوە رانەوەستاوە، ئەگەر چی دوور نییە لە هەندێ بواری تیۆریدا کز بێت.
٥. هەروەها لە پاش نەمانی رژێمی سەدام و، لە ماوەی زیاتر لە (سێ) ساڵ، ئەگەر چی بە فەرمی پرۆسەی (تەعریب) لە کوردستاندا راوەستاوە، بەڵام مانەوەی تەعریبچییەکان و تەگەرەو لەمپەرەکانی سەر رێگای جێبەجێ کردنی ماددەی (٥٨)ی پێشوو و (١٤٠)ی ئێستای دەستوور (بە رەچاوکردنی کەم و کورتیەکانی ئەو ماددەیە)و، هەڵوێستی ناوەند سەبارەت بەو کێشەیەو، شاڵاوی تیرۆرو تۆقاندن و راونانی کورد لە پارێزگای مووسڵ و ناوچەکانی تری تەعریبکراو و ناوەڕاست و خوارووی العراق و، تەوژمی مەزهەبی توندڕەوی (عەرەبی سوونەو شیعە)، تەکانێکی دیکەی داوە، نەک هەر بە مانەوەی (تەعریب)، بە لکو بە هێرشێکی تر و، سەرەڕمیان ئەو ناوچە (تەعریبکراوەکانیان)ـەو، کەرەسەکانیشیان تەعریبچییە (سوونەو شیعەکان)ن، کە دەسەڵاتی عەرەبی (سوونە) مەزهەب، لە کاتی رژێمە یەک لەدوای

یەکەکانی عێراقدا، نیشتەجێ و بەکاریان هێنان و، جگە لە تەعریبچییەکانی پێش ئەمانە کە لە سەرەتای دامەزراندنی (العراق)ەوە، بەپێی پلان و سیاسەتێکی رەگەز پەرستی و شۆڤێنی ئەو سەردەمەو بەتایبەتی حکومەتەکەی (یاسین الهاشمی) کە لە سەرەتای سییەکانی سەدەی رابردوو، لە چەند ناوچەی کوردستان بە تایبەتی لەمووسڵ و لە کەرکوک و دەوروبەری (چیای حەمرین) نیشتەجێیانی کردو، ئێستا خودی سەرانی کورد نازناوی (عەربە رەسەنەکان)یان لێ ناون....!، لە گەڵ رێزماندا بۆ ئەو عەرەبانەی بە دەر لەو پرۆسەیە نیشتەجێی کوردستانن، خودی زاراوەی (عەرەبی رەسەن)یش خۆی لە خۆیدا، جێگای باس و لێکۆڵینەوەو سەرنجە..

ئەم (رەسەن)انە کەرەسەی پرۆسەیەکن خاک و ئاوی باب و باپیرانمانیان داگیر کردووەو، هێشتا زۆر لەقوربانییەکانی کوردی ئەو پرۆسەیە لە ژیاندان و، بوونی ئەمانە (بە رەسەن و نا رەسەن)یان، دژی گشت راستییەکانی مێژوو و جوگرافیاو کۆمەڵناسی و بەڵگە فەرمییەکانی خودی حکومەتە یەک لەدوای یەکەکانی (العراق)ە، هەروەها دژی خودی بەرنامەو هەڵوێستی بزاڤی رزگاری خوازی کوردستانە لەمەڕ تەعریب و گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتیمان...

(رەسەن) و (نا رەسەن)، دووڕووی دراوێکن و یەک پێناسە دەیانگرێتەوە ئەویش (تەعریب)ە. ئەگەر کار وا بڕوات دوور نییە پاش ماوەیەکی کورتی تر ئەوانەش کە ئەمڕۆ پێیان ئەڵێن (عەرەبی هاوردە) و (غەریب...هتد) ببنە هاوڵاتی رەسەنی ئەو ناوچانەو، تەوژمی (پێنجەمی) تەعریب، کە ماوەیەکە لە هەندێ لە ناوچە تەعریبکراوەکانی کوردستان دەستی پێ کردوەتەوە، کە بە (لێقەوماو و کارکەر...) لە قەڵەم ئەدرێن ببن بە (رەسەن)...!

گەلێک، رابردووی ئەو هەموو کارەسات و نەهامەت و کۆمەڵ کوژییە بێت و، بە هەموو جۆرە ناکۆکی و ململانێ و لاوازی و نارێکی بەرامبەرەکەی ئەمڕۆی و، ئەو جۆرە مامەڵەیە لەگەڵ کێشەکەیدا دەکرێت و، لەگەڵ ئەو هەموو هێرش و شاڵاوە رەگەزپەرستی و شۆڤێنیزمەی زۆربەی هەرە زۆری رژێم و جادەی (عەرەبی) بە پانتاییەکی گەورەی عەرەبی عێراقیشەوەو ئەو هەموو راونان و تیرورو کوشتن و، لە کاتێکدا کورد لە کوردستانی عێراق لە (جۆش و خرۆشی هەرەتی هێزو توانای خۆیدایە)، هەر وەکو هەندێ لە سەرانی وەسفی دەکەن کە (ئەمڕۆ کورد لە

لوتکەیە...)، ئیدی چۆن کورد دەبێت لە کێشەی (مافی چارەی خۆنووسینی خۆی غافلّ بێت) و، خۆی بخافلّێنیّ بە رستەیەکی بیّ ناوەڕۆک وبیّ هێزی وەکو ئەوەی کە لەم دیباجەیەدا هاتووە:
(ان الألتزام بهذا الدستور يحقق للعراق اتحاده الحر شعبا وارضا وسيادة) واتە: (پابەند بوون بەم دەستوورەوە یەکێتی سەربەستانەی گەل وخاک وسەروەریی عێراق دەپارێزێت.)
با هەندیّ گەشبین تر بین و لەگەلّ ئەو سەرکردەو ئەو پسپۆڕو رۆشنبیرانە بین کە جاڕ بۆ ئەو رستەیە ئەدەن، گوایە ئەمەیە پرنسیپی (مافی چارەی خۆنووسین)و ئەمەیە گەرەنتی و هیوا لە (کۆماری العراق)ی ئاوات و ئاشتی، ئەلّێین گریمان وابێت، باشە ئەمانە ئەو راستییە نابینن کە:
١- ئەم رستەیە لە دیباجەکەدا هاتووەو، دیباجەکەش مولزەم نییە، واتە ماددەیەک، یان بڕگەیەکی دەستوورەکە نییە. واتە ئەو دیباجەیە لە سەرەوە تاکو دوا وشەی قسەیەو، قسەش ناچێتە گیرفانی کەسەوە.
٢- هەر لە سەرۆکی لیژنەی داڕشتنی ئەم رەشنووسەوە تاکو زۆربەی زۆری ئەندامانی و بە تەحدید ئەندامانی لیستی هاوپەیمانی عێراقی کە بە لیستی (شیعە) ناسراون و، زۆرینەی کۆمەلّەی نیشتمانیی بوون و ئێستاش زۆرینەی (ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری العراق)ن، لە زۆر کۆڕ و کۆبوونەوەو چاوپێکەوتن دووپات و جەخت لەسەر ئەوە دەکەن: کە ئەم (دیباجە)یە مولزەم نییە، واتە ماددەیەک لە ماددەکانی ئەم دەستوورە نییە.
یەکەم: ئەگەر وا نییە، بۆ لایەنی کوردستانی لە کۆبوونەوە حاسیمەکانی خالّەکانی ئەم دەستوورە، یان لە لیژنەی دەستوور، یان کۆمەلّەی نیشتمانی ئەوساو، ئەنجومەنی نوێنەرانی ئێستای العراق، دیباجەکەیان نەکرد بە ماددەیەک لە ماددەکانی دەستوور.
سەیر لەوەدایە هێشتا هەنە سوورن لەسەر ئەو رستەیە وەکو پرنسیپ و (مافی چارەی خۆنووسین)و، لەم بارەیەوە دەگەڕێمەوە بۆ (پرۆژەی دەستووری هەرێمی کوردستان ـ عێراق) لە بەشی (یاداشتی روونکردنەوە)و لە بەندی(حەوتەم)یدا هاتووە دەلّێت: (ئەو کەسەی زانیاری هەبێت بە باکگراوەندی نووسینەوەو داڕشتنی ئەم رستەیەوە، دەزانێت ئەمە وەک

یەکلاکردنەوەیەکی مامناوەندی هاتووە بۆ داواکاریی سەرکردایەتی سیاسی لە کوردستان، سەبارەت بە دانپێدانان بە بنەمای مافی گەلی کوردستان لە چارەی خۆنووسیندا لەدەقی دەستووردا بێت، بەڵام گفتوگۆ درێژخایەنەکان یەکلاکردنەوەیەکی مامناوەندیی لێکەوتەوە، کە دەقەکە بخرێتە ناو دیباجەکە...). ئەگەر وایە کوا ئەو دەقە(مافی چارەی خۆنووسین) هەتاکو لە دیباجەکەشدا بە نەس نەهاتووە..!

بۆ پاساودانەوەی ئەم پاشگەزبوونەوەیەو پەراوێز کردنی پرنسیپی (مافی چارەی خۆنووسینیی گەلی کوردستان و تەسبیت کردنی لەدەستووری هەمیشەیی)، لەلاپەڕە(٧٣) لە (یاداشتی روونکردنەوە)کەدا هاتووە: (ئاخنینی دەقی ماددەی هەشتەم بەم شێوەیەی باسکرا، گونجاوە لە گەڵ حوکمی بڕگەی دوایی لە دیباجەی دەستووری فیدراڵیدا کە جەماوەری یاساناسانی دەستووری بە بەشێک لە دەستووری دادەنێن...).

هەر وەکو لە سەرەتاوە وتمان پرنسیپی «مافی چارەی خۆنووسینی گەلی کوردستان» خاڵێکی خیلاف بوو لە نێوان لایەنی زۆرینەی عەرەبی عێراقی باڵادەست و ددانیان بەو مافەدا نەناوە، چ لە دەقی دەستوورو چ لە دیباجەکەی لەو (یاداشتەدا ئەم راستییە دووپات دەبێتەوەو ئاماژەیان بۆ کردووە).

دووەم: هەتاکو پاش سازشکردنی لایەنی کوردی بە قایل بوون بەو رستە سەقەتە، دیسان لایەنی عەرەبی قایل نەبوونە ئەو دەقە بە ماددەیەکی دەستووری تەسبیت بکرێت.

سێهەم: خودی ئەو دەقە تەعبیر لە ماهیەت و ناوەڕۆکی پرنسیپی مافی چارەی خۆنووسین ناکات، نە راستەوخۆ و، نە ناراستەوخۆ و بەتەحدیدیش رستەیەکی گشتییەو تایبەت نییە بەکورد.

چوارهەم: لە «یاداشتی» ئاماژە پێکراودا هاتووەو دەڵێت گوایە: «بڕگەی دوایی لە دیباجەی دەستووری فیدراڵیدا جەماوەری یاساناسانی دەستووری بە بەشێک لە دەستووری دادەنێن...». دەقە عەرەبیەکەی کە دەقی موعتەمەدی پەرلەمانی کوردستانە زاراوەی (جمهور الفقهاء)ی تەسبیت کردووە. لێرەش (جەماوەری یاساناسان = جمهور الفقهاء) بە (رەهایی = مطلق) هاتووە،

دوور نییه دروستتر بێت بنوسرێت (جمهور من الفقهاء)و، سڕینەوەی «من» وەکو «حرف جر» لەم رستەیەدا زۆر دەلالەتی هەیە، یەک لەوانە چەسپاندنی بۆچونێکی رەها لەسەر حیساب کردنی (دیباجە) وەکو ماددەیەکی مولزەم لەلایەن گشت (فقهاء القانون الدستوری)یەوە، ئەمە جۆرە فێڵێکە هەر چ نەبێت لەخەڵکی خۆمانی دەکەن، چونکە هەموو یاساناسانی یاسای دەستووری لەسەر ئەم رایە نین، هەروەها پەنابردن بۆ ئەم پاساوە ئەوە دەگەیەنێت لە ناو یاساناسان و بەتەحدیدیش لە ناو فوقەهائی یاساناسانی دەستوور هەنە دیباجە وەکو ماددەیەکی دەستووری لە قەڵەم نادەن و، تەفسیری رەهایی هەندێ جار لە دەقی (قورئان)یش بەدی ناکرێت، لەهەردوو حاڵەتدا زاراوەی (مافی چارەی خۆنووسینی) کورد نە لە ماددەکانی دەستوورو، نە لە دیباجەکەیش تەسبیت نەکراوە.

٣- هەتاکو ئەگەر واش بێت، واتە ئەگەر دیباجەکە مولزەم بێت وەکو ماددەیەکی ئەم دەستوورە، دەبوو خودی دیباجەکە بە ماددەیەکی دەستووری لە خودی دەستووردا تەسبیت بکرایە، هەر وەکو لە یاسای (بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە) دا هاتبوو، بڕگەی «ب » لە ماددەی یەکەمی کە دەڵێت: (پێشەکی« دیباجە»ی ئەم یاسایە بەشێکی دانەبڕاوە لەیاساکە.)، هەتاکو لەگەڵ ئەمەیش، دووپاتی دەکەینەوە دیسان ئەو رستە (سەقەتە) کە بانگهێشی بۆ دەکرێت گوایە ئەمەیە(بەندی مافی چارەی خۆنووسین) ئەو مانایە ناگرێتەوە.
لەگەڵ ئەمانە هەر هەموو هێشتا لایەنێکی بەرچاوی عەرەبی عێراق بەوەش دڵیان ئاو ناخواتەوەو سەرقاڵی قووڵ کردنەوەی پێناسەو ناسنامەی عروبەتی (العراق)ن و لە هەوڵی لاوازو خاو کردنەوەو سڕینەوەی هەر ماددەو بڕگەیەکی دەستوورن، ئەگەر هاتوو ناتەبا بێت لەگەڵ ئەو پرنسیپەو مەرکەزیەتی دەسەلات. دیسان ئەیلێینەوە ئەرێ گەلۆ چۆن دەبێت پرنسیپی مافی چارەی خۆنوسین و تەسبیت کردنی بە ماددەیەکی دەستووری پرسێکی حەیاتی نەبێت بۆ کورد..!

پێش ئەوەی بێینە سەر بابەتی(فیدراڵیەت) لەم دەستوورە بە باشمان زانی لێرەداو بە شێوەیەکی کورت و گشتی باسی زاراوەی (فیدراڵیەت) بکەین بە ئەندازەی ئەوەی پەیوەندی بە بابەتەکەمانەوە هەبێت و، لەم بارەیشەوە زیاتر پشت دەبەستین بە کورتە باسێکی تایبەتی دۆستی دێرینی کورد مامۆستاو پسپۆڕ لە میانی یاساو ئەندامی (ئەنجومەنی نوێنەرانی العراق)ی پێشوو لەسەر لیستی هاوپەیمانی کوردستان، بەڕێز (دکتور منذر الفضل)، کە بە کوردیەکەی دەڵێ:

## - پێناسەی فیدراڵیزم Federalism:

«فیدراڵیزم واتە بەشداری کردن لە دەسەلاتی سیاسی و بەرپرسیاریەتی لە دابەش کردنی سامان بە شێوەیەکی دادپەروەرانە، کە لەگەڵ پێداویستییەکانی خەڵک بگونجێت و ئەوەشی تێدا لەبەرچاو بگیرێ؛ کە تا چەند زیان بەو ناوچە زیان لێکەوتوو، یان بێبەش کراوەکان کەوتووە، ئەمەش هەمووی بە پێی دەستوور، کە لە نێوان هەردوو هەرێم، یان هەرێمەکان رێکدەخرێت و، لە ئەنجامیدا حکومەتێکی فیدراڵی ناوەند دادەمەزرێت، کە تەعبیر بێت لە ئەو یەکگرتنە ئارەزوومەندانەیەی خەڵکی هەرێمەکان و پاراستنی مافەکانیان، بە مافی چارەنووسی هەر یەک لەو میللەتانەشی کە لە سنووری ئەو هەرێمەدا ئەژین و ئەو هەرێمانە پێک دێنن.»

فیدراڵیەت دابەش کردنی خاک و گەل و سەروەری دەوڵەت نییە، بەڵکو یەکگرتنێکی ئارەزوومەندانەیە لەسەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەش، بۆ بەرفراوان کردنی بەشداربوون لە دروست کردنی بڕیار بە پێی دامەزراوە دەستوورییەکان کە لە ژێر سایەی دەستوورێکی هەمیشەیی بنیات دەنرێت و لەسەر بنەمای هاوێر کردنی دەسەلات و، بنەما دیموکراتییەکان و رێزگرتنی مافەکانی مرۆڤ لەو شوێنانەدا کە ئەو هەرێمانە پێک دێنن و بە ئارەزوو یەک دەگرن و، سنوورو، دەسەلاتەکانی فیدراڵی و، دەسەلاتەکانی هەرێم، یان هەرێمەکان، لە دەستووری فیدراڵیدا دیاری دەکرێن. هەروەها فیدراڵیەت بەو مانایە شێوازێکە بۆ بەشداری کردنی هەمووان، بە تایبەتیش لە ولاتێکی فرە نەتەوەو فرە زمان و ئایین و ئاینزاو، هزری رەگەزی و تایفەگەری و حزبایەتی وەکو عێراق.

هۆکاری سەرهەڵدانی بیرۆکەی فیدراڵیەت دەگەڕێتەوە بۆ بایەخی بەهای دیموکراتییەت و رێزگرتنی مافی نەتەوەکان و مافەکانی مرۆڤ و شکستی دەسەلات

و رژێمە دکتاتۆرو تاکڕەوەکان و گۆڕانکارییە ئابووری و سیاسییە نوێکان و چەمکی ڕێژەیی سەروەری..
دەوڵەتی فیدراڵی دەوڵەتێکی یەکگرتووە (State Federal)و لە چەندین یەکەی خاوەن خودمختاری (حکم ذاتی) بەپێی لامەرکەزییەتی سیاسی و کارگێڕی پێکدەهێنرێ، بەڵام کەسایەتی و قەوارەی نێودەوڵەتی سەربەخۆی نییە.
هەر چۆن لە سنووری یەک دەوڵەتی سەربەخۆ و خاوەن سەروەری و کەسایەتی نێودەوڵەتی دوو هەرێم، یان زیاتر، پێک دێن و، لە دەوڵەتێکی (سادە)وە دەبێتە دەوڵەتێکی (پێکهاتە). هەندێ جاریش دەوڵەتی فیدراڵی لە یەکگرتنی چەند دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە یەک دەوڵەتدا بە جۆرێ هەر یەک لەو دەوڵەتانەی دەوڵەتی فیدراڵی لێ پێک دێت کەسایەتی نێودەوڵەتی خۆی لەدەست دەدات و، یەک دەوڵەتی خاوەن یەک کەسایەتی یاسایی پێک دێت.
بە پێی ئەم پێناسەیە، واتە پێناسەی (فیدراڵیەت)، مەرج و خەسڵەتەکانی دەوڵەتی فیدراڵی ئەمانەن:

١. پێشەکی دەبێت کیانێک، یان دوو کیان، یان چەند کیانێک هەبێت. بەواتەیەکی تر دەوڵەتێکی (سادە)..یان چەند دەوڵەتێکی سادە، مەرجێکی سەرەکییە بۆ پێکهاتنی دەوڵەتێکی (فیدراڵی).
٢. بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی (پێکهاتە) هۆکارێک، یان چەند هۆکارێکی: ڕەگەزی، ئایینی، ئاینزا، زمان، ئابووری، کلتووری، سیاسی، ئیستراتیجی...هتد پێویستە..
٣. ئەم کیانە، یان ئەم کیانانە لە نێو خۆیاندا (چی بێت هۆ و هۆکار)، بە ئارەزووی خۆیان، بڕیاری پێکەوە ژیان ئەدەن لە چوارچێوەی یەک یەکەدا، واتە یەک دەوڵەتی یەکگرتوو (فیدراڵی)«٢١».
٤. دەسەڵاتی ئەم دەوڵەتە دابەشکراوە لە نێوان (ناوەندی فیدراڵ)و هەرێمەکان. واتە دەبێت دەوڵەتی فیدراڵ لە دوو کیان کەمتر نەبێت، واتە لە دوو هەرێم کەمتر نەبێت. (دکتور منذر الفضل) لەم بارەیەوە نووسیویەتی و دەڵێت: الفیدرالیة (تتکون من اقلیمین او اکثر یتحدان بالاختیار وتتحدد

«٢١» بڕوانە کتێبی (ئایا فیدراڵیەت وەک(خیار)ێکی سیاسی لەعێراق پیادە دەکرێت...؟) ساڵی ٢٠٠٥ چاپی یەکەم ـ لاپەڕە (٢٧-٣٥)ـ.

الاختصاصات الاتحادية و سلطات الاقاليم في الدستور الاتحادي...).
واته(دەولەتێکی فیدراڵی لەدوو هەرێم یان زیاتر بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانە پێک دێت و دەسەلاتەکانی فیدراڵ و هەرێمەکان لە دەستووردا تەسبیت دەکرێت..).

٥. هەرچۆن دەولەتی فیدراڵ سنووری نیشتمانی و مێژوویی و جوگرافی دیاری کراوی خۆی هەیەو، لە دەستووری فیدراڵدا تەسبیت کراوە، دەبێت بە هەمان شێوەو بە هەمان شێواز سنووری هەرێمەکانیش دیاری کراو بێت..
٦. ئەم پێکهاتنە لە نێوان هەرێمەکان دەبێت بە ئازادی و ئارەزوومەندانە بێت.
٧. لە دەستووری دەولەتی فیدراڵدا ئەرک و مافەکان بە دروستی و روونی دیاری بکرێت.
٨. هەر یەک لە هەرێمەکان دەبێ خاوەن دەسەلات و خۆیەتی سەروەت و سامان و ئاسایشی خۆی بێت و دەستوور سنووری دەسەلاتەکان و میکانیزمی پەیوەندی و دابەش کردنی داهات و خۆیەتی سەروەت و سامان.....هتد، دیاری دەکات.

بە پێی ئەم پێناسەیەو، واقیعی دەولەتەکانی فیدراڵ لە جیهاندا دەکرێت بپرسین:
١. ئەوە لەم دەستوورەدا ددان بە(نیوەی) کوردستانی باشووردا نراوە (واتە ئەوەی کە کەمترە لەو (٣) پارێزگایەی کە تاکو (٢٠٠٣/٣/١٩) لە ژێر دەسەلاتی هەردوو ئیدارەی پارتی و یەکێتی دابوون، یەک تەرەفی ئەم هاوکێشە بێت)، باشە هەرێمی دووهەم کێیە کە کۆماری (العراق)ی فیدراڵی لێ پێکدەهێنرێ..؟!
٢. ئەم دەستوورە، عێراقی بە (کۆماری «العراق») تەسبیت کردووەو، (نیزامەکەی نیزامێکی یەکگرتووە)، پسپۆڕان و رۆشنبیران و سیاسەتمەداران و خەڵکی هۆشیار باش ئەزانن ئەم دوو زاراوە چۆن و چەند لە یەک جودان و، دەبێت ناوی کۆماری العراق و ناوەڕۆکی دەولەتی فیدراڵ جووت بێت، ئەگەر چی هەندێ گۆڕین خرایە سەر ئەو پێناسەیەو، هێشتا مەترسی پاشگەزبوون لەسەر ئەم گۆڕانکاریەش لەئارادایە، بەلام چۆن (عێراقی فیدراڵ) لەگەڵ کۆماری (العراق) وەکو یەک دەولەتی (عەرەبی) پاساو ئەدرێتەوە لەگەڵ فیدراڵیەت کە گوایە لەسەر ئەساسی (جوگرافی و مێژوویی) تەسبیت بووەو بەراورد دەکرێت؟....

٣. سنووری مێژوویی و جوگرافی هەرێمی کوردستان لەم دەستوورەدا یەکلایی نەکراوتەوەو، لەوەش ترسناکتر ئەوەیە لە سنووری زیاتر لەنیوەی کوردستانی باشووری (عێراق)ـە کە (٤) جار لەپانتایی ولاتێکی وەکو (لبنان) زیاترەو هێشتا نەخراونەتەوە سەر هەرێمی کوردستان، کەچی سەرکردایەتی سیاسی کورد، بە ئارەزووی خۆی و، بەدەقێکی دەستووری، ددانی بەوەدا ناوە کە ئەو ناوچانە کێشەیان لە سەرەو ناوچەی (خیلاف)ن لە نێوان کوردو دەسەلاتی ناوەندی زۆرینەی عەرەب، (المناطق المتنازع علیها)، بەوەش رانەوەستان فەرزیش کرا بەسەر خەلکی کوردستاندا، کە بە ریفراندۆم پەسندی بکەن و، هەندێ لە سەرانیشی جەختیان دەکرد لەکۆڕو کۆبوونەوەکانیاندا کە ئەوانەی دەنگ بەو دەستووره نەدەن بە (بەلی)، خائن و تیرۆریستن، بێ ئەوەی هەندێ بیر بکەنەوە، کەدەنگ دان بە «لا»و «نعم» خودی ئەو دەستووره بۆ گشت هاوولاتیانی العراقی زامن کردووەو مافی خۆیانە.
باشە ئەگەر دەنگدان بە(لا = نەخێر) بۆ کورد تاوان بێت، بۆ ئەوانە رازی بوون بە تەسبیت کردنی مافی(لا) لە دەستوور..؟!
بە هەر حالێ چ بێت هۆ و هۆکار، پێشەکییەکی مێژووییەو، کورد بە خۆی، بە دەقی دەستووری و بە دەنگدانی میللی بە خۆی مودەعی لەسەر (٥١ ٪)ی خاکەکەی و (٤٨ ٪)ی هاوولاتیانی دروست کردو ددانی پێدا ناو، بۆ یەک پارێزگایش هەیە کیانی فیدرالیەت راگەیەنێت کە دوور نییە ئەمەش بۆ کەرکوک و هەندێ ناوچەی تر لە کوردستان بێت زیاتر لەوەی بۆ ناوەڕاست و خواروی عێراق بێت. ئەلێین لە واقیعێکی وەها کوا عێراقی (فیدرالێ)؟..
٤. لەدابەش کردنی دەسەلات لە نێوان (هەرێم)وَکەکەمان (ئەوەی ددانی پێدا نراوه) لەم دەستوورەداو، حکومەتی ناوەندی العراق، هەر وەکو ئەو «برا بەشەیە» کە لە هۆنراوەیەکی شاعیری گەورەی کورد خوالێخۆشبوو (قانیع)دا هاتووه.. هەر هەمان شت سەبارەت بە سەروەت و سامانی کوردستان، کە لە بەشێکی تری ئەم باسەماندا باسی دەکەین...
بۆیە خۆ ئامادەکردن بۆ پێداچوونەوە بەم بابەتانە لە لیژنەی پێداچوونەوە بە دەستووری هەمیشەیی العراق و، ساغکردنەوەیان بەو شێوەیەی کە بگونجێت لەگەل کیانێکی عێراقی یەکگرتوو (فیدرالێ)، واتە دەولەتێکی (پێکهاتە -

مرکب) لەسەر بنەمای زانستی و ئەزموونی کیانە فیدراڵەکانی سەردەم، ئەرکێکی نیشتمانی لایەنی کوردستانییە لەو لیژنەیە...
ئەم ساغکردنەوە و تەسبیت کردنی پرنسیپ و بنەمایانە سەبارەت بەو مافانە بۆ ئێمەی کورد کێشەیەکەو نابێت پشتگوێ بخرێت و لەپێناوی سیاسەتی رۆژدا مردار بکرێتەوە، بەتایبەتی کە هەڵوێستی زۆرینەی لایەنەکانی سیاسی و «ئەنجومەنی نوێنەران»ی کۆماری العراق لەمەڕ فیدراڵیەت لەپێش دانیشتنی رۆژی ١١/ ٢٠٠٦/١٠یاندا بە زەقی بەدەرکەوت. زۆرینەی ئەمانە ئەگەر چی پرنسیپی فیدراڵیەتیان قەبووڵە هەر وەکو لەدەستووردا هاتووە، بەڵام لە شێوەو شێوازو سنوورو دەسەڵاتی یەکە فیدراڵیەتەکان دیدوبۆچوون و هەڵوێستی جودایان هەیە، بەتایبەتی لەمەڕ ناوچە دابڕاوەکانمان لەکوردستان...

**یەکەم:**
دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق، هەرێمی کوردستانی عێراقی پێناسە کردووە بە کەمتر لە (٣) پارێزگا، هەر وەکو لە ماددەی (١٤٣)دا هاتووەو دەڵێت :
**دەقە کوردیەکەی:**
(ماددەی (١٤٣) : یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراقی بۆ قۆناغی گواستنەوەو پاشکۆیەکەی لە کاتی دەست بەکار بوونی حکومەتی نوێدا هەڵدەوەشێتەوە، جگە لەوەی لە بڕگە (أ)ی ماددەی(٥٣)و ماددەی (٥٨)یدا هاتووە.)«٢٢».
بڕگە (أ) ی ماددەی (٥٣)ی یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە دەڵێت:
**دەقە کوردیەکەی:**
ماددەی ٥٣-(أ): (ئیعتراف بە حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکرێ کە حکومەتی فەرمی ئەو خاکانەیە کە تا (١٩ی/ ئاداری/ ٢٠٠٣) پارێزگاکانی دهۆک و ئەربیل و سلێمانی و کەرکوک و دیالەو نەینەوا لەلایەن ئەو حکومەتەوە بەڕێوە دەبرا. دەستەواژەی حکومەتی هەرێمی کوردستان کە لەم یاسایەدا هاتووە واتە ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان و ئەنجومەنی وەزیرانی کوردستان و دەسەڵاتی دادوەری هەرێمی کوردستان.
**دەقە عەرەبییەکەی دەڵێ:**
المادة الثالثة والخمسون:
(أ) ـ يعترف بحكومة اقليم كردستان بصفتها الحكومة الرسمية للاراضي التي كانت تدار من قبل الحكومة المذكورة في ١٩ آذار ٢٠٠٣ الواقعة في محافظات دهوك واربيل والسليمانية وكركوك وديالى ونينوى. ان مصطلح "حكومة اقليم كردستان" الوارد في هذا القانون يعني المجلس الوطني الكردستاني. ومجلس وزراء كردستان والسلطة القضائية في اقليم كردستان.

ماددەی (٥٨)ی (یاسایی ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە)یش، کە بە بێ جێبەجێ کردن، تەرحیل کرا بۆ دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق و، بووە ماددەی (١٤٠)و، تەرخان کراوە بۆ ناوچە تەعریبکراوەکان و، ئەو ناوچانەی بە

**«٢٢» (بروانە: دستور جمهوريه العراق (دستورنا سورنا). جمهوريه العراق - مجلس الوزراء).**

پێی مادده(٥٨) بڕگەی(ثانیا)، بە ناوچەی (المناطق المتنازع علیها) پێناسە و تەسبیت کراون.
واتە (خیلاف لە نێوان زۆرینەی ڕەهای (مطلق)ی عەرەبی العراق و غەیرە کوردو، کەمینەی کوردی، یان کوردستانی) هەیەو، بڕیاری کۆتایی و بنبڕکردنیشی دراوە بە دەستی (زۆرینەی ـ سادە ـ بسیطە ـ)ی (ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری العراق)، کە پێکدێت لە زۆرینەی ڕەهای عەرەبی العراق، بە دەستکاری، یان مانەوەی وەکو خۆی. ئەمەش دەقی ماددەی (١٤٠)ی (دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق)ـە:
**دەقە کوردیەکەی:**
«ماددەی(١٤٠):
«یەکەم ـ دەسەڵاتی جێبەجێ کردن ئەو هەنگاوە پێویستانە دەگرێتە بەر بۆ تەواو کردنی جێبەجێ کردنی پێداویستەکانی ماددەی (٥٨) بە هەموو بڕگەکانیەوە لە یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە.»
«دووەم ـ ئەو بەرپرسیارێتییەی دەکەوێتە ئەستۆی دەسەڵاتی جێبەجێ کردن لە حکومەتی گواستنەوە دا کە لە ماددەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە، دەق نووسکراوەو درێژدەبێتەوەو بەردەوام دەبێت بۆ دەسەڵاتی جێبەجێ کردن کە بە پێی ئەم دەستوورە هەڵبژێردراوە بۆ ئەوەی تەواوی ئەمانە ئەنجام بدەن (ئاسایی کردنەوە، سەرژمێری، کە کۆتایی دێت بە ڕاپرسییەک لە کەرکوک و ئەو ناوچانەی دی کە کێشەیان لە سەرە بۆ دیاری کردنی ویستی هاووڵاتیانی) لە ماوەیەکدا کە لە (سی و یەکی) مانگی کانونی یەکەمی ساڵی دوو هەزار و حەوت تێپەڕنەکات.).»
**دەقە عەرەبییەکەی ١٤٠یش دەڵێ:**
المادة (١٤٠):
أولاً: تتولى السلطة التنفيذية اتخاذ الخطوات اللازمة لاستكمال تنفيذ متطلبات المادة (٥٨) من قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية، بكل فقراتها.
ثانياً: المسؤولية الملقاة على السلطة التنفيذية في الحكومة الانتقالية، والمنصوص عليها في المادة (٥٨) من قانون إدارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية، تمتد وتستمر إلى السلطة التنفيذية المنتخبة بموجب هذا الدستور، على ان تنجز كاملة (التطبيع، الاحصاء، وتنتهي باستفتاء في كركوك والمناطق الاخرى المتنازع

عليها، لتحديد إرادة مواطنيها) في مدة اقصاها الحادي والثلاثون من شهر كانون الاول سنة الفين وسبعة.
دەسەڵاتی جێبەجێ کردنیش کە ئەم ئەرکەی پێ سپێردرابوو لە حکومەتی ئینتیقالی بە پێی ماددەی (٣٥)ی یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە، بریتی بوو لە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی و ئەنجومەنی وەزیران، ئەمەش دەقی ماددەکەیە:

**دەقە کوردیەکەی:**

«ماددەی(٣٥): (دەسەڵاتی راپەڕاندن لە قۆناغی گواستنەوەدا، لەئەنجومەنی سەرۆکایەتی و ئەنجومەنی وەزیران وسەرۆکەکەی پێکدێ».

**دەقە عەرەبییەکەی**

المادة الخامسة والثلاثون:
تتكون السلطة التنفيذية في المرحلة الانتقالية من مجلس الرئاسة ومجلس الوزراء ورئيسه.
ناوەڕۆکی ماددەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەتی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە، نە لە ماوەی حکومەتی کاتی بەڕێز «د.أیاد علاوی» و، نە لە قۆناغی حکومەتی گواستنەوەی بەڕێز «د.ابراهیم الجعفری»، جێبەجێ نەکراو، دواتریش زیاتر ئەو سەرپێچییە دەخرێتە پاڵ (الجعفری) و، ئێستایش (المالکی)یە...!
بە بەراورد کردن لەگەڵ قۆناغی پێش دامەزراندنی حکومەتی هەمیشەیی العراق، لیستی هاوپەیمانی کوردستان هەنگاوێکی بەرەو پێشەوەی ناو، لە رێککەوتننامەکەیاندا لەگەڵ لیستی ئیئتلافی شیعەدا توانرا لە بەرنامەی کاری حکومەتی بەڕێز «د.نوری المالکی» و، لە بەندی (٢٢)یدا خشتەیەکی زەمەنی بۆ جێبەجێ کردنی ماددە«١٤٠» تەسبیت بکرێت بەم شێوەیەی خوارەوە:

٢٢. حکومەت پابەند دەبێ بەجێبەجێ کردنی ماددەی «١٤٠»ی دەستوور، کە پشت بە ماددە «٥٨» یاسای ئیدارەی دەوڵەت دەبەستێت و، کە خۆی لە سێ قۆناغدا دەبینێتەوە: ئاسایی کردنەوەو ئامارو راپرسی لە کەرکوک و ناوچەکانی تر کە نیزاعیان لە سەرە، حکومەت، هەر لە دوای دامەزراندنی، هەڵدەسێ بە جێبەجێ کردنی هەنگاوی پێویست بۆ ئاسایی کردنەوە، وەک گەڕانەوەی قەزاو ناحیەکان بۆ سەر ئیدارەی کەرکوک کە لەبنەڕەتدا سەر بەکەرکوک بوونە، ئەم

قـۆناغـه له ۲۰۰۷/۳/۲۹کـۆتايى پێـديێت، قـۆناغى ئامـاريش له ۲۰۰۷/۷/۳۱دهست پێـدهكـات و دوا قـۆناغـيش كـه راپرسـيـه له ۲۰۰۷/۱۱/۱۵ كۆتايى پێديێت.

**دهقه عهرهبييهكهى**

۲۲. تلتزم الحكومة بتنفيذ المادة ١٤٠ من الدستور والمعتمدة على المادة ٥٨ من قانون ادارة الدولة بكل فقراتها والمتمثلة بتحديد ثلاث مراحل:التطبيع والاحصاء والاستفتاء في كركوك وغيرها من المناطق المتنازع عليها وتبدأ الحكومة اثر تشكيلها في اتخاذ الخطوات اللازمة لاجراءات التطبيع بما فيها اعادة الاقضية والنواحي التابعة لكركوك بالاصل وتنتهي هذه المرحلة في ۲۰۰۷/۳/۲۹ حيث تبدأ مرحلة الاحصاء فيها من ۲۰۰۷/۷/۳۱ وتتم المرحلة الاخيرة وهي الاستفتاء في ۲۰۰۷/۱۱/۱۵.

ديارى كردنى خشتهيهكى زهمهنى وا روون و تۆكمه جێگاى دهستخۆشى كردنه له شاندى كوردو، كاتى خۆشى نهبوونى ئهم جۆره خشتهيه يهک له كهلێنهكان و كهم و كـورتى ياسـاى ئيـدارهى دهولهت و خـودى مـاددهى(٥٨)يش بوو. بهش به حـالى خـۆمـان بهزنجـيـره وتارێـک لهرۆژنامـهى «خـهبات»و چهند سـايـتێـكى ئهنتـهرنێت ئاماژهمان بۆ كردو، نهبوونى ئهو خشتهيه خالێک بوو لهخالهكانى كهم و كورتى ئهو ماددهيه. لهگهل ئهوهش ديسان دهستخۆشى له ليستى هاوپهيمانى كوردستان دهكهين بۆ تهسبيت كردنى ئهو خشتهيه، بهلام ناكرێت جارێكى تريش ههلوهستهيهک نهكهين لهسهر خودى ناوهرۆكى ماددهى (٥٨)، كه پڕه له كهمين و دهق و زاراوهى ياسايى تهماوى به گومان و فره تهفسير ههلگر، كه لهو زنجيره وتارانهى خۆماندا، كاتى خۆى، به دوورو درێژى شيمانكردهوهو باسمان كردو پوختهكهيشيمان لهدوتوێى كتێبێكماندا بهناونيشانى (ئايا فيدراليهت وهک (خيار)ێكى سياسى له عێراق پياده دهكرێت...؟)تهسبيت كرد..

لێرهدا به پێويستى دهزانم ئاماژه به چهند خالێک بكهم سهبارهت بهم كێشهيه، به ئومێدى ئهوهى شاندى كورد له ليژنهى پێداچوونهوه بهدهستوورى ههميشهى كۆمارى العراق، ههولى چاكسازى تر بدات و خالى حهسم چارهسهر بكات:

١. کێشـەی تەعریب بەپێی ماددەی (٥٨) لە کێشەیەکی سیاسییـەوە کراوە بە کێشەیەکی یاسایی و زیاتر لە نیوەی کوردستان بووەتە (المناطق المتنازع علیها بە کەرکوکیشەوە) واتە ماف بە تەعریبچییەکان دراوە وەکو کورد تەرەفێک بێت لە داکۆکی کردن لە شتێک کە لە ئەسڵدا نەک هەر هینی ئەوان نییـە، بەڵکو زەوتیان کردووە..!

٢. قۆناغی تەعریب، لەم ماددەیەدا، لە پاش ساڵی (١٩٦٨)ـەوە تەحدید کراوە. واتە تەعریبچییەکانی پاش ساڵانی ١٩٣٠. و تەوژمی ساڵانی پاش تەمووزی ١٩٥٨ و پاش ساڵانی (١٩٦١- ١٩٦٧) ولاوە نراوەو دوور نییـە ببێـتـە ئەمری واقیع، لە پاش رزگاری العراق (٢٠٠٣)یش جارێ بۆ زاراوەیەکی نوێ دەدرێت بە ناوی عەرەبی (رەسەن) لە وەصف کردنی ئەو تەعریبچییانەو، خەریکە لەئەدبیاتی سیاسی کوردو لەمێشکی خەڵکی کوردستان ئەیچەسپێنن و، هەندێ جاریش لێرەو لەوێ بەنووسین و بە قسەیش هەوڵی تەصریف کردنی مانەوەی تەعریبچییەکانی پاش ساڵی (١٩٦٨) ئەدرێت بە پاساوی کەمینە و زۆرینە، یان ئەمانە لەسەر خاکی «کوردستان» ئەژین و، هەندێ لە بەرپرسانی کورد لەوەش (سەخی)ترن وا ئەمڕۆ هەر لەبەر (تقادم الزمن)ی تەعریب و (کوردە ناموسەو دەست بە کڵاوی خۆماندا بگرین)و، بێ هیچ هەستێکی نەتەوایەتی و نیشتمانپەروەریی و، دوور لە داب و نەریتی کوردایەتی و، دەرئەنجامی سیاسی و یاسایی و، لەراگەیاندنەکانی کوردستاندا رادەگەیەنن کە ئامادەن دەست لە زیاتر لە نیوەی (مووسڵ)هەڵگرن و، پێشکەشی تەعریبچییەکانی بکەن و، یان داوای راپرسین دەکەن لە مووسڵ، لە کاتێکدا لەدوا هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی العراق، لیستی هاوپەیمانی کوردستان لە پارێزگای (الموصل)و لە کۆی (١٩) کورسی تەنها (٤) کورسیان وەدەست هێنا، لەم قۆناغە کە (کورد لە لوتکەیە.. !!)، بە قەزای مەخموریشەوە کە قەزایەکەی پارێزگای هەولێرەو ساڵی ١٩٩٧ خرابووە سەر (الموصل) و، تاکو ئێستایش هەر سەر بە (الموصل)ـە.

ئەوەی سەرنجراکێش بوو تاکو پێش ئەو هەڵبژاردنە، ئەوە بوو کە هەندێ لە لێپرسراوانی کوردستان جەختیان لەسەر کوردستانیەتی مووسڵ دەکرد، گوایە بۆ کورد مەحسوومەو ئەوندە باس نەکرێت وەکو کەرکوک. واتە مووسڵ لە

(گیرفانه)و، گوایه هیچ بڕیارو ئیجرائاتێک ناکرێت له پارێزگای مووسڵ بێ کوردو، کورد لەوێ خاوەن دەسەڵات و بڕیارە.!

٣. ئەو خشتە زەمەنیە، نەخشەی ڕێگای چارەسەرکردنی نیوەی کێشەی کەرکوک و گشت ناوچەکانی «المتنازع علیها»یە، وەلێ نیوە دروست و «حاسیمە»کەی هەروا بەکراوەیی هێڵراوەتەوە، چونکە هێشتا چارەنووس و بنبڕ کردنی (تەعریب)و گەڕانەوەی ئەو ناوچانە بۆ باوەشی هەرێمی کوردستان بەندە بە بڕیاری ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری العراق و، بڕیارەکەیشیان بە زۆرینەی سادەیە(الاکثریە البسیطە) وەردەگیرێت و، هەر وەکو لای هەموو مەعلوومە، دەسەڵات و بڕیار لەو ئەنجومەنە لای زۆرینەی عەرەبە«٢٣».

ئەگەر چی لەکاتی خۆیدا بەڕێزانێکی زۆر شتی گرنگ و باشیان لەمەڕ ناوەڕۆک قۆناغەکانی جێبەجێ کردنی ماددەی (٥٨) باس کردبوو، بەندەیش یەک لەوانە بوو کە هەندێ بە دوور درێژیی لەم بارەیەوە بەشداری کرد.

**دەقی ماددەی ٥٨- ب بە بەعەرەبی**

المادة٥٨: (ب) ـ لقد تلاعب النظام السابق ایضا بالحدود الاداریة وغیرها بغیة تحقیق اهداف سیاسیة. علی الرئاسة والحکومة العراقیة الانتقالیة تقدیم التوصیات الی الجمعیة الوطنیة وذلك لمعالجة تلك التغییرات غیر العادلة. وفي حالة عدم تمکن الرئاسة الموافقة بالاجماع علی مجموعة من التوصیات، فعلی مجلس الرئاسة القیام بتعیین محکم محاید وبالاجماع لغرض دراسة الموضوع وتقدیم التوصیات. وفي حالة عدم قدرة مجلس الرئاسة علی الموافقة علی محکم، فعلی مجلس الرئاسة ان تطلب من الامین العام للامم المتحدة تعیین شخصیة دولیة مرموقة للقیام بالتحکیم المطلوب.

جگە لە گیروگرفتی هەندێ زاراوەی نێو ماددەی (٥٨) وەکو (المقیمین)، (المرحلین)، (المهاجرین)، (الغرباء.....هتد)، کە دوور نییە ببنە مایەی مشتومڕو تەفسیراتی یاسایی جیا جیاو، ئەم چەند خاڵەی خوارەوەیش دەخەینەڕوو:

---

**«٢٣» بڕوانە بڕگەی (ب)ی ماددەی (٥٨). بۆ زیاتر زانیاری بڕوانە کتێبی (ئایا فیدراڵیەت وەک (خیار)ێکی سیاسی لە عێراق پیادە دەکرێت...؟) لاپەرە (١٤٦).**

١. به پێی بڕگه (ب)ی ئەم ماددەیە (تسویه = یەکلاکردنەوەی) کۆتایی سەبارەت به سنووره ئیدارییەکانی ناوچه تەعریبکراوەکانمان له ڕێگای ڕاسپاردەکانی (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی و ئەنجومەنی وەزیرانی کۆماری العراق)ـەوه، دەبێت بەرز بکرێتەوه بۆ ئەنجومەنی نوێنەرانی العراق، پاش ئەوەی هەر یەک به جوداو پێکەوه بەکۆی دەنگ ڕێک ئەکەون لەسەری، ئەگەر پێک نەهاتن لەسەر ڕاسپاردەکان، بەکۆی دەنگ ئەوه پێویستە (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی)، بەکۆی دەنگ، ناوبژیوانێک دامەزرێنی بۆ دیراسەت کردنی کێشەکەو پێشکەش کردنی ڕاسپاردەکان، خۆ ئەگەر نەیانتوانی لەسەر ناوبژیوانێک پێک بێن، ئەوه پێویستە لەسەر (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی) داوا لەئەمینداری گشتی نەتەوه یەکگرتووەکان بکات، که کەسایەتییەکی نێودەوڵەتی ناسراوو بەڕێز بۆ ئەو دادوەریه دامەزرێنی. لێرەدا ڕووبەڕووی دوو کێشەی گرنگ دەبینەوه:

أ. بڕیاری ئەنجومەنی سەرۆکایەتی و ئەنجومەنی وەزیران سەبارەت به (ڕاسپارده)کان به ئیجماعی دەنگ دەبێت. هەر یەک له (٣) ئەندامەکەی (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی ـ که یەکیان کوردەو یەک عەرەبی شیعەو ئەوەیتریان عەرەبی سوونەیە)و (ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران)یش، مافی (ڤیتۆ) یان هەیە. واته ئەگەر هاتوو یەک له ئەندامانی (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی) یان (حکومەت) دژ بن ئەوه ڕاسپاردەکان ڕادەگیرێت .

ب. هەر هەمان شت سەبارەت به دامەزراندنی ناوبژیوان دەبێت هەر (٣) ئەندامی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی پەسندی بکەن واته بەکۆی دەنگ دەبێت.

٢. هەتاکو ئەگەر هاتوو لەسەر ڕاسپاردەیش پێکهاتن، یان لەسەر ناوبژیوان، ئەوه ڕاسپاردەکان ئەدرێت بەئەنجومەنی نوێنەران، ئیتر مەرج نییه ئەو ڕاسپاردانه وەکو خۆی مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت، یان هەر جێبەجێ بکرێن، چونکه (ڕاسپاردەیه = توصیات)و، ڕاسپاردەیش مولزەم نییه.

٣. لەوەش ترسناک تر نه ئەم بەندی (ب)یه و نه ماددەی (٥٨)یش باس لەوه ناکەن:

* کەی دەبێت ڕاسپاردەکان بگەنه ئەنجومەنی نوێنەران..؟

* یا ئایا کەی ئەنجومەنی نوێنەران بڕیاری لەسەر ئەدات..؟
* یا ئایا چ زەمانێک هەیە کە ئەنجومەنی نوێنەران بڕیارێکی ئیجابی لەسەر ئەدەن..؟یا ئایا ئەگەر ئیجابی نەبوو چارەی دەستووری چییە...؟ دوور نییە دادگای باڵای فیدراڵ بێت.. بەڵام پێکهاتەکەی ئەویش لە پێکهاتەی هەرسێ ئەنجومەنەکە باشتر نییە...!، یان:
* ئەگەر بەندی (٢٢)ی بەرنامەی حکومەتی «مالکی» وەلامێک بێت بۆ مەترسییەکانمان کە لە بڕگەیەکیدا هاتووە «... گەڕانەوەی قەزاو ناحیەکان بۆ کەرکوک کە لەبنەڕەتدا سەر بەکەرکوک بوونە، ئەم قۆناغە لە ٢٠٠٧/٣/٢٩کۆتایی پێدێت...». باشە چ زەمانێک هەیە ئەنجومەنی نوێنەران ئەم بڕگەیە دەرباز بکات، یان کێ دەڵێت (د.نوری مالکی) تاکو ئەودەم دەمێنێتەوە وەکو سەرۆک وەزیران، یان.. هەتاکو ئەگەر هاتوو ئەم پەرەگرافەیش دەرباز بوو ئەی چارەنووسی (المناطق الاخری المتنازع علیها) کێ و، کەی چارەسەر دەکرێت...!
* زاراوەی (پرسی کەرکوک) کە لە خودی ماددەی (١٤٠)دا هاتووە، لای هەندێ لە پسپۆڕان و سیاسەتمداران و خەڵکی کەرکوکی گەلەکەمان جێگای مەترسییە، ئایا مەبەست لەخودی (شاری کەرکوک)ـە یان (پارێزگای کەرکوک)ـە. لە داڕشتنەوەی دەستووری هەمیشەییدا باشتر وایە ئەم زاراوەیە ساغ بکرێتەوەو، لە جیاتی (شار) بکرێت بە (پارێزگا).
بە شێوەیەکی گشتی چۆن بۆی بڕۆین چارەنووسی ئەو ناوچانەو یەکلایی کردنەوەی کێشەکەیان بە دەست زۆرینەی عەرەبی باڵادەستی کۆماری (العراق)ـە، ئەو زۆرینەیەی، کە بەبیرو باوەڕو عەقیدە، (ئیسلامی) سیاسین، ئەگەرچی ئامادە بوون پاشگەز ببنەوە لەپاشناوی (ئیسلامی) لە پێناسە کردنی ناوی (کۆماری العراق)، بەرامبەر ئەوەی کورد تەنازول لەپاشناوی (یەکگرتووی = فیدراڵی) بکات لەو پێناسەیەدا، یان ڕەتکردنەوەی پرنسیپی (مافی چارەی خۆنوسین)...هتد، کە لە سەرەوە باسمان کرد...
* لەوەش گرنگتر ئەوەی لە خاڵی (٢٢)ی بەرنامەی بەڕێز (د.المالکی)دا هاتووە بەرنامەی خۆی و حکومەتەکەیەتی، خشتەو هەنگاوەکانی لە خودی

ئەو ماددەیەدا تەسبیت نەکراوە. مەبەستمان لە ماددەی (١٤٠)ی دەستوورە.

بەدیتنی ئێمەو زۆر لە پسپۆڕان و رۆشنبیران، هەلێکی باشە لایەنی کوردستانی لە لیژنەی پێداچوونەوە بەدەستووری هەمیشەیی، ئەم خاڵەیش لەبەرچاو بگرن و خشتە زەمەنییەکەو قۆناغەکانی بەندی (٢٢)ی حکومەتی بەڕێز المالکی بخەنە سەر دەقی خودی ماددەی(١٤٠).

سەرەڕای ئەمەش دواخستنی پیادە کردنی یاسای «دیاری کردنی، رێکاری جێبەجێ کردنی تایبەت بەپێکهێنانی هەرێمەکان» بۆ (١٨) مانگی تر، کە لەدانیشتنی رۆژی ١١/١٠/٢٠٠٦، ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری العراق بە ئامادە بوونی (١٤٠) ئەندام لە کۆی گشتی ٢٧٥ ئەندام و، پاش مشتومڕێکی زۆرو هەندێ دەستکاری و سازشکاری، بە زۆرینەی ئامادەبوان پەسند کرا، گرفت و کۆسپێکی ترە لەسەر رێگای جێبەجێ کردنی ماددەی ١٤٠و، هەموولایەکمان گوێبیستی قسەکانی نوێنەرانی لایەنە بەرهەڵستکارەکانی ئەو یاسایە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی العراق بووین.

هەتاکو ئەوانش لایەنگری جێبەجێ کردنی ماددەی(١٤٠)ن، بۆ ناوچە دابڕاوەکانمان یەک نین زۆریان لەگەڵ گەڕانەوەیان نین بۆ هەرێمی کوردستان بە تایبەتی کەرکوک، جارێک بەوەی بارودۆخ ئارام نییەو (عێراق داگیر کراوە)و جارێکی تر بە بیانووی نەوت، یان خەتەری تورکیا..هتد.

بەحوکمی ئەزموونی دەیان ساڵ بێ چارەسەرکردنی کێشەی تەعریب و گەڕانەوەی ناوچەکانمان بۆ باوەشی هەرێمی کوردستان و بەتەحدید کەرکوک، ئەمن و ئارامی لەو ناوچەیەی کە پێی ئێژن (العراق) دابین نابێت، (ئەمریکاو هاوپەیمانان) هۆ و ماکی تەعریب نین و، نەوتیش لە هەموو کون قوژبنێکی ئەم کوردستانە هەیەو، ئەوە زیاتر لە «٧٠» ساڵە فەرهوودی دەکەن و، نەوتی ناوچەکانی عێراقی عەرەبیش لەوەی کوردستان زۆرترەو، لە رۆژی بوونی کۆماری تورکیا دژی بوون وجوودی کوردە. ئەوان هەر ماون و کوردیش هەر ماوەو، لە مەدای مەنزوور قابیلی گۆڕین نین، تورکیاش شوورایەکی پۆلایی نییە بەرامبەر ئیرادەی خەڵکی کوردستان خەرق

نەکرێت، تەهدیدی ئابلـوقەدانی ئابووری و داگیرکردنی کوردستان، جارێ دوور نییە پێی نەکرێت و، ئەگەر زیادەڕۆیی واش بکات ئەوە پێش هەموو لایەک خودی تورکیا زەرەرمەند دەبێت و، دونیا گۆڕاوەو، نەتەوەی کوردیش ئیدی بە ئاسانی و بەبێ دەنگی قڕو جینۆساید ناکرێت و، کوردستانیش(قوبرس) نییە...
با لایەنی کوردی پێ داگرێت لەسەر خشتەکەی خۆی و چارەنووسی ئەو ناوچانەو حەسمیشی ریفراندۆمەکە بێت و، کەرکوک و گشت ناوچە دابڕاوەکانمان بەشێک بن لە هەرێمی کوردستان، نەک دروست کردنی لیژان و بگرەو بەردەی دەسەلاتی کارگێڕی و یاسادانان و ناوبژیوان و گەمە ناوخۆیی و ئیقلیمی و نێودەوڵەتیەکان، ئەگەر کورد ناچار کرا بە ریفراندۆم....

لە پاش پیادەکردنی ئەم دەستوورەش ژمارەیەک لیژان دروست کران بۆ ماددەی (١٤٠):
١ـ لیژنەی جێبەجێ کردنی ماددەی (١٤٠)ی دەستوور کە بە سەرۆکایەتی وەزیری دادی کۆماری (العراق)ـە.
٢ـ لیژنەی بەدواداچوونەوەی ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری (العراق).
٣ـ لیژنەی حکومەتی هەرێمی کوردستان کە لەلایەن وەزیری ناوچەکانی دەرەوەی هەرێمەوە بەڕێوەدەچێت.
٤ـ لیژنەی پەرلەمانی کوردستان.
٥ـ لیژنەی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان.
٦ـ لیژنەی لایەنە سیاسییەکان.
٧ـ لیژانی خودی پارێزگای کەرکوک.

دوورنییە بنکەو مەڵبەندو لیژانی تریش هەبن. زۆر بوونی لیژان و دەزگای پێداچوونەوە بۆ یەک کێشە دەلیلی مردار کردنەوەیەتی نەک حەسم!
بە هەر حاڵ، لە هەموو کاریگەرترو بە تواناو دەسەلاتدارتر لیژنەی یەکەمە. ئەم لیژنەیەی پاش مشتومڕێکی زیاتر لە یەک ساڵ لە کۆتایی ساڵی ٢٠٠٦ دامەزراو فەرمانی حکومی پێ دەرچوو و بودجەی بۆ دیاری کرا (٢٠٠) ملیۆن دۆلار. بۆ ماوەی چەند مانگێک ئەم لیژنەیە خەریکی بارەگاو ئۆفیسی تایبەتی خۆی بوو لە

بەغداو ناوچەکانی (المتنازع علیها)و دامەزراندنی کارمەندو زیاتر لە نیوەی کاتەکەیشی خەریکی(پەیڕەوی ناوخۆ بوو) بۆ خۆی، بە درێژی زیاتر لە یەک ساڵ لە تەمەنی ئەم لیژنەیە بە فەرمی چوار بڕیاری جیددی دەرکردووە سەبارەت بە ناوچە تەعریب کراوەکان.. بڕیاری ژمارە (١) سەبارەت بە گەڕانەوەی کارمەندەکان بوو کە لە ناوچەکانی (المتنازع علیها) فصل کراون یان دەرکراون پاش ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨ تاکو ٢٠٠٣/٤/٩ بۆ سەر کارەکانی پێشووی خۆیان، یان نزیکی ئەو کارانە لە شوێنە ئەسڵییەکانی خۆیان بە پێی یاسا.
بڕیاری دووەمیان گەڕانەوەی دەرکراوانی کوردە لەناوچە تەعریب کراوەکانمان بۆ جێگای خۆیان و قەرەبوو کردنەوەیان.
بڕیاری سێیەم، پەیوەندی هەبوو بە گێڕانەوەی عەرەبە هاوردەکان کە لە پاش ١٧ی تەمموزی ١٩٦٨ تاکو ٢٠٠٣/٤/٩ لە ناوچە کوردییەکان نیشتەجێ کراون و، دەبوایە گشت بڕگەکانی ئەم بڕیارە پێش ٢٠٠٧/٣/١٥ جێبەجێ بکرێت.
بڕیاری ژمارە (٤)، هەڵوەشانەوەی گشت گرێبەستە کشتوکاڵییەکان کە لەکاتی خۆیدا ئەنجام درابوو بە مەبەستی گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتی و جوگرافی واتە (تەعریب) لە گشت ناوچەکانی (المتنازع علیها) و بەتایبەتی پارێزگای کەرکوک و، گەڕاندنەوەی بارودۆخەکە بۆ واقیعی حاڵی کۆنی خۆی«٢٤».
هەموو ئەو بڕیارانە قەول بوو پێش ٢٠٠٧/٣/١٥ جێبەجێ بکرێن، هەر (٤) بڕیارەکەش لە سەرەتای مانگی ١و٢٠٠٧/٢ وەرگیرابوون. بۆ پەسندکردن وبڵاوکردنەوەیان پێویستی بە رەزامەندی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران هەبوو، هەموو مانگی (١) و (٢) تاکو ناوەڕاستی مانگی ٣ی ٢٠٠٧ ئیمزا نەکرا.

لە پاش ٢٠٠٧/٣/١٥یش وەها بڵاوبووەوە کە پەسند کراوە، بەڵام بە چەند دەستکارییەک:
١ـ گەڕانەوەی تەعریبچییەکان (هاوردەکان)بە ئارەزووی خۆیان بێت.
٢ـ بڕە پارەی قەرەبوو کردنەکانی هاوردەکان لە (٢٠) ملیۆن دینارەوە کرا بە (١٠) ملیۆن.
٣ـ هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستە کشتوکاڵییەکان رابگیرێت.

---

«٢٤» (بڕوانەی پاشکۆی ژمارە «٦» هەر چوار بڕیارەکە وەکو خۆی).

مەبەست لەم دواخستنە:

١ـ بەسەر بردنی کاتە، واتە دەبوایە ئەو بڕیارانە پاش٢٠٠٧/٣/١٥ ئەنجام بدرایە هەر وەکو لە ڕێککەوتننامەکەی هەردوو لیستی ئیئتلافی کوردو ئیئتلافی شیعەدا هاتووە، هەروەها لە خشتە زەمینییەکەی پرۆگرامی حکومەتی مالیکیشدا هاتووە.

٢ـ گەڕانەوەی هاوردەکان بە ئارەزوو و کەم کردنەوەی قەرەبووەکەیان جۆرە هەوڵێکە بۆ مانەوەیان، هەر هەمان شت سەبارەت بە گرێبەستەکانیش.

**بۆ چارەسەری گونجاویش جارێکی تریش دەگەڕێمەوە بۆ چارەسەرکردن و بڕیاری بارزانیی نەمر پێش (٣٦) ساڵ پێش ئێستا لەمەڕ چارەسەر کردنی کێشەی تەعریب لەکوردستانی باشوور، ئەویش دیاری کردنی چارەنووسی ئەو ناوچانەیە، پاش ئاسایی کردنەوە، بە سەرژمێرییەک لەسەر ئەساسی ئاماری ساڵی ١٩٥٧...**

کورد بەدەر لەهەندێ نەتەوەی تر لەم رۆژهەڵاتە، لەمێژەوە لەسەر خاک و ئاوی خۆیدا ئەژێت و خاک و وڵاتی نەتەوەیەکی تری داگیر نەکردووە. دیارە لەبەر کۆمەڵێک فاکتەری خۆیەتی و دەرەکی و، مەوقیعی جوگرافی و سروشت و سەروەت و سامانی وڵاتەکەی، کەم بە ئارامی ژیاوە کەمتریش ئازادو خاوەن سەربەخۆیی خۆی بووە. دوور نییە یەک لەو فاکتەرانەی کە بوونەتە مایەی مانەوەو بوونی، سەختی چیاکانی و پەنابردن و خۆ قایم کردن و خۆ شاردنەوەو گۆشەگیری بێت لەو هەردەو کەژانەو، دەکرێت هەر ئەمەش یەک لەو هۆکارانە بێت کە زۆر جار بە کەم رازی بێت و، هەست بکات لە وڵاتی خۆی ئاوارەو بێگانەیەو، سوور بێت لەسەر ئینتیمای بەو وڵاتانە کە بەشە کوردستانییەکەی پێوە لکێنراوە. ئەم دیاردەیە لەپاش رزگاری العراق زۆر بەزەقی بەدی دەکرێت، بەتایبەتی داکۆکی کردنی ژمارەیەکی زۆر لەسەران و کاربەدەستانی حیزبی و ئیداری لەسەر عێراقیەتی خۆیان، تاکو ئەو رادەیە (ئەو بوونە) بۆ بەرامبەر دەخەنە گومانەوە، زۆر جاریش باوەڕی بەوەیش نییە کە هەیەتی، یان مافی خۆیەتی و، ئەوە نییە بە رەزامەندی خۆی پانتاییەک لە خاکی خۆی کە (٤) جار لەپانتایی وڵاتێکی سەربەخۆی وەکو (لبنان)زیاترە کرا بە (المناطق المتنازع عليها) و، هەمان ماف بە بەرامبەری غەیرە کوردستانییەکان درا بۆ ئەوەی ببنە (مدعی) لە سەرمان..!

بە داخەوە بێگانە پەرستی و، خۆ بەکەم زانی بەرامبەر خەڵکی ترو، ئەسیری ئەفسانەی جیۆپۆلەتیک و، نەرم و شەفاف بەرامبەر بە داگیرکەران و زۆرداران و، رازی بوون بە کەم و ژینی رۆژ، کەچی رەق و، توندو، لەخۆبایی لە نێوان خۆ و، بەرامبەر بەخۆ، لە ناو توێژێکی فراوانی دەسەڵاتدارانی ئەم میللەتەدا باوە. تۆ بڵێیت هەر ئەمەش یەک لەو هۆکارانە نەبێت کە کورد لە دێر زەمانەوە ئیستراتیجیەتێکی نەتەوایەتی نەبووەو هەندێ لە سەرانی هەمیشە تاکتیکی بوونەو، بەگەزو پێوانەی رۆژ و پلەو پایەی خۆیان و بازنەکانیان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کێشەی نەتەوەکەیان کردبێت...؟ کە هەلیشیان لە دەستداوە، ئۆباڵیان خستووەتە ئەستۆی خەڵکی تر، گوایە فێڵ و خیانەتیان لێ کراوە...؟ جارو باریش خەتاکە دەخەنە ئەستۆی کوردەکەش!

کورد خاوەن کێشەیەکە، پێش ئەوەی کیانێک هەبووبێ بە ناوی (عێراق). کێشەکەشی بریتییە لەوەی؛ وڵاتەکەی داگیرو دابەش کراوە بۆ زیاتر لەچوار پارچە.

باشووری بە زۆرو بەدەر لەخواستی خۆی و بەنەخشەو پلانی زل هێزەکانی سەردەمی پاش شەڕی جیهانی یەکەم و بەتەحدید بەریتانیاو فەرەنساو هاوپەیمانانیان، گرێدرا بە کیانێکی داتاشراوی نوێوە کە پێی ئێژن (عێراق و، ئێستا بوو بە العراق).
هەر پێش ئەم (العراق)ـە ئەو زلهێزانە پەیمانیان دابوو کوردیش وەکو نەتەوەکانی تری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، کیانی سەربەخۆی خۆی هەبێت، لە پەیمانی (سیڤەر ـ ١٩٢٠) ئەو بەڵێنە لە ماددەی (٦٢و ٦٣، ٦٤) بەدی دەکرێت و، هەر هەمان ئەو زلهێزانە لە پێناوی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیاندا لەو پەیمانە پاشگەز بوونەوەو، لە پەیمانی (لوزان -١٩٢٣)دا کوردیان بێ بەش کرد لە دروست کردنی کیانی سەربەخۆی خۆی. لەگەڵ ئەوەش یەک لە مەرجەکانی دروست کردنی (عێراق)و بوونی بەئەندام لە کۆمەڵەی نەتەوەکان، ددان نان بوو بە مافی کوردو چارەسەرکردنی کێشەکەی لە کوردستانی باشوور. ئەودەم بە ئێستایشەوە ئەو کێشەیە چارەسەر نەکراوە...
واتە پێش دروست کردنی عێراق و پاش لکاندنی کوردستانی باشوور (ویلایەتی مووسڵ) بەعێراقی دروست کراو، بزاڤی رزگاریخوازی کورد، لەگەڵ داگیرکەری بەریتانی و پاشتر حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق، کێشەیەکی هەبوو کەپێی ئێژن کێشەی کورد.
ناوەڕۆکی ئەو کێشەیە داگیرکردنی مافی (بڕیاری چارەی خۆنووسین)ـە لە رووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتوری، چ وەکو کیانێکی سەربەخۆ، یان پێکەوە ژیانێکی ئازادو ئارەزوومەندانە، تێدا خەڵکی کوردستان، لەسەر خاکی خۆی گشت مافەکانی مسۆگەر بێت، کە یەک لەو مافانە بەشداری کوردە لە دەسەڵاتی ناوەند، نەک هەر هەمووی.
کەچی بە پێچەوانەوە، سەرکردایەتی سیاسی کورد، بەشداری کرد لە پرۆسەی رزگاری عێراق، پاشان لە قۆناغی داگیرکردنی عێراق بێ هیچ پەیمان و مەرجێک، تەنها ئەوە نەبێت، پاش قۆناغی رزگاری، کە ئەمریکا بە قسە، باس لە دامەزراندنەوەی عێراق دەکات لەسەر ئەساسێکی دیموکراتی و، دیارە هەندێ لەسەرانی کورد قەناعەتیان وایە کە ئەمریکا خاوەن بەرنامەیەکی گۆڕین و گۆڕانکاری و رزگاری و ئازادی و دیموکراسی و گەشەپێدانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتوورییە لە العراق و ناوچەکەو، ئەم پرۆسەیشە، ئەگەر پێویستیش

بوو، بە زۆرو بەهێزو بە داگیر کردن و تێکدانی ژێر خانی ئابووری پیادەو فەرزی دەکات، هەر هەمان توێژە لەو باوەڕەدایە، یەکەم جارە بەرژەوەندی کوردو زلهێزێکی وەکو ئەمریکا جووتن، چونکە بێ تەئمین کردنی ئەو جووت بوونە، باس کردنی ماف و داخوازی کورد لە رزگاری و ئازادی مەحاڵە...

کەم نەتەوە هەیە لەجیهان بە ئەندازەی کورد سوودمەند بێت لەو گۆڕانکارییانە، وەلێ حەزو واقیع دوو شتی جودان..

بەش بەحاڵی خۆم نازانم کەی سەرکردایەتی سیاسی بزافی رزگاریخوازی کورد دژی بەرژەوەندی زلهێزەکان بووە، یان کام زلهێز لە سەرەتاوە کە هاتووەو، باسی رزگاری و ئازادی و دیموکراتیەتیان بۆ کردون کوردی بەلنگاز دژی بووە. ئەی مەگەر خوالێخۆشبوو شێخ عبدالسلام بارزانی هاواری بۆ قەیسەرەکانی روسیا نەبرد کە زلهێزی سەردەمی خۆی بوو.... شێخ مەحموودی نەمر لە سەرەتای هاتنی بەریتانیای زلهێز، لەکات و لەپاش شەڕی جیهانی یەکەم چی نەکرد بۆیان...پێشەوا قازی و زل هێزی سۆڤییەت.. ئایا دەرگا ما بارزانی نەمر، بەدرێژایی تەمەنی خەبات و تێکۆشانی، لێی نەدات بە هەردوو بلۆکی غەربی و شەرقی و بە(موسکۆ)و (واشنتۆن)یشەوەو، مەگەر هەر ئەوانیش نەبوون دەستیان بڕی و، ئەوەی روویدا، روویدا..

خۆشحاڵبوین بە رمان و نەمانی رژێمی سەدام و، خۆشحاڵین بەو هەوڵانەی کە لە پێناوی دامەزراندنەوەی العراق ئەدرێت لەسەر بنەمایەکی نوێ و دادوەری و یەکسانی، یان ئەگەر پرۆژەیەک هەبێت بە ناوی (رۆژهەلاتی ناوەڕاستی گەورە)، هەمیشە سوپاس گوزاری ئەو ئیرادەو ئەو هێزەین کە سەدام و سەدامیەکانی لەناو بردو کردیانی بە پەندی زەمانە، بەڵام کەی ملهوڕی و تاکڕەوی زلهێزو تۆپ و تانک و داگیرکردن و کوشتن و گرتن و تاڵان و فەرهوود، دیموکراسی و رزگاری و ئازادی هێنەر بووە بۆ گەلانی بن دەست...؟!

وا بۆ چوار ساڵ ئەچێت ئەمریکاو هاوپەیمانانی لە زەلکاوی (العراق) و (ئەفغانستان بە تایبەتی ئەتلێنەوە. ئەمریکا لەسنووری نزیکەی یەک لەسەر چواری هێزی سوپای خۆی هێناوە بۆ العراق کەچی تاکو ئێستا پێیان ناکرێت هەتاکو (المنطقە الخضراء = ناوچەی کەسک)یش کە پانتایی لە چەند هەزار مەترێک زیاتر نییەو، ناوەندی باڵیۆزخانەکەی و بارەگا گرنگەکانی حکومەتی عێراقن، وەکو

پێویست بپارێزرێت، ئیدی چۆن پێیان دەکرێت هەموو بەغداو العراق و ئەفغانستان و رۆژهەلاتی ناوەڕاستی گەورە کۆنترۆڵ بکەن و بیگۆڕن...؟!
ئەمڕۆ خودی (بەغدا) بووە بە دوو بەش، عەرەبی شیعە لە رەسافەو عەرەبی سوونە لە کەرخ و ئەو گەڕەک و (جیوب)انەش کە ماون و لەنێوان هەردوولادا هێشتا ساغ نەبوەتەوە وا خەریکن حەسمی دەکەن. لەم بەینە بە تایبەتی کوردی (نەگبەت و بێ خاوەن چ سوونی بێت یان شیعە) لە بەغداو لە ناوچەکانی تری پێکدادان، بووەتە قوچی قوربانی لە نێوان جەمسەرەکانی ململانێ بە هێزەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانانیشەوە. هەردوو حزبی دەسەلاتدار (پ.د.ک)و (ی.ن.ک)، تاکو ئێستا لەژێر دروشمی دان بەخۆدا گرتن وەکو پێویست رووبەڕووی ئەم شالاوە نابنەوەو، تاکو ئێستایش راگەیاندنەکانیان بایەخێکی جدیان بەم دیاردەیە نەداوە کە لە ئاستی مەترسییەکاندا بێت..
بەپێی ئەم دەستوورە، پاراستنی لە سنووری (٥١ ٪)ی خاکی کوردستانی باشوورو (٤٨ ٪)ی نفووسی بە مافی بوون و چارەنووسەوە، بەباری ژیان و گوزەران و ئەمن و ئاسایشیەوە لە ملی حکومەتی ناوەندی بەغدایەو، بەدەرە لە دەسەلاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان. چ لەبەر ئەوەی ئەو ناوچانە لە ژێر رکێفی حکومەتی ناوەندن، چ بە پێی تحدید کردنی دەسەلاتەکان لە دەستوور.. هەموو لایەکیش ئەزانێت حکومەتی ناوەند دەسەلاتی لەسەر هێزەکانی خۆیشی نییەو بڕیار هێشتا لای کاربەدەستانی ئەمریکاو هاوپەیمانانە. دەستووریش دەسەلاتەکانی دیاری کردووە رۆژانەش خەرق ئەکرێت و، ئەوەیش کە رێزی نییە یاساو دەستوورە!
سەبارەت بە دەسەلات و دابەش کردنی، لە دەولەتە «مرکب = پێکهاتە»کان، چ فیدرالی بێت، یان کۆنفیدرالی، هەر وەکو پسپۆڕانی ئەو بوارە باسی دەکەن و شییانکردۆتەوە، بەم دوو شێوەیە تەسبیت دەکرێت

**شێوەی یەکەم:**

دەسەلاتەکانی ناوەند دیاری دەکرێن و ئەوەی بمێنێتەوە بۆ هەرێمەکانە، یان دەسەلاتەکانی هەرێمەکان دیاری دەکرێت و ئەوەی مایەوە بۆ ناوەندە.

**شێوەی دووهەم:**

دەسەلاتەکانی ناوەند و هەرێمەکان لە یەک جیا دەکرێنەوەو هەردوو دیاری دەکرێن...

له دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق جگە لەو دوو جۆرەی سەرەوە، جۆری سێهەمیشیان تەسبیت کردووە بەناوی دەسەڵاتی هاوبەش.
جاریَ هەرچی دەسەڵاتی فیعلی هەیە «بە گشتی» لە حکومەتی ناوەندا کۆ کراوەتەوە. ئەوەشی ماوە، یان بە ناوی (هاوبەش) لە چوارچێوەی (راپرسین و تەنسیق و راوێژ) تێ ناپەڕێت، یان وەکو دەسەڵاتی(هەرێم) وەکو براو بەشەکەی (قانیعی شاعیر) وایە وەک پێشتریش گوتم، چونکە هەر لە سەرەتاوە چوارچێوە کراوە، یان لە بەشی دەسەڵاتی ناوەندا، یان لە (هاوبەشە)کەی...!

بۆ ئەوەی خوێنەرانی بەڕێز بخەینە نێو سورەتەکەوە باشتر وایە بگەڕێینەوە بۆ دەقی مادده پەیوەندارەکانی دەستووری هەمیشەیی العراق، سەبارەت بەدەسەڵاتەکان و دابەشکردنیان:
«ماددەی (١١٠): دەسەڵاتە فیدراڵییەکان بەم دەسەڵاتە حەسریانە تایبەتمەندە:
یەکەم - نەخشەکێشانی سیاسەتی دەرەوەو نوێنەرایەتی دیپلۆماسی و دانوستاندنی پەیوەست بە ڕێککەوتن و پەیماننامە نێودەوڵەتیەکان و سیاسەتی قەرز کردن و گرێبەست و ئیمزاکردنی و رەسم کردنی سیاسەتی ئابووری و بازرگانی دەرەوەو سەروەری.
دووەم - دانانی سیاسەتی ئاسایشی نیشتیمانی و جێبەجێ کردنی، هەروەها دامەزراندنی هێزی چەکدار و بەڕێوەبردنی بۆ دابین کردنی پاراستن و زامن کردنی ئاسایشی سنووری عێراق و بەرگری لێ کردنی.
سێیەم - نەخشە کێشانی سیاسەتی دارایی و گومرگی و لە سککەدانی دراو و ڕێکخستنی سیاسەتی بازرگانی بەڕێگای سنووری هەرێم و پارێزگاکان لە عێراق دا و دانانی بودجەی گشتی بۆ دەوڵەت و نەخشە دانانی سیاسەتی دراوو دامەزراندنی بانکی مەرکەزی و بەڕێوەبردنی.
چوارەم - ڕێکخستنی کاروباری پێوان و کێشان و سەنگەکان.
پێنجەم - ڕێکخستنی کاروباری رەگەزنامە و بە هاووڵاتی بوون و ئیقامە و پەنابەری سیاسی.
شەشەم - ڕێکخستنی سیاسەتی شەپۆلەکانی پەخش و پۆستە.

حەفتەم ـ دانانی پرۆژەی بودجەی گشتی و وەبەرهێنان.
هەشتەم ـ پلان دانانی سیاسەتی پەیوەندار بە سەرچاوەکانی ئاو لە دەرەوەی عێراق و زامنکردنی ڕێڕەوەکانی ڕژانی ئاو بۆ عێراق بە گوێرەی یاساو نەریتە نێودەوڵەتییەکان.
نۆیەم ـ ئامارو سەرژمێریی گشتی دانیشتوان.

**ئەمەش دەقی ماددەکانە بە عەرەبی**

المادة (١١٠):

تختص السلطات الاتحادية بالاختصاصات الحصرية الاتية:

اولا: رسم السياسة الخارجية والتمثيل الدبلوماسي، والتفاوض بشأن المعاهدات والاتفاقيات الدولية، وسياسات الاقتراض والتوقيع عليها وابرامها، ورسم السياسة الاقتصادية والتجارية الخارجية السيادية.

ثانيا: وضع سياسة الامن الوطني وتنفيذها، بما في ذلك انشاء قوات مسلحة وادارتها لتأمين حماية وضمان امن حدود العراق، والدفاع عنه.

ثالثا: رسم السياسة المالية والكمركية واصدار العملة وتنظيم السياسة التجارية عبر حدود الاقاليم والمحافظات في العراق ووضع الميزانية العامة للدولة ورسم السياسة النقدية وانشاء بنك مركزي وادارته.

رابعا: تنظيم امور المقاييس والمكاييل والاوزان.

خامسا: تنظيم امور الجنسية والتجنس والاقامة وحق اللجوء السياسي.

سادسا: تنظيم سياسة الترددات البثية والبريد.

سابعا: وضع مشروع الموازنة العامة والاستثمارية.

ثامنا: تخطيط السياسات المتعلقة بمصادر المياه من خارج العراق وضمان مناسيب تدفق المياه و توزيعها العادل داخل العراق. وفقا للقوانين والاعراف الدولية.

تاسعا: الاحصاء والتعداد العام للسكان.

ماددەی (١١١) : نەوت و گاز موڵکی هەموو گەلی عێراقە لە هەموو هەرێم و پارێزگاکان دا.

المادة (١١١): النفط والغاز هو ملك كل الشعب العراقي في كل الاقاليم والمحافظات.

ماددەی (١١٢):

یەکەم ـ حکومەتی فیدراڵ هەڵدەستێت بە بەڕێوەبردنی نەوت و گازی دەرهێنراو لە کێڵگەکانی ئێستادا لەگەڵ حکومەتی هەرێم و پارێزگا بەرهەم هێنەکاندا بە مەرجێ داهاتەکانی دادپەروەرانە دابەش بکرێت، کە بگونجێت لەگەڵ دابەش بوونی دانیشتوان لە هەموو ناوچەکانی ولاتداو لەگەڵ دیاری کردنی بەشێک بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بۆ هەرێمە زیان لێ کەوتوەکان کە لە لایەن ڕژێمی پێشووەوە بە شێوەیەکی بێ دادیی بێ بەش کراون و زیانیان لێ کەوتووە دوای ئەوە، بە جۆرێک پەرەپێدانی هاوسەنگ بۆ هەموو ناوچە جیاجیاکانی ولات دابین بکات و ئەمەش بە یاسا ڕێکدەخرێت.

دووەم ـ حکومەتی فیدراڵی و حکومەتی هەرێم و پارێزگا بەرهەم هێنەکان بەیەکەوە هەڵدەستن بە نەخشەکێشان بۆ ستراتیژیە پێویستەکان بۆ بەرەو پێشەوە بردنی سامانی نەوت و گاز بە جۆرێک بەرزترین سوود بۆ گەلی عێراق بەدی بێنێت بە پشت بەستن بە نوێترین تەکنەلۆژیاو پرنسیپەکانی بازاڕو هاندانی بەرهەمهێنان.

**ئەمەش دەقە عەرەبییەکەیەتی**

المادة (١١٢):

اولا: تقوم الحكومة الاتحادية بادارة النفط والغاز المستخرج من الحقول الحالية مع حكومات الاقاليم والمحافظات المنتجة على ان توزع وارداتها بشكل منصف يتناسب مع التوزيع السكاني في جميع انحاء البلاد، مع تحديد حصة لمدة محددة للاقاليم المتضررة والتي حرمت منها بصورة مجحفة من قبل النظام السابق والتي تضررت بعد ذلك بما يؤمن التنمية المتوازنة للمناطق المختلفة من البلاد وينظم ذلك بقانون.

ثانيا: تقوم الحكومة الاتحادية وحكومات الاقاليم والمحافظات المنتجة معا
برسم السياسات الاستراتيجية اللازمة لتطوير ثروة النفط والغاز بما
يحقق اعلى منفعة للشعب العراقي معتمدة احدث تقنيات مبادئ
السوق وتشجيع الاستثمار.

به پێی ماددەی١١٣یش هەتاکو شوێنەوارو جێگا شوێنەوارییەکان... بەسەروەتی نیشتمانی پێناسەکراون و سەر بەدەسەڵاتی ناوەند دەبن...

المادة (١١٣):

تعد الاثار والمواقع الاثارية و البنى التراثية والمخطوطات والمسكوكات من
الثروات الوطنية التي هي من اختصاصات السلطات الاتحادية، وتدار
بالتعاون مع الاقاليم والمحافظات وينظم ذلك بقانون.

ماددەی (١١٤): ئەو دەسەڵاتانەی خوارەوە هاوبەشن لە نێوان دەسەڵاتی فیدراڵی و دەسەڵاتی هەرێمەکاندا:

یەکەم ـ بەڕێوەبردن و ڕێکخستنی گومرگەکان بە هەماهەنگی لەگەڵ حکومەتی
هەرێم و ئەو پارێزگایانەی کە لە هەرێمێک ڕێکنەخراون، ئەمەش بە
یاسایەک ڕێک دەخرێت.

دووەم ـ ڕێکخستنی سەرچاوە سەرەکییەکانی وزەی کارەبا و دابەش کردنی.

سێیەم ـ نەخشەکێشانی سیاسەتی ژینگەیی بۆ مسۆگەرکردنی پاراستنی
ژینگە لە پیسبوون و پارێزگاری لە پاک و خاوێنی بەهاوکاری لەگەڵ
هەرێمەکاندا.

چوارەم ـ نەخشە کێشانی سیاسەتەکانی گەشە سەندن و پلاندانانی گشتی.

پێنجەم ـ نەخشە کێشانی سیاسەتی تەندروستی گشتی بەهاوکاری لەگەڵ
هەرێم و ئەو پارێزگایانەی کە لە هەرێمێکدا ڕێکنەخراون.

شەشەم ـ نەخشە کێشانی سیاسەتی فێرکردن و پەروەردەی گشتی
بەڕاوێژکردن لەگەڵ هەرێم و ئەو پارێزگایانەی کە لە هەرێمێکدا
ڕێکنەخراون.

حەوتەم ـ نەخشەکێشان و ڕێکخستنی سیاسەتی سەرچاوەی ئاوە ناوخۆییە
سەرەکییەکانی وڵات بەجۆرێک کە بە شێوەیەکی وا دابەشکردنێکی
دادپەروەرانە مسۆگەر بکات و ئەویش بە یاسا ڕێک دەخرێت.

المادة(١١٤):

تكون الاختصاصات الاتية مشتركة بين السلطات الاتحادية وسلطات الاقاليم:

اولا: إدارة الكمارك بالتنسيق مع حكومات الاقاليم والمحافظات غير المنتظمة في اقليم، وينظم ذلك بقانون.

ثانيا: تنظيم مصادر الطاقة الكهربائية الرئيسة وتوزيعها.

ثالثا: رسم السياسة البيئية لضمان حماية البيئة من التلوث والمحافظة على نظافتها بالتعاون مع الاقاليم والمحافظات غير المنتظمة في اقليم.

رابعا : رسم سياسات التنمية والتخطيط العام.

خامسا: رسم السياسة الصحية العامة بالتعاون مع الاقاليم والمحافظات غير المنتظمة في اقليم.

سادسا: رسم السياسة التعليمية والتربوية العامة بالتشاور مع الاقاليم والمحافظات غير المنتظمة في اقليم.

سابعاً : رسم سياسة الموارد المائية الداخلية وتنظيمها بما يضمن توزيعا عادلا لها، وينظم ذلك بقانون.

ماددەی (١١٥)

هەر شتێک کە لە دەسەڵاتی حەسری (دەسەڵاتی ئیتحیادی)، دەقنووس نەکرا بێت، ئەوا بە دەسەڵاتی هەرێم و ئەو پارێزگایانەیە دادەنرێت کە لە هەرێم رێکنەخراون و لە کاتی ناکۆکیدا لە دەسەڵاتەکانی تری هاوبەشی نێوان حکومەتی فیدراڵ و هەرێمەکاندا یاسای هەرێمەکە کارپێکردنی بەپێش دەخرێت.

المادة (١١٥):

كل ما لم ينص عليه في الاختصاصات الحصرية للسلطات الاتحادية يكون من صلاحية الاقاليم والمحافظات غير المنتظمة في اقليم والصلاحيات الاخرى المشتركة بين الحكومة الاتحادية والاقاليم تكون الأولوية فيها لقانون الاقاليم و المحافظات غير المنتظمة في اقليم في حالة الخلاف بينهما.

ماددەی (١٢٠)
هەرێم دەستوورێک بۆ خۆی دادەنێت کە دەسەڵات و ئەرکەکانی و شێوازەکانی کارپێکردنیان دیاری بکات بە جۆرێک ناکۆک نەبێت لەگەڵ ئەم دەستوورەدا.
المادة (١٢٠):
يقوم الاقليم بوضع دستور له، يحدد هيكل سلطات الاقليم، وصلاحياته، وآليات ممارسة تلك الصلاحيات، على ان لايتعارض مع هذا الدستور.

ماددەی (١٢١)
یەکەم ـ دەسەڵاتی هەرێمەکان مافی پیادەکردنی دەسەڵاتەکانی یاسادانان و جێبەجێ کردن و دادوەرییان هەیە بە پێی حوکمەکانی ئەم دەستوورە بەدەر لە دەسەڵاتە حەسرییەکانی دەسەڵاتی فیدراڵی کە لەم دەستوورەدا هاتووە.
دووەم ـ دەسەڵاتی هەرێم مافی هەموار کردنی یاسای فیدراڵی هەیە لە هەرێمدا لە حاڵەتێک ئەگەر ناکۆکی و نەگونجان هەبێت لە نێوان یاسای فیدراڵی و یاسای هەرێم سەبارەت بەو پرسەی کە ناچێتە ناو تایبەتمەندییە حەسریەکانی دەسەڵاتە فیدراڵییەکانەوە.
سێیەم ـ لە داهاتە دەستکەوتووەکانی فیدراڵیدا بەشێکی دادپەروەرانە تەرخان دەکرێت بۆ هەرێمەکان و پارێزگاکان، کە بەشی بارگرانی و ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی بکات بە ڕەچاو کردنی داهات و پێویستیەکان و ڕێژەی دانیشتوانی.
چوارەم ـ لە باڵیۆزخانەو نێردە دیپلۆماسییەکاندا نووسینگە بۆ هەرێم و پارێزگاکان دادەمەزرێت بۆ بەدواداچوونی کاروباری ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و بوژاندنەوەی ناوچەیی.
پێنجەم ـ حکومەتی هەرێم تایبەتمەندە بە هەموو پێداویستییەکانی بەڕێوەبردنی هەرێم بە تایبەتیش دروست کردن و ڕێکخستنی هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆی هەرێم وەک «پۆلیس و ئاسایش و پاسەوانی هەرێم.»

المادة (١٢١):

اولاً: لسلطات الاقاليم الحق في ممارسة السلطات التشريعية والتنفيذية والقضائية وفقا لاحكام هذا الدستور، باستثناء ما ورد فيه من اختصاصات حصرية للسلطات الاتحادية.

ثانياً: يحق لسلطة الاقليم تعديل تطبيق القانون الاتحادي في الاقليم، في حالة وجود تناقض أو تعارض بين القانون الاتحادي وقانون الاقليم بخصوص مسألةٍ لاتدخل في الاختصاصات الحصرية للسلطات الاتحادية.

ثالثاً: تخصص للاقاليم والمحافظات حصة عادلة من الايرادات المحصلة اتحادياً، تكفي للقيام باعبائها ومسؤولياتها، مع الاخذ بعين الاعتبار مواردها وحاجاتها، ونسبة السكان فيها.

رابعاً: تؤسس مكاتب للاقاليم والمحافظات في السفارات والبعثات الدبلوماسية لمتابعة الشؤون الثقافية والاجتماعية والانمائية.

خامساً: تختص حكومة الاقليم بكل ما تتطلبه إدارة الاقليم، وبوجه خاص انشاء وتنظيم قوى الامن الداخلي للاقليم كالشرطة والامن وحرس الاقليم.

له کاتی دەرچوون و راگەیاندنی (یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە)، بەندە هەندێ وردتر، وەکو زۆر کوردی تر، لەسەر ئەم بابەتەمان نووسی و، لایەنی لاوازی چۆنیەتی دابەشکردن و داڕشتنی دەسەڵاتەکانمان نیشان دا بە ئومێدی ئەوەی لەداڕشتنەوەی دەستووری هەمیشەیی العراق رەچاو بکرێت، وەک لە جێگایەکی تر ئاماژەمان بۆ کرد..

بە بەراورد کردنی لەگەڵ یاسای سەرەوەری ئاماژە پێ کراو، هەندێ گۆڕانکاری باش و ئیجابی کراوەو بەشێکی تریشی وەکو خۆی ماوەتەوە ئەوەشی ماوە زیاتر (تەحصیل حاصلە). بە پێویستی نازانم جارێکی تر دووپاتی ئەوە بکەمەوە کە کاتی خۆی باسمان کردووە، بۆیە لێرە بە کورتی ئاماژە بە چەند خاڵێک دەکەین:

لەم دەستوورەدا جارێ:

* دەسەڵاتەکان بە پێی ئەو بنەما دەستوورییە، کە لە سەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد دیاری نەکراوە، بەڵکو کراوە بەسێ بەش: (حصریە)کان بۆ ناوەندی بەغداو، (هاوبەشەکان. لە نێوان ناوەندو هەرێم و پارێزگاکان و، بە شی سێهەم هەرێم و پارێزگاکانە...هتد).

* گشت مافەکان راستەوخۆ، یان ناراستەوخۆ قۆرخ کراوە بۆ ناوەندی بەغدا. بڕوانە گشت بڕگەکانی ماددەی «١١٠»، بەتایبەتی : یەکەم و دووهەم، سێهەم، پێنجەم، حەوتەم، هەشتەم...» هەروەها ماددەی «١١٢» :بۆ نموونە:

* لە ماددەی(١١٠) بڕگە«یەکەم» : نەخشەکێشانی سیاسەتی دەرەوە.. رەسم کردنی سیاسەتی ئابووری و «بازرگانی، دەرەوەو ناوەوە -سێیەم»و، ئیمزا کردنی گرێبەست و، نەخشەکێشانی سیاسەتی دارایی و گومرگی و دانانی بودجەی گشتی... بڕگەی سێهەم نەسخی بڕگەی یەکەمی ماددە(١١٤)ی کردووە، بەوەش رانەوەستاوە، بەڵکو لەهەمان بڕگە(یەکەمی ماددەی(١١٤) کە وەکو دەسەڵاتێکی هاوبەش دەبێت بە یاسایەکی تایبەتی بێت..! سەرەڕای ئەوە سیاسەتی« دارایی = السیاسة المالیة » مانای: واریدات و نەفەقاتی دەوڵەتی (العراق)ـە، واریداتیش پێکهاتووە لە دوو ستوونی سەرەکی (داهاتی نەوت و گازو بەرهەمەکانی تری وڵات و، باج و رسوومی گومرگی..).

بڕگەی «دووەم»ی ماددەی(١١٠): تایبەتە بە دانان و جێبەجێ کردنی سیاسەتی ئاسایشی نیشتمانی بەدامەزراندنو بەڕێوەبردنی هێزە چەکدارەکانیشەوە..هتد. واتە ژمارەو جۆرو نەخشەو پلان و ئەولەویات و ئەرک و فەرمان و جموجوڵیان، هەتاکو ئەوەی لەبڕگە «پێنجەم »ی ماددەی«١٢١»دا هاتوو بەندە بەو (سیاسەتەوە)، کە ناوەندی بەغدا تەسبیتی دەکات، یان هەر هیچ نەبێت دروست کردنی گیروگرفت و دەستتێوەردانی ناوەند...هتد.

* کێشەی رەگەزنامەو بەهاووڵاتی بوون (ماددەی ١١٠ ـ بڕگەی پێنجەم). لێرە ئەم دەسەڵاتە بە ڕەهایی هاتووە، باشترو بگرە بۆ حاڵەتی ئێمەی کورد گرنگە، مافی هاووڵاتی بوونی هەرێم لە دەسەڵاتی هەرێم بێت، ئەم مافە واتە (رەگەزنامەو بوونی هاووڵاتی هەرێم) لە زۆر وڵاتی فیدرڵدا پیادەکراوەو، بە سەلماندنی ئەم مافە کۆمەڵێک بەڵگەنامەی تری پێوە گرێ ئەدرێت کە خۆی لە خۆیدا دەبێتە

مایەی بە هێزکردنی لایەنی مەعنەوی و ماددی کەسایەتی هەرێم و تاک و کۆمەڵگاو، سازکردنی زەمینەیەکی نەتەوایەتییە بۆ ئاییندە...

* گومان نییە ماددەی(١١٢) دەروازەیەکی باشە بۆ داکۆکی لەمافی هەرێم سەبارەت بە سەروەت و سامانی نەوت و گاز و کانزاکانی تری و دەستخۆشی لە شاندی کورد دەکرێت لەم بارەیەوە. وەلێ ئەم دەقە لەرێگای فرت و فێڵی دارشتن و خودی ناوەرۆکی ماددەی(١١١) نەسخ کراوەتەوە. بۆ ئەوەی زیاتر ئەم خاڵە گرنگە روون بکەمەوە ناچارم هەندێ بە وردتر باسی بکەم:

* رستەی دابەش کردنی (بە شێوەیەکی دادوەرانە)و گرێدانی بە (دابەشبوونی دانیشتوان)و پاشان حەسم کردنی دابەش کردنی ئەم داهاتە..هتد، بە یاسایەک، هیچ کۆنترۆڵ و گەرەنتییەکی لە دەستی لایەنی کوردستانی نەهێلاوە.

هەر بۆ نموونە: دەستەواژەی (دادوەرانە) تێگەیشتنێکی (رێژەیی) هەیەو، لە کەسێکەوە بۆ کەسێک ئیجتیهادو تەفسیری جیا جیای لێ دەبێتەوە.

بودجەی دەوڵەتی عێراق: ئەوەی کاربەدەستانی هەرێمی کوردستان باسیان کردووە، لە کاتی هەردوو ئیدارە، بە ئێستایشەوە، دیارە مشتومڕو ناکۆکییەکی زۆری لەسەر بووە:

- چۆنیەتی دانانی ئەو بودجەیە لەلایەن ناوەندی بەغدا..
- بەشی هەرێمی کوردستان واتە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی هەرێمی کوردستان پارێزگاکانی ئێستای (سلێمانی، هەولێر، دهۆک) وەکو «پێویستی»و وەکو(رێژە)یش. جارێ (١٣٪)ە و جارێ (١٧٪)ە بووەو، لەم دواییەشدا باسی کەمتر لە ٨٪ دەکرێت..!
- پێش دانان و تەسبیت کردنی بەشی (هەرێمی کوردستان) واتە ئەو (رێژە)یە، خەرج و نەفەقاتی (سەرۆکایەتی کۆمار)، سەرۆکایەتی (حکومەت)و، (وەزارەتی دەرەوەو، بەرگریی و، گشت مەقامە سیادییەکان)، لە بودجەی گشتی دەردەکرێت، ئەوەی مایەوە ئەوسا بە پێی ئەو رێژەیە بەشی هەرێم دیاری دەکرێت.

دیاریشە (پۆستە سیادییەکان و دەزگاکانی) بۆ گشت دەوڵەتی (العراق)ەو، ئەم (العراق)ە پێک هاتووە لە (١٨) پارێزگا، هەرێمی کوردستان تاکو ئێستا کەمتر لە (٣) پارێزگاو، کۆی گشتی ژمارەی هاووڵاتیانی ئەم (العراق)ە لە(٢٧) ملیۆن

کەس زیاترەو نفووسی (هەرێمی کوردستانی فەرمی) کەمترە لە(٤) ملیۆن کەس. لێرەیش چ بە رێژە، چ وەکو پارێزگاو، چ وەکو هاوولاتی، خەڵکی (هەرێمی کوردستان)زەرەرمەندن. ئێمە باسی رەچاو کردنی شارو شارۆچکەو ئاواییەکانی کوردستان ناکەین، کە چۆن رژێمە یەک لە دوای یەکەکانی ئەم (العراق)ـە کاولیان کردووەو ژێرخانی ئابوورییان تێک و پێک داوەو خەڵکەکەی تەهجیرو تەعریبکران، جگە لە ئەشکەنجەو کۆمەڵ کوژی، کە دەبێت بە پێی ماددەکانی ئەم دەستوورە رێژەیەکی تایبەتی لەسەروەت و سامانی ئەم (العراق)ـەو بەتحدید لە نەوت و گازەکەی تەرخان بکرێت بۆ قەرەبوو کردنەوەی ئەو زەرەرو زیانانە.. خۆ ئەگەر هێشتا (کەرکوک، مووسڵ، مەخموور، خانەقین، مەندەلی، بەدرەو جەسان..هتد) وەکو پارچەیەک لەم کوردستانە لە دەرەوەی (هەرێمی کوردستان)ن و بەناوچەی (المناطق المختلف علیها)حیساب کراون، خۆ ناوچەکانی ترمان بەوانیشەوە، بەدرێژایی مێژووی ئەم (العراق)ـە داتاشراوە گۆڕەپانی شەڕو تێکدان و کاول کردن و دەربەدەری و ئەنفال و کۆمەڵ کوژی بوون و، هەر چ نەبێت وەکو ئاماژەمان بۆ کرد، دەبێت رێژەیەک لە بەرهەمی نەوت بۆ ئەو ناوچانە دیاری بکرێت بۆ ئاوەدان کردنەوەو قەرەبوو و بووژانەوەی خەڵکی ئەو دەڤەرانە«٢٥».

کوردستان و خەڵکی کوردستان زۆر لە کوێت و لە (کوێتیەکان) زەرەرمەندتربوون و زۆریش بێ خەتاو هەمیشە دژی سەدامی دیکتاتۆر بوون و لایەنگری تەوژمی شەڕەنگێزی و پاوەنخوازی دەسەلاتی ئەو نەبوون، کەچی ئەوان بە هەموو رۆڵە نێگەتیڤەکانیانەوەو بەو هەموو سەروەت سامانەیانەوە، لە واریداتی نەوتی گەلانی العراق قەرەبووی تاوانەکانی رژێمی سەدام وەردەگرنەوە.

- وەکو کاربەدەستانی (هەرێم) رایانگەیاندووە: نرخی یەک (بەرمیل) نەوت با لە سەرەوەی (٦٠) دولاریش بێت، ناوەندی بەغدا لە دیاری کردنی بەشی کوردستان لە داهاتی نەوتی العراق (بەرمیل)ی نەوت بە کەمتر لە (٢٦) دۆلار حیساب دەکات.
- سەرەڕای ئەمانە هەر هەموو، دوور نییە لە دەزگاکانی دارایی و ئابووری دەسەلاتی ناوەندی بەغدا فێڵ و گزی لە رادەی داهاتی راستەقینەی العراق

«٢٥» بڕوانە دەقی ماددە (١١٢)ی دەستووری هەمیشەیی لە پاشکۆی ژمارە «١».

نەکرێت، چونکە هێشتا لایەنی کوردی وەکو پێویست نەجێگیر بووەو نە ئەوندە ئاگادارە.

* ئەگەر هاتوو ئەو مەترسیانەیش وەلاوە بنێین، دەسەڵاتی ناوەند بە پێی بڕگەی (یەکەم)ی ماددەی (١١٠)ی ئەم دەستوورە، هەر جۆرە هەوڵێک بۆ بەرهەم هێنانی نەوت و گازو کانزاکانمانی لێ قوفڵ کردووەو، چونکە گرێدراوە بە ناوەندو، لە دەسەڵاتی ئەودایە «بڕگە یەکەمی هەمان ماددە». هەروەها:
* ماددەی (١١١)ی ئەم دەستوورە، موڵکیەتی - خاوەنداریەتی- نەوت و گازی هەموو العراق بۆ گەلی (العراق)ـە. خەڵکی العراقیش لە سنووری «٧٠٪»ی عەرەبن و هەموو لایەک لەسەر ئەوە رێکن، کە عێراقی هیواو ئاشتی، لەسەر بنەمای دیموکراتیەت بنیاد نراوەتەوەو ئەنرێتەوە. دیموکراتیەتیش حوکمی زۆرینەو کەمینەیە. حکومەتەکەشی هەر لەسەر ئەو بنەمایە دروست ئەبێت، ئێمەیش (لەخوا بەزیاد بێت)، خۆمان حیساب ئەکەین بە فرەدیموکراتی و، لێمان دەبارێت و، لە حاڵەتی (جەزبەین).

لەم کەڵکەڵەیەدا ئەوەمان لە بیر کردووە، کە ئێمەی کورد لە ئەم (العراق)ـە لە خانەی (کەمایە)تین و، لە پەرلەمانی (العراق)و لە گەمە دیموکراتیەکاندا کاریگەر نین و هەمیشە (برای) زۆرینەمان خاوەن بڕیاری ئیستراتیجی و چارەنووسسازە... !

دیسان ماددەی (١١٢) بە هەموو کەم و کورتیەکیەوە دەرگایەکی باشە بۆ کردنەوەی ئەم فایلە کە بەڕای بەندە:

- چ خودی ماددەکە و ماددەی (١١١) و چەند بڕگەیەکی ماددەی(١١٠)یش پێویستی بە دەستکاری و سەرلەنوێ داڕشتنەوەی هەیە، هەروەها:
- ئەهەمیەتی دیاری کردنی بەشی کوردستانی باشوور (بەڕێژە) لێرەدا بە دەردەکەوێت، ئەمەیش نموونەی زۆرە لەوڵاتی پێشکەوتوو و دواکەوتویش و، دیموکراتی و (عەیب) نەبێت نا دیموکراتیش.. سەرەڕای ئەمەش هێشتا لە بەندەکانی دەستووری هەمیشەیی و سەبارەت بەسەروەت و سامانی نەوت و گاز، مەودای فرت و فێڵی زۆری تێدا بەدی دەکرێت، یەک لەوانە پێناسە کردنی کێڵگەکانی ئێستاو ئایندەیە..

* دارشتنی سیاسەتی ئاو و سەرچاوەکانی لە دەسەڵاتی(حصری)ی حکومەتی ناوەندە، (بڕگەی هەشتەم)ی ماددەی (١١٠).
واتە هەردوو سەروەت و سامانی «ئیستراتیجی» خەڵکی کوردستان، موڵکی هەموو گەلی (العراق)ن و، دارشتنی سیاسەتی بە کارهێنان و بەڕێوەبردنیان...هتد لە دەسەڵاتی ناوەندەو، ئەوەی هاوبەشیش لەسنووری «تەسنیق» و «راوێژکاری» تێ ناپەڕێت. دیارە دەرئەنجامی پرس و باس کردنی (تەنسیق)و (راوێژ)یش، لەزۆر رووەوە (مولزەم) نییە، چ بەحوکمی (نسخ) کردنی و، تەرازووی هێزو، چ لە ماناو مەبەست و ناوەڕۆکی زاراوەکانی (تەنسیق و راوێژ و هاوکاری و،..هتد)ەوە.
* سەبارەت بە دەسەڵاتی کورد لە ناوەندی بەغدا، واتە لەهەر سێ دەسەڵاتەکەی (یاسادانان، کارگێڕی بە هەردوو باڵەکەیەوە «ئەنجومەنی سەرۆکایەتی و ئەنجومەنی وەزیران»و، «دادوەری»)دا رۆڵی کاریگەری ئەوتۆی نییە لە هیچ پرۆسەیەکی دەنگداندا. لیستی هاوپەیمانی کوردستان لەسنوری (٢٠٪) دەنگەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی هەیە، واتا(٥٣) کورسی لەکۆی (٢٧٥) کورسی و، لەوەش کەمتر لە (کارگێڕی)و دامودەزگاکانی تردا هەیە...

ئەوانەی کە دەڵێن ئەوەی لەم دەستوورە نەهاتووە، سەبارەت بە مافی کورد، ئەوە لە دەستووری هەرێمی کوردستان تەسبیت دەکرێت. ئەمانە، یان لە ناوەڕۆکی دەستووری هەمیشەیی العراق ورد نەبوونەتەوە، یان لە خودی پێناسەو ناخی (دەستوور) وەکو باڵاترین یاسای وڵات نەگەیشتوون، چونکە دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق، لە سەرتاسەری کۆماری (العراق) پیادە دەکرێت و حوکمی ماددە و بڕگەکانی مولزیمە لە ناوەندی دەسەڵاتی (العراق)، هەروەها لە (هەرێمی کوردستان) و (هەرێمی تر، ئەگەر پەیدا بێت)و، گشت پارێزگاو شارەوانییەکان. ئەم پرنسیپە بە زەق و روونی لە ماددەی (١٣)ی ئەم دەستوورەدا تەسبیت کراوە، کە دەڵێت:

**دەقە کوردیەکەی ماددەی ١٣:**
یەکەم ـ ئەم دەستورە بە پایەدارترین و باڵاترین یاسا دەژمێردرێت لە سەرتاسەری عێراقدا و هەمووان پێی پابەندن بێ بەدەربوون(استثناء).

دووەم ـ نابێت یاسایەک دابنرێت لەگەڵ ئەم دەستوورەدا ناکۆک بێت و هەر دەقێکیش لە دەستووری هەرێمەکاندا، یان هەر دەقێکی دیکەی یاسایی لەگەڵیدا ناکۆک بێت بە پوچەڵ دەژمێردرێت.

بۆیە:

* هەر یاساو بڕیارێک کە لەلایەن حکومەتی ناوەندی (کۆماریی العراق)ـەوە دەرچێت و دژ بێت لەگەڵ ماددەو بڕگەکانی ئەم دەستوورەدا، هەر لە بنەڕەتدا نایاسایی و هەڵوەشاوەیەو پیادە ناکرێت.
* هەروەها هەمان شت سەبارەت بە هەر یاساو ماددەو بڕگەیەکی یاسایی، یان بڕیار.. هتد، ئەگەر هاتوو هەرێمی کوردستان، یان(هەر هەرێمێکی تر ئەگەر لە ئایندە دامەزرا)، یان لەلایەن ئەنجومەنی پارێزگاو شارەوانییەکانەوە دەرچێت، کە ناکۆک بێت لەگەڵ دەقی ماددەو بڕگەکانی دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق، جێبەجێ ناکرێت و ئەویش هەڵوەشاوەیە.
* واتە هەر تەنها ئەو یاساو ماددەو بڕگە یاساییانە خاسن کە تەبا بێت لەگەڵ ئەم دەستوورە. بەدەر لەمە: نە ناوەندی (العراق)و، نە (هەرێمی کوردستان)و، نە پارێزگاکان و شارەوانییەکان بۆیان هەیە کاری وەها بکەن، ئەگەر کرا ئەوە جێبەجێ ناکرێت.

**سێیەم:**

ئەوەی کە دەڵێت ئەگەر ناکۆکی لە نێوان دەسەلاتی ناوەندی (کۆماری العراق) و هەرێم روویدا یاسای هەرێم دەیخوات (بە رەهایی) لایەکی کێشەکەیە، چونکە ئەمەش هەر حوکمی ماددەی (١٣) دەیگرێتەوە، ئەگەر پشت بە دەقێکی دەستووری ببەسترێت ئەوە دەقی وا بە رەهایی لە دەستوورەکەدا نییە، دیارە خستنەڕووی مافی وەها بە رەهایی، یان نەزانینە، یان بۆ چەواشەکردنە، چونکە هەر وەکو باسمان کرد (دەستوور سەرچاوەی یاساو بڕیارەکانی ناوەندو هەرێمەکانە...هتد) بەدەر لەم بنەمایە راست و دروست نییەو، ئەمە بەدیهیەتێکە، کە یاساناسان پێی ئەڵێن(ما بني على الباطل باطل)....!

**چوارەم:**

ئەوانەی کە پشت بە ماددەی (١١٥)ی دەستووری هەمیشەیی دەبەستن گوایە لە حاڵەتی خیلافدا ئەولەویەت بۆ یاسای هەرێم و پارێزگاکانە، یەک رووی راستیەو، رووەکەی دیکەی ئەوەیە کە:

١. نابێت روو بدات بەپێی ماددەی (١٣)ی خودی ئەم دەستوورە.
٢. ئەگەر رووی دا ئەوە دروست نییە (باطل)ەو، هەر لەسەرەتاوە بەپێی دەستوور کاری پێی ناکرێت.
٣. هەتاکو ئەگەر هاتوو ئەوە وەکو ماف بەڕەهاییش وەرگیرا ئەوە بۆ ئەنجومەنی نوێنەران هەیە دەستکاری بکات و، پێشەکیش ئەزاندرێت هەڵوێست چۆن دەبێت چونکە، ئەو ئەنجومەنە لە زۆرینەی عەرەبی العراق پێکهاتووە.

**دەقە کوردیەکەی: ماددە (١١٥):**

«هەر شتێک کە لە دەسەڵاتی حەسری بۆ دەسەڵاتەکانی (فیدراڵی) دەقنووس نەکرا بێت بە دەسەڵاتی هەرێم و ئەو پارێزگایانەی لە هەرێم رێک نەخراوان دادەنرێت و لە کاتی ناکۆکی دا لە دەسەڵاتەکانی تری هاوبەشی نێوان حوکمڕانی فیدراڵ و هەرێمەکاندا یاسای هەرێمەکە کارپێکردنی بە پێش دەخرێت.» لێرەش دەبینی تەحدید کراوە و دەقەکەش زۆر تەماوییە (بڕوانە دوا بڕگەی کە دەڵێ: یاسای هەرێمەکە پێش دەخرێت)، واتە ئەوەی ناوەند هەڵناوەشێتەوە، یان پەکی ناکەوێت، یان قەتیس ناکرێت..!

پێداچوونەوە بەو ماددەو بڕگانەداو هەوڵدانی چاکسازی لە رێگای لیژنەی پێداچوونەوە هەڵێکی باشە ئەگەر بە وردی وشە بە وشەو بڕگە بە بڕگە لەسەری بوەستن...

بە دەر لە دیدو بۆچوونی جیاجیاو جیاواز لەمەڕ ناوەڕۆکی دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق و، قۆناغی بەشداری سەرکردایەتی سیاسی کورد لە دەسەڵاتی ناوەندی بەغداو دەرئەنجامەکانی ئەزموونی زیاتر لە(٣) ساڵی بەناو(دەسەڵاتی هاوبەش و ئارەزوومەندانەو تەوافق)و، پێدا هەڵدانی یەک تەرەفەی کورد بە (العراقی فیدراڵ و حکومەتی العراقی فیدراڵ و، سەرۆک کۆماری فیدراڵ و، وەزیری فیدراڵ...یان کورد حوکمی عێراق دەکات..هتد)، عێراقیش لەخوا بە زیاد بێت لەسەر بنەمای دیموکراسی و یەکسانی دامەزراوەتەوەو «یاسا» باڵادەستەو کەس لە«یاسا» بەرزتر نییە(!)، لەکاتێکدا هەموو لایەک ئاگادارە ئەگەر بەڕێژە بێت و لە گەمەیەکی دیموکراسیدا، کورد لەمەڕ بڕیارو یاسا چارەنووسسازەکانی عێراق سەنگی کاریگەری حاسیمی نییە و، لە پۆستە سیادییەکانیش دەسەڵاتی ئەگەر هەبێتیش پرۆتۆکۆلیەو، هەتاکو لەوەش یەک بە سێیە لە (ئەنجومەنی سەرۆکایەتی)و لە هەردوو ئەنجومەنی (نوێنەران و وەزیران) کەمترە لە یەک بە چوار و، دوور نییە هەر لەبەر ئەوەی کوردێک پۆستێکی سیادی بەرکەوتووە، پۆستەکە دابەشکراوە، بۆ نموونە: راگرتنی دەسەڵاتە پرۆتۆکۆلیەتیەکانی سەرۆک کۆمار بە درێژایی ئەم خولە کە سەرۆک کۆمار کوردەو پێک هێنانی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی کە لە کوردێک و عەرەبێکی شیعەو عەرەبێکی سوونە پێک هاتووەو، هەرسێکیان هەمان دەسەڵاتیان هەیە، بۆ ئەنجامدانی ئەو مافەپرۆتۆکۆلیانە، کەچی ئەم مەرجە سەرۆک وەزیران ناگرێتەوە بەو هەموو دەسەڵاتە فیعلیەوە کە هەیەتی، یان سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران. هەروەها (پۆستی وەزیری دەرەوەی العراق)و دروست کردنی پۆستی (وەزیری کاروباری دەرەوە).

(کەمینە)ی کورد لەناوەندەکانی بڕیار، لە برگەو ماددەکانی ئەم دەستوورەدا بە دی دەکرێت، ئەو بۆچوونانەیش رەد ئەکاتەوە گوایە گروپی کوردستانی ئەتوانێت لە گەمەیەکی دیموکراتی و لەرێگای (تحالف)ەوە مەرجەکانی خۆی تەسبیت بکات و بەمەش مافەکانی مسۆگەر دەکات. بڕوانە هەڵوێستی زۆرینە لەمەڕ: ناوو ناسنامەی العراق. لە فیدراڵیەت. لە سەروەت و سامان. لە بوونی کورد لەپۆستە سیادییەکان. لەتەعریب و ناوچە بەعەرەب کراوەکانی کوردستان و چارەسەرکردنیان و، «تەرحیل» کردنی ماددەی(٦٥)ی دەستووری هەمیشەیی، کە پەیوندارە بەدروست کردنی

ئەنجوومەنی فیدرالّی، وەک یەک لەئەستوونەکانی دەولّەتی فیدرالّ بۆ خولێکی تری هەلّبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی العراق و، (وقف التنفیذ) واتە قەتیس کردنی کارکردن بە یاسای «دیارکردنی رێکاری جێبەجێ کردنی تایبەت بە پێکهێنانی هەرێمەکان» بۆ (١٨) مانگی تر، (لەگەلّ ئەو چەند مەرجانەی تر کە باسمان کرد.....). هەر هەموو ئەمانەو پاش نزیکەی چوار سالّ لە دامەزراندنەوەی (العراق)ی ئاوات و ئاشتی و هیوا(!) پرسێکی گرنگ لای خەلّکی ستەمدیدەو شەیدای رزگاری و ئازادی، دروست کردووە: کوا قورسایی و رەنگدانەوەی کورد لەسەر هەلّوێست و بڕیارە چارەنووسسازەکان...؟

ـ ٢ ـ

بە هەموو قورسایی کوردەوە لەبەغدا تاکو ئێستا خالّە گرنگەکانی ماددەی (٥٨)ی یاسای ئیدارەی دەولّەت بۆ قۆناغی گواستنەوە جێبەجێ نەکراوە لە ناوچە دابڕاوەکانمان لە (هەرێمی کوردستان)، بەتایبەتی لە کەرکوک و لە مووسلّ و ناوچەکانی ترو، کورد (قڕانە)و، لەسەر ناسنامەی رەگەزی، کورد بەتاک، بەکۆمەلّ تیرۆر دەکرێت و، لەناوچەکانی ناوەڕاست و باشوورو لە مووسلّ و لەجێگای تر کورد تەهجیر دەکرێت چ بەتەرهیب و چ بەتەرغیب و، ژمارەیان هەر وەکو تەخمین دەکرێت نزیکەی (٥ر١) ملیۆن کەسە، جگە لەتەنگوچەلّەمەی ناوەڕۆکی ماددەی(٥٨) چ زاراوەکانی و چ لەرووی پیادەکردنی بڕگەکانی، شەپۆلی هاتنی عەرەبی سوونەو شیعە بۆ پارێزگاکانی (سلێمانی و هەولێرو دهۆک و کەرکوک)یش خەریکە ببێتە دیاردەیەکی خەتەرناک، لەڕووی ئاسایش و ئابووری و کۆمەلاّیەتی و سیاسی و، تاکو ئەو رادەیەی کە دەکرێت مرۆڤ بە حەزەرەوە گومانی (تەوژمی پێنجەم)ی تەعریبی لێ بکات و لەوەش خەتەرناکتر کێشەی تەعریب لە ناوچە دابڕاوکانمان لەکێشەیەکی سیاسی لەنێوان کوردو رژێم، بووەتە کێشەیەکی: سیاسی.. یاسایی.. رەگەزی.. مەزهەبی..!

ـ ٣ ـ

زیاتر بۆ دوو سالّ ئەچێت لایەنی کوردستانی لە بەغدا نەیتوانیوە زمانی کوردی وەکو زمانێکی فەرمی، هەر وەکو لە یاسای ئیدارەی دەولّەت بۆ قۆناغی

گواستنەوەدا هاتبوو پیادە بکات و، یان لە خولی کۆمەڵەی نیشتیمانی یاساکەی دەربکردایە، یان هەر چ نەبێت لەو ماوەیەدا ئەندامانی لیستی هاپەیمانی کوردستان کە(٧٧) ئەندام بوون بەکوردی قسەیان بکردایەو پرۆژەی یاساکانیان پێ بگۆڕدایە بۆ کوردی و، کوردێکی زۆریان بە(وەرگێڕ = مترجم) دامەزراندایە لە کۆمەڵەی نیشتیمانی و وەزارەت و دامودەزگاکانی حکومەتی ناوەندو لە حکومەتی (هەرێمی کوردستان)و، بگرە پارێزگاکانیش.

بە پێچەوانەوە، زۆر لەو ئەندامانەو هەندێ لە وەزیرو گزیرەکانمان نەفسیان نەیدەهێنا بەزمانی شیرینی کوردی لەو مەنبەرە فەرمییانە قسە بکەن و تەرجومە بکرێت، یان هەر زمانی خوێندن و نووسینیان بە کوردی نەدەزانی و، لەوە زیاتر لە خودی هەرێمی کوردستانیش، زۆر لەبەرپرسانی کورد بە عەرەبی دانوسانذن و قسە دەکەن، کە کۆنگرەو کۆڕیش دەبەسترێت و، هەندێ عەرەب بەشداری دەکەن، ئەوە زمانی ئەو کۆڕو کۆنگرەو کۆبوونەوانە عەرەبی دەبێت. بەندە دوورە لەدەمارگیری نەتەوایەتی، بەلاّم ئەوەی لای من مەبەستەو جەختی لەسەر دەکەم ئەمە (مافی گەل)ـە، بەڕووباری خوێن و ئەنفال و جینۆسایدی میللەتێک بەدەست هاتووە، کوردییش زمانی ئێمەیەو، بە فەرمی کردنی یەک لەمافە گرنگەکانی میللەتەکەمانە...

سەرکردایەتی سیاسی کورد، بەمەش رانەوەستان، بەڵکو بەوەش رازی بوون کە لە دەستووری هەمیشەیی العراق بڕگەیەکی تر بۆ سەر ماددەی (٤)ی دەستوور زیاد بکرێت، لە جیاتی بڕگەی (سێیەم)ی هەمان ماددە:

بڕگەی (سێیەم)ی ماددە (٤)ی دەستووری هەمیشەیی کە هەمان دەقی یاسایی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە بوو پێش دەستکاری کردنی و، دەڵێت:

دەقە عەرەبیەکەی: «تستعمل المؤسسات والاجهزة الاتحادية في اقليم كردستان اللغتين».

دەقە کوردیەکەی: (دامەزراو و دەزگاکانی فیدراڵی لە هەرێمی کوردستان هەردوو زمانەکە بە کاردێنن).

بڕگەی زیاد کراوەکەی رۆژی ١٤/١٠/٢٠٠٥، لە جیاتی ئەو بڕگەیەی سەرەوە دەڵێت:

دەقە عەرەبیەکەی «تستعمل المؤسسات الأتحادية والمؤسسات الرسمية في اقليم كردستان اللغتين العربية والكردية».
دام و دەزگاکانی فیدراڵی و دام و دەزگا فەرمییەکانی هەرێمی کوردستان هەردوو زمانی عەرەبی و کوردی بەکار دێنن.
واتە زمانی عەرەبی شان بە شانی زمانی کوردی لە هەموو دام و دەزگاکانی هەرێمی کوردستان بە کار بێنن واتە فەرمییە، کەچی هەمان پرنسیپ ناوەندی فیدراڵی بەغدا ناگرێتەوە!. مەبەست لەمە زۆرینەی عەرەبی باڵادەست زمانی عەرەبییان سەپاند وەکو زمانی کوردی لە گشت دام و دەزگاکانی هەرێمی کوردستان.
بەم پاشەکشێیەو بەم سازشکاریە، دەرگا کرایەوە بۆ سازشکاری تر، بە تایبەتی ماددەی(١٤١)ی دەستوور، رێگای بەم پاشەکشەیە داوە، نەک بۆ ئێستاو ئایندە بەڵکو بۆ رابردوویش.
ماددەی (١٤١):
« ئەو یاسایانەی لە ساڵی (١٩٩٢) بەولاوە لە هەرێمی کوردستان دانراون و بەردەوام کاریان پێ دەکرێت و هەموو بڕیارەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان ـ بە بڕیارەکانی دادگاو گرێبەستەکانیشەوە ـ کاریان پێ دەکرێت مەگەر هەموار بکرێت، یان هەڵبوەشێندرێنەوە بە پێی یاساکانی هەرێمی کوردستان لە لایەن لایەنی تایبەتمەندەوە کە ناکۆک نەبن لەگەڵ دەستوور دا.» بڕوانە دوا رستەی دەقی ماددەی (١٤١) «... کە ناکۆک نەبن لەگەڵ دەستووردا.»
واتە ناوەندی بەغدا، بەحوکمی ئەو (رستەیە)، بۆی هەیە لە هەر کاتێک بە پێویستی زانی، بەگشت یاساکانی ساڵی ١٩٩٢ بەولاوە کە پەرلەمانی کوردستان دەریهێناون و، هەروەها بە بڕیارەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و، بە بڕیارەکانی دادگاو بە گرێبەستەکانیشەوە بچێتەوە، لەراگرتن و هەڵواسینیانەوە تاکو هەڵوەشانەوەیان.
دەقی وەها بە رەهایی و بە(اثر رجعي)، خەتەرناکەو ئەزموونی زیاتر لە(١٢) ساڵی هەرێمی کوردستانی خستوەتە ژێر شمشێری ناوەندی بەغدای زۆرینەی عەرەبی باڵادەستەوە، هەر کات نیازی خراپ بێت یان بیەوێت ... ئەو ئیعتراف کردنە بە یاساو بڕیارەکانی هەرسێ دەزگا فەرمییەکەی هەرێمی کوردستان (پەرلەمان و حکومەت و دادوەری) کە لە پێشەکی ئەو ماددەیە هاتووەو، لایەنی کوردی زۆریان بە شان و

باڵیدا هەڵدا، دەبینین چۆن لە دوا رستەی هەمان مادده ریسەکەمانیان کردەوە بە خوری و، ئەو (ئیعتراف)ـە چۆن (نسخ) کرایەوە..! بەلای ئێمەوە لەسەر نوێنەرانی کوردە، لە لیژنەی پێداچوونەوەی دەستوور، رستەی «کە ناکۆک بن لەگەڵ دەستووردا»، بکەنە خاڵی سوورو بە هەموو شێوەیەک هەوڵی سڕینەوەی بدرێت، ئەگینا ناوەڕۆکی ماددەی (١٤١) بەمانەوەی ئەو رستەیە مەبەستی خۆی ناپێکێت، چونکە پەرلەمان و حکومەت دەسەڵاتی دادوەری لە هەرێمی کوررستان لەمیانی قۆناغی پێش دەرچوونی ئەم دەستوورە ژمارەیەکی زۆر یاساو بڕیاری دەرکردووەو هەندێ گرێبەستیشی ئیمزا کردووە، ناکرێت دەسەڵات بدرێت بە ناوەند، یان هەر دەزگایەکی تر هەر کات ویستی بەزەبری ئەم رستەیە بە(اثر رجعي) دەستکاری ئەو یاساو بڕیارانە بکات. ئەم جەخت کردنە لەسەر (ما لم تكن مخالفة لهذا الدستور) لە ماددەی (١٣)و (١٢٠)دا هاتووە، ئەویش بۆ دەستووری هەرێم، یان هەرێمەکان و یاساو بڕیارەکانیان، کە پاش کارکردن بە دەستووری هەمیشەیی دەردەچن. بۆ بە هەمان شێوە مامەڵە نەکراوە لەگەڵ یاساو بڕیارەکانی رژێمی سەدام، یان ئەوانەی تری کە پێش و پاش قۆناغی پێش کار کردن بە دەستووری هەمیشەیی دەرچوونە..؟
هەروەها پێویستە لەسەر لایەنی کوردستانی لە لیژنەی پێداچوونەوە بە دەستووری هەمیشەییدا بڕگەی (ثالثا= سێهەم)ی ماددەی (٤)ی دەستووری هەمیشەیی راست بکاتەوەو سوور بێت لەسەر دەقی یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوە بڕگە (٦)ی ماددەی(٩)، یان خودی دەقی بڕگە(ثالثا )ی ماددەی (٤)ی دەستووری هەمیشەیی پێش دەستکاریەکەی پێش رۆژێک لە ریفراندۆم کە دەڵێت: (تستعمل المؤسسات والاجهزه الاتحاديه في اقليم كردستان اللغتين.» نەک دەقی ئێستای دەستوور « تستخدم المؤسسات الأتحاديه والمؤسسات الرسميه في اقليم كردستان اللغتين العربيه والكرديه». هەروەها هەڵگرتنی رستەی (مالم تكن مخالفه لهذا الدستور) لەماددەی(١٤١)دا.

## ـ ٤ ـ

دامەزراندنی (ئەنجومەنی فیدراڵ) کە یەکێکە لەئەستوون و بنەماکانی دەوڵەتی پێکهاتەیی، واتە (دەوڵەتی فیدراڵ)و، لە ماددەی(٦٥)ی دەستووردا تەسبیت کراوە، هەر لە هەمان دەستوورو بە حوکمی ماددەی(١٣٧) تێدا تەجمید کراو کاری

پێ ناکرێت تاکو خولێکی تری هەڵبژاردنی (ئەنجومەنی نوێنەرانی العراق)، ئەو کاتەیش دەبێت (ئەنجومەنی نوێنەران) بەزۆرینەی دوو لەسەر سێی کۆی گشتی ئەندامانی بڕیاری پێکهێنانی بدات و یاسایەکی بۆ دەرکات..هتد، لەوەیش سەرنج ڕاکێشتر ئەوەیە، کە هیچ سەقفێکی زەمەنی دیاری نەکراوە بۆ بڕیاردانی وەها لە ئەنجومەنی نوێنەران..! و دواخستنی یاسای(دیاری کردنی، ڕێکاری جێبەجێ کردنی تایبەت بەپێکهێنانی هەرێمەکان) کە ئەنجومەنی نوێنەران ڕۆژی ١١/١٠/٢٠٠٦ پەسندی کرد، بۆ (١٨) مانگی تر، واتە بۆ ساڵی ٢٠٠٨، ئیفلیج کردنی ماددەی (١١٨)ی دەستووری هەمیشەیی «العراق»ە، دووریش نییە ئەمیش تەرحیل بکرێت بۆ خولی دووهەمی هەڵبژاردنی ئایندەی ئەنجومەنی نوێنەرانی العراق، یان هەر لەکاتی پێداچوونەوە بە دەستوورەکەدا چارەنووسی ئەو یاسایە لەئەگەردا بێت، بە تایبەتی پاش ئەوەی دەرکەوت لیستی بەرەی تەوافق (٤٤) ئەندام و تەیاری سەدری ٣٠ ئەندام والقائمەالعراقیە (٢٥) ئەندام و حزبی الفضیلە (١٥) ئەندام و لیستی الحوار الوطنی (١١) ئەندام و لیستی المصالحە والتحریر (٣) ئەندام، لەگەڵ باس کردن و دەرچواندنی یاسایەکی وەها نەبوون. تاکو ڕادەیەک خودی دانیشتنەکەی ئەنجومەنی نوێنەران لەڕۆژی ١١/١٠/٢٠٠٦، لەگەڵ هەر (سێ) مەرجەکانی بەرهەڵستکارانی ئەو دانیشتنەو خودی یاساکە، کە یەکەمیان: دواخستنی پرۆژەکە بۆ ١٨ مانگی ترو، دووهەمیان : بڕیاردان لەسەر لیژنەی پێداچوونەوە بە دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق و، گۆڕینی شێوەی دەنگدان لەسەر ئەو یاسایە، لە ژمارەی دەنگدەران بۆ ژمارەی ئەوانەی کە مافی دەنگدانیان هەیە. دەڵێین لەگەڵ ئەوەش دانیشتنەکە بە ئامادەبوونی (١٤٠) ئەندام ئەنجامدرا و، ئەگەر چەند ئەندامێکی لیستی العراقیە نەبایە نیسابی یاسایی بۆ ئەو دانیشتنە تەواو نەدەبوو. یاساکەش بە زۆرینەی دەنگی ئامادەبووان وەرگیرا، واتا زۆرینەی ئامادەبووانی ئەو دانیشتنە (١٤٠) ئەندام بوو، ئەمەش زەنگی خەتەرە بەتایبەتی بەشێکی گرنگی چارنووسی ماددەی (١٤١)یش بەندە بەم یاسایەوە، بۆیە پێویستە لایەنی کوردستانی ئەم کێشەیە بە هەند وەربگرێت...

یەک لە خاڵە هەرە گرنگ و چارەنووسسازەکانی ئەمڕۆ و ئایندەی خەڵکی کوردستان، سەروەت و سامانەکەیەتی. کە بریتییە لە نەوت و گازو ئاو و شوێنەوارەکانی کوردستان... هتد
لایەنی عەرەبی بەپێی ماددەو بڕگەکانی دەستووری هەمیشەیی العراق، پەیوەست بەم بابەتە، ئەو سەروەت و سامانەی لە واقیع و لە پراکتیکدا لە ژێر رکێفی خۆی هێلاوەتەوە. بڕوانە دەقی ماددەی (١١٢)، یان بڕگەکانی ماددەی(١١٠)...هتد، لە دەستووری هەمیشەیی العراق.
لایەنی کوردی هەوڵیداوە سوود لە ناوەڕۆکی ماددەی (١١٢) وەربگرێت بەو پێیەی کە ئازاد دەبێت لە ئیستغلال کردنی نەوت و گاز لە(کێڵگە)تازەکان، یان سەروەت و سامانی تر. دەقی ماددەکە جارێکی تریش بە عەرەبی و بە کوردی لەخوارەوە تەسبیت دەکەین:

**دەقە کوردیەکەی:**

ماددەی (١١٢):

«یەکەم ـ حکومەتی فیدراڵ هەڵدەستێت بە بەڕێوەبردنی نەوت و گازی دەرهێنراو لە کێڵگەکانی ئێستادا لەگەڵ حکومەتی هەرێم و پارێزگا بەرهەم هێنەکاندا بە مەرجێ داهاتەکانی بەشێوەیەکی دادپەروەرانە دابەش بکرێت کە بگونجێت لەگەڵ دابەش بوونی دانیشتوان لە هەموو ناوچەکانی وڵاتداو لەگەڵ دیاری کردنی بەشێک بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بۆ هەرێمە زیان لێ کەوتووەکان کە لەلایەن رژێمی پێشووەوە بە شێوەیەکی بێ دادی بێ بەش کراون و زیانیان لێ کەوتووە دوای ئەوە، بە جۆرێک پەرەپێدانی هاوسەنگ بۆ هەموو ناوچە جیاجیاکانی وڵات دابین بکات و ئەمەش بە یاسا رێکدەخرێت.»

«دووەم ـ حکومەتی فیدراڵی و حکومەتی هەرێم و پارێزگا بەرهەم هێنەکان بەیەکەوە هەڵدەستن بە نەخشە کێشان بۆ ستراتیژییە پێویستەکان بۆ بەرەو پێشەوە بردنی سامانی نەوت و گاز بە جۆرێک بەرزترین سوود بۆ گەلی عێراق بە دی بێنێت بە پشت بەستن بە نوێترین تەکنەلۆژیاو پرنسیپەکانی بازاڕو هاندانی وەبەرهێنان.»

به پێی ئەم ماددەیە گوایە (بەڕێوەبردن = إدارە)ی کێڵگەکانی ئێستا هاوبەش دەبێت لە نێوان حکومەتی هەرێم و ناوەندی بەغدا لە هەموو روویەکەوە، (هەر وەکو هەندێ لە کاربەدەستانی کورد تەفسیری دەکەن). دەقە عەرەبیەکەی کە دەقی موعتەمەدە ئەوەندە روون نییەو قابیلی ئیجتیهادو تەفسیرە: (تقوم الحكومة الأتحادية بادارة النفط والغاز المستخرج من الحقول الحالية مع حكومات الأقاليم والمحافظات المنتجة...). بۆ نموونە:

یەکەم: ئەگەر مەبەستی (موشەریع) وا بێت، واتە (بەڕێوەبردنی) هاوبەش بێت، باشترو مسۆگەرتر بوو رستەکە بەم شێوەیە دابڕێژرابایە (تقوم الحكومه الاتحاديه وحكومات الاقاليم والمحافظات المنتجه باداره النفط والغاز المستخرج من الحقول الحاليه...).

دووهەم: وشەی (مع)ـە کە لەو رستەدا هاتووە (اسم يستعمل مضافا فيكون ظرفا ويعنى المصاحبه) نەک (الشراكه). هەتاکو ئەگەر واش بێت واتە مانای ئەو رستەیە (هاوبەش) بێت خۆ تاکو ئێستا ژمارەی کارمەندانی کورد لە کێڵگە و مەوقیعەکان بەگشتی و، ژمارەو پلەو پایەی کورد لە گشت دامودەزگا پەیوەندارەکانی ئیدارەو پیشەسازی و بازرگانی نەوت و گاز بە تایبەتی، ئەگەر وەکو سەردەمی رژێمی سەدامی بەدناو نەبێت ئەوە لەزۆر بواریدا باشتر نییەو، ژمارەی کارمەندو کرێکارو بەرپرس، لە نەوتی کەرکوک بە تەحدید، جێگای نیگەرانیە...! هەروەها:

لێرە موشەڕیع باسی (الحقول الحالية) دەکات. (الحقول الحالية= کێڵگەکانی ئێستا) لەم دەستوورە پێناسە نەکراوە، یان ئاماژە نەکراوە بە کێڵگەکانی ئایندە.

ئەوەی کە تاکو ئێستا زانراوە، کاتی خۆی (مسحی) عێراق کراوە لەڕووی جیۆلۆجییەوە. کێڵگە نەوتیەکان دیاری کراون واتە(ئێستا). زیاتر لە (٥٠٠) تەرکیبی جیۆلۆجی کەشف کراوەو، ئەگەری نەوتی تێدا بەدی کراوە. نیوەی ئەم (ژمارەیە) لە رێگای بیر لێدانەوە، هەبوون و قەبارەی نەوتەکەی زانراوە و، نیوەکەی تری چاوەڕوانی بیر لێدان دەکات....

زاراوەی (الحقول الحالية= کێڵگەکانی ئێستا) ئەمرۆ توانای بەرهەم هێنانیان سنووردارە، واش مەزەندە کراوە توانای بەرهەمهێنانی رۆژانەیان

لەسنووری (٢)ملیۆن بەرمیلە، (٥ر١) ملیۆن بەرمیل بۆ ناردنە دەرەوەیەو (٥ر٠) ملیۆن بەرمیل بۆ پێویستییەکانی ناوخۆ.
هەر لەم بارەیەوە هەندێ لە پسپۆڕانی مەیدانی پیشەسازی نەوت مەزەندەی ئەوە دەکەن کە پاش کەمتر لە دە ساڵ و شان بەشانی چاکسازی و گەشەپیدان لەم بوارەدا، دوور نییە بەرهەمی دەرهێنانی نەوت لە (کێڵگەکانی ئێستا)ی العراق خۆی زیاتر لە (٥) ملیۆن بەرمیلی رۆژانە بدات. بەش بە حاڵی خۆم گومان دەکەم لایەنی عەرەبی عێراق، یان ئەوانەی کە لە پشت دانانی ئەم دەستوورەوە بوون، ئەوەندە بێ ئاگابن لەمەڕ نەوت و گازو کێڵگەکانی، کە چارەنووسی پیشەسازی نەوت و گاز، بخەنە دەستی هەرێم و پارێزگاکان.

بۆیە هەر لە ئێستاوە لایەنی عەرەبی لە ئەنجومەنی نوێنەران، بەتایبەتی سوونەو هەندێ لە شیعەکانیش، هەوڵی یەکلا کردنەوەی ئەم کێشەیە ئەدەن. چ راستەوخۆ و چ لە رێگای ئەو یاسایەوە کە قەولە لەئایندە تەشریع بکرێت هەر وەکو لەکۆتایی ماددەی (١١٢- اولا)دا هاتووە.
بۆ سەلماندنی ئەم کێشەیە، زیاتر لە لایەنێک لە حکومەت و لە ئەنجومەنی نوێنەرانی العراق، رەخنەیان لە حکومەتی هەرێمی کوردستان هەیە کە جارو بار وا پیشان دەدەن گوایە مافی ئیستیغلال کردنی نەوت و گازیان هەیە لە هەرێمی کوردستان. واتە کێشەی (الحقول الحالية = کێڵگەکانی ئێستا) بووەتە خاڵێکی مشتومڕ لە نێوان هەردوولا. ئەگەر لایەنی کوردی هەوڵی گۆڕین و چاکسازی لە ماددەو بڕگە پەیوندارەکانی ئەم بابەتە نەدات لە دەستوورو یەکلای نەکاتەوە، ئەوە مانەوەیان وەکو خۆی و بە بەراوردکردنی تەرازووی هێزو گەمە دیموکراسیەکەو، قسەکانی بەرزە بەرپرسانی ئەمریکا بە تایبەتی لێدوانەکەی ئەم دواییەی (رایس) لە کوردستان لە قازانجی کورددا نییە.
زامن کردنی بەشی کوردستان لەسەروەت سامانەکەی، یەک لە داخوازییە حەیاتییەکانی خەڵکی کوردستانە. با هەر یەک لە کاربەدەست و خەڵکی کوردستان لە هەر ژەمێکی خواردنی خۆی وردبێتەوە کە لەسەر سفرەکەیدایە، چی لەو خواردن و خواردنەوانە بەرهەمی کوردستانە..؟ و، لەوە سەرنج راکێشتر ئەوەیە: ئەو بڕە پارەیەی کە ئەدرێت بەو خواردن و خواردنەوانە لەدەرەوەی دەسەڵاتی کوردستانەو،

لەوەش ترسناکتر، ئەو خواردن و خواردنەوانە، بەسەوزەوات و ئاوی (حەیات)یشەوە، لە دەرەوەی کوردستانەوە دەهێنرێن، کە دەسەڵاتدارانیان دژی ویست و ئامانج و بگرە هەندێکیان دژی بوونی کوردن...!

ئەو دەسەڵاتەی ئەمنی خواردن و خواردەمەنی هاوولاتیانی خۆی مسۆگەر نەکات چۆن دەتوانێ ئەمنی نیشتمانی و نەتەوایەتی میللەتەکەی تەئمین کات..!

## - ٦ -

کورد بەشداری لەپرۆسەی رزگاری عێراق و دامەزراندنی ئەنجومەنی دەسەڵاتی کاتی کرد بێ هیچ مەرجێکی پێش وەخت و، لەو مەیدانەو پاش ئەوەش بەئێستایشەوە ژمارەیەکی زۆر لە پێشمەرگەو هاوولاتیانی گیانیان لە دەست داوە. تەنها لەمووسڵ تاکو سەرەتای هاوینی ئەم ساڵ (٢٠٠٦) زیاتر لە (٧٠٠) هاوولاتی کورد تیرۆر کراون و نزیکەی یەک ملیۆنیش تاکو ئێستا ئەو شارەیان جێهێڵاوەو زۆربەیان روویان کردوەتە (هەرێمی کوردستان)و کوشتن و راونانی کورد لەو پارێزگایە هێشتا بەردەوامەو، لەکەرکوکیش لەماوەی کەمتر لە(٣) مانگ زیاتر لە(٥٠٠) کردەوەی تیرۆریستی ئەنجام دراوەو کاری تیرۆرستی لەو شارەو دەوروبەری زیاتر بووە و، بەدەیان هاوولاتی کورد گیانیان لەدەستداوەو بەسەدەهایش برینداروسەقەت بوون، سەرەڕای زیانی ماددی، کە مەزەندە دەکرێت بە سەدەها ملیۆن دۆلار، ئەمەو جگە لە ناوچەکانی تر. دان بەخۆداگرتنی سەرکردایەتی سیاسی کوردو، رۆڵی میانگیری لە نێوان لایەنەکانی شیعەو سوونەی عەرەبی العراق بۆ راگرتنی ئەو شەڕە نەگریس و خوێناوییە، کە لەبەغداو ناوەڕاست و خوارووی العراق بەرپا بووە کارێکی باشە، وەلێ ئەو شەڕە هێشتا بەردەوامەو خەستتر دەبێت و شاڵاوی دژ بە کوردیش رانەوەستاوە.

بەپێی ئامارەکانی هەندێ لایەنی تایبەت بە ئامار ومافی مرۆڤ لە بەغدا، تەنها لە ماوەی ٤/١٥ تاکو ٢٠٠٦/٧/١٥ ژمارەی کوژراو و بریندار لە العراق لە سنووری (٣٣) هەزار کەس دایە، واتە مانگانە لە سنووری ١١ هەزار کەس و رۆژانە زیاتر لە(٣٦٠) کەس بوون و، نزیکەی نیوەی ئەمانە کوژراون و، دوا ئاماری دەزگا زانستییەکانی ئەمریکایش کە پێش ماوەیەک بڵاوکرایەوە، ژمارەی کوژراوانی عێراق لە پاش رزگاری العراق لە ساڵی ٢٠٠٣ـەوە تاکو ئێستا (٦٥٠) هەزار

کەسە، واتە ژمارەی کوژراوان رۆژانە لە (٦٠٠) زیاترە. ئەگەر هاتوو ئەم ئامارانە نیوەشی راست بێت خۆی لەخۆیدا زەبری تیرۆریستان و شەڕو پێکدادانی لایەنەکانی سوونەو شیعە نیشان ئەدات.
ئەڵێین سەرەڕای ئەو هەڵوێستەش، لایەنێکی بەرچاو لەجادەی عێراقی و عەرەبی(فەرمی و میللی)، لایەنی کوردستانی بە تەماشاکەر وەسف دەکات و، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی العراق و، ژمارەیەکی تر لە ئەندامانی ئەنجومەنی نوێنەران، کێشەی ئاڵای عێراق و فیدراڵیەت و سەروەت و سامانی نەوت و، هەندێ کێشەی تریان کردوەتە بابەتی ململانێ لەگەڵ لایەنی کوردستانی، بەتایبەتی ئەو لایەنانەی کە توانییان رۆژێک پێش ریفراندۆم زیاتر لە (٥) ماددەی نوێ فەرز بکەن و لەدەستووری هەمیشەیی (العراق)دا تەسبیتی بکەن و، سەرکردایەتی کوردیش پەسندی کردووەو، بە هەندێکیش پاشگەزبوونەوە لە دەقی ماددەکانی (یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قوناغی گواستنەوە).
یەک لەو ماددانە کە فەرز کراوە، دروست کردنی لیژنەیەک لە ئەنجومەنی نوێنەران بۆ پێداچوونەوە بەدەستووری هەمیشەیی العراق، کە پاش مشتومڕێکی زۆر لە نێوان لیستەکانی ئەنجومەن، رۆژی ١١/ ٢٠٠٦/١٠ ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری العراق ئەو لیژنەیەی پێکهێناو ماوەی کاری ئەم لیژنەیشی بە یەک ساڵ دیاری کردووە هەر وەکو لە لاپەڕەکانی پێشوو باسمان کرد.

لایەنی عەرەبی ناسیۆناڵ و مەزهەبی توندڕەوی نێو ئەنجومەنی نوێنەران، بەتایبەتی ئەوانەی لە پشتی چاکسازی دەستوورن، سوورن لەسەر:

٦-١: پێداچوونەوە بە ناسنامەی العراق و، بەو دەقەی کە لە دەستووردا هاتووە رازی نین و، پێ لەسەر عروبەتی العراق دادەگرن وەکو خاک وەکو نەتەوە، بێ ئەوەی ئامادە بن (تاکو ئێستا) لەسەر ئەوەی کە کوردیش لەم (العراق)ـە بەشێکە لە نەتەوەیەک و، خاکەکەشی بەشێکە لە کوردستان.
هەروەها هەندێ لەو لایەنانە سوورن لەسەر ئەوەی کە دەبێت پۆستە سیادییەکانیش بۆ عەرەبی عێراق بێت، چونکە لە العراق عەرەب هەم زۆرینەیەو، هەم ئەم (العراق)ـە لای ئەمانە بە خاک و بەخەڵکەوە، بەشێکی خاک و نەتەوەی عەرەبە....!

٦-٢: زۆربەی زۆری ئەم تاقمە جاری پرنسیپی فیدرالّیەت رەتدەکاتەوەو لایەنگری دەسەلاّتی مەرکەزین، یان لامەرکەزیەتی پارێزگاکان و، لای زۆر لەمانە فیدرالّیەتی باشووری العراق قابیلی قەبوولّ نییە، واتا دژی ماددەی (١١٤ و ١١٥..هتد) دەستووری هەمیشەیین.

زۆربەی ئەوانەش کە لایەنگری فیدرالّیەتن بۆ کورد تەنها لەسنووری ئێستای هەرێمەکەی لێی قەبوولّ دەکەن، ئەو چەند دەسەلاّتە رووکەشیەیش کە هەیەتی پێی قایل نین و، لە واقیعدا بە هیچ جۆرێک لەگەلّ گەرانەوەی کەرکوک و ناوچە بەعەرەب کراوەکانمان نین بۆ سەر هەرێمی کوردستان، یان گەرانەوەی تەعریبچییەکان بۆ جێگای کۆنی خۆیان و گەرانەوەی کوردە تەهجیرو دەرکراوەکان بۆ سەر زێدی باو باپیرانیان.

٦-٣: ئەمانە کە زیاتریشیان عەرەبی سوونەن و، هەندی لایەنی شیعە و نەتەوەپەرستانی عەرەب، پێیان وایە فیدرالّیەت عێراق دابەش دەکات و ئەم دابەش کردنە لای ئەمانە لەخانەی مەحالّەو، جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە دەبێت دەسەلاّتەکان بگەرێتەوە بۆ ناوەند.

٦-٤: هەروەها لەگەلّ رەتکردنەوەی شێوەی دابەش کردنی سامانی (العراق)ن لەنێوان هەرێم و پارێزگاکاندا، سوورن لە مەنەپۆل کردنی لەلایەن دەسەلاّتی ناوەندەوە.

٦-٥: ئەم لایەنانە دژی دەقی ماددەی(٧)ی دەستوورن. کە دەقەکەی دەلّێت:

«یەکەم: هەر قەوارەیەک، یان پەیرەوێک تەبەنی رەگەز پەرستایەتی، یان تیرۆر، یان تەکفیر، یان پاکتاوی تایەفەیی، یان تەحریز بکات، یان رێگا خۆش بکات، یان پایەدار بکات، یان رەواجی بۆ بکات، یان پاساوی بۆ بێنێتەوەو بەتایبەتی بۆ بەعسی سەدامی لە عێراق، قەدەغە بکرێت و ئەمە بەیاسا رێک دەخرێت.»

«دووەم: دەولّەت پابەند دەبێت محارەبەی تیرۆر بکات بەهەموو جۆرەکانییەوەو کار بۆ پاراستنی زەوییەکانی دەکات بۆ ئەوەی نەبێتە بارەگایەک، یان رێرەوێک، یان گۆرەپان بۆ چالاکییەکانی.»

لەم بارەیەوە هەولّی لادان، یان چاکسازی دەکەن بەو شێوەیەی کە قازانجی ئەو لایەن و کەسانە بن کە ئەو ماددەیە دەیانگرێتەوەو، هەر لەم روانگەیەوە

تەنگیان هەڵچنیوە بە یاسای (بنبڕکردنی بەعس = قانون اجتثاث البعث)و، وا دیارە پرۆژەیەکیش ئامادەکراوەو، دوور نییە لە ئایندەیەکی نزیک بخرێتە بەردەم ئەنجومەنی نوێنەران بۆ چاکسازی و، پوکانەوەی ناوەڕۆکەکی...

٦-٦: دژی پرنسیپی مافی چارەی خۆنووسین بەتایبەتی ئەگەر هاتوو پەیوەندی بەکوردەوە هەبێت، هەروەها جاڕی گەردوونی مافی مرۆڤ بەتەواوی رەتدەکەنەوە لەگەڵ رێککەوتنە نێو دەوڵەتیەکان و، لەگەڵ ئەوەدا نین ئەم پرنسیپانە ببنە بەشێک لەدەستووری هەمیشەیی العراق.

٦-٧: لەبەر ئەوەی ئەم گروپانە بێچووی عەقڵیەت و رەوتی تاکڕەو و، سەنترالیزمن و، خاوەنی پرنسیپی (یەک خاک. یەک گەل. یەک نەتەوە. یەک ئایین. یەک مەزهەب. یەک دەسەلات. یەک حیزب. یەک سەرکردە...هتد)ن، دژی بوون و تێکەڵ بوونی هێزە رەسەنە چەکدارەکانی لایەنە سیاسییەکانی پێش رزگاری (العراق)ن، بەش بە حاڵی کورد دژی هێزی پێشمەرگەن و، لایان وایە ئەمانەش میلیشیان و، دەبێت حەل بکرێت، تەنها هێزی کۆماری العراق هێزی حکومەتی ناوەند بێت...!

٦-٨: هێزەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانانی بەهێزی داگیرکەر پێناسە دەکەن و، بەربەرەکانێ کردنی بە فەرز دەزانن و، داوای کشانەوەیان دەکەن لە العراق بەپەلە، یان بە پێی خشتەیەکی زەمەنی دیاری کراو.

٦-٩: بەو دەق و بڕگانەی دەستوور رازی نین سەبارەت بە مەوقیع و رۆڵی شەریعەتی ئیسلام لەمەڕ یاسا دانان، وەکو سەرچاوەیەکی تەشریع و، رەتکردنەوەی هەر یاساو بڕیارێک کە ناتەبا بێت لەگەڵ بنەماکانی ئیسلام و، جەخت لەسەر پیادەکردنی حەرفیی شەریعەتی ئیسلام دەکەن لە یاساو لە حوکمدان و لە بەڕێوەبردن و، دەیانەوێت ئەم پرنسیپە لەدەستوور بە روونی تەسبیت بکرێت.

٦-١٠: لە گەڵ دوو رەگەزنامەو دوو ناسنامە نین و بڕوایان وایە کە هەموو مامەڵەو دەسەڵاتەکانی پەیوەندار بەم کێشەیەوە دەبێت مەرکەزیی بێت.

تاقیکردنەوەی پاش قۆناغی رزگاری و، کۆسپ و تەگەرەکانی سەر رێگاو رێبازی دامەزراندنەوەی العراق لەسەر بنەماکانی سەروەری و ئازادی و رێزگرتن لە مافەکانی مرۆڤ و گەلان و، قووڵ بوون و فراوانبوونی باری

نائارامی و تیرۆرو توندوتیژی و بەردەوام بوونی شەڕی (ناوخۆ ـ بە هەردوو لایەنەکەیەوە «مەزهەبی »و «ڕەگەزی» ، ئەگەر چ لایەنەکانی ئەم شەڕە هێشتا ددان بەوەدا نانێن بە فەرمی و، نالەباری باری ئابووری و قەیرانی سوتەمەنی و کارەباو ئاو و، قات و گرانی و فشاری «هەڵاوسان = التضخم»و، کێشەی بەرزبوونەوەو فڕینی نرخی زەوی و زیادبوونی ئیجارات و، بایەخ نەدان بەداخوازی و پێداویستی و گلەیی خەڵک و پشتگوێ خستنی پرسەکانیان و، بەکار هێنانی ئازادی بیروڕا بۆ (تنفیس)و تاکو رادەیەکیش بۆ یاری کردن بە هەست و خواستی ئەو خەڵکەو، بە چارەنووس و دوارۆژیان، وای کردووە کە خودی تاقیکردنەوەکەمان لە ئاستی العراق و کوردستان بکەوێتە ژێر گومانەوەو، پەرژین و دیوارێکی بەرز دروست بێت لە نێوان خەڵک و دەسەڵات و، رۆژانە لە کوردستان دەنگی نارەزایی بەرزو پان و بەرین و قوڵتر دەبێت و، ئەم دیاردەیە تەنها لەنێوان خەڵک و دەسەڵات بە دی ناکرێت، بەڵکو هەتاکو لە نێو ریزەکانی پارت و رێکخراوە سیاسییەکان و سەرکردایەتیەکانیانیشدا قوت بووەتەوەو، تاکو دێت سەرکردایەتی سیاسی لایەنە سیاسیبەکان بڕوایەتی خۆیان لە دەست ئەدەن و، ئەمڕۆ لە زۆر ناوەند و بوارو جەغزی سیاسی و کۆمەڵایەتی و کلتوری، تەنانەت بوونی ئەو سەرکردایەتیانەش جێگای پرسیارو پێداچوونەوەیە.

کورد خاوەن کێشەیەکە تاکو ئێستایش چارەسەر نەکراوە. ئەم کێشەیە وا دیارە دەبێت لە بەغدا چارەسەر بکرێت. بەغدایش خاڵێکی جەزبی ئیرهاب و دەستتێوەردانەو، بورکانێکە دیارە بەم زووانە دانامرکێتەوەو، کوردستانیش وا بووەتە بەشێک لەم (العراق)ەو، هەموو نەهامەت و کۆسپ و کارەساتەکانی ئەم (العراق)ە کوردستانیش دەگرێتەوە. ئەزموونی زیاتر لەهەشتا ساڵی حوکمڕانی عەرەبی زۆرینەی العراق بە سەر کوردستانی باشوورماندا، لە غەیری راگوێزان و بەعەرەب کردن و کوشتن و برین و کاول کردن و ئەنفال و قڕکردن، چی تری پێ نەبەخشین و، تاقیکردنەوەی زیاتر لە (٣) ساڵی پاش رزگاری العراق لە دەسەڵاتی رژێمی نەفرەت لێکراوی سەدام، کە پوختەی نوێنەری توێژێکی ناسیۆنالیزمی سوونەی عەرەب بوون و، دامەزراندنەوەی ئەم(العراق)ە لەسەر ئەو بنەمایانە کە هەیەو لەم باردۆخەی ئێستایداو بەو لاوازیەیەوە، گەواهیەکی ترە کە چارەسەر

کردنی کێشەی کورد لەم وڵاتە، هەر وەکو خەڵکی کوردستان خوازیارن، هێشتا لە حوکمی مەحاڵەو، ئەوانەی کە لە سەرەتاوە سوور بوون لەسەر ئەوەی کە (٩٨٪)ی مافەکانی کورد لە دەستووری هەمیشەیی مسۆگەر کراوە کەوتوونەتە گومانەوەو، هەندێکیشیان پەشیمانن..!
کێشەی کورد لە کوردستانی باشوور، پۆستێک، یان دوو پۆستی سیادی نییە لە بەغدا یان چەند کورسییەکی پەرلەمان و ژمارەیەکی دەرەجەدار، یا برە پارەیەک و دەسەڵاتێکی (لامەرکەزی لە کاتی لاوازی و بێ دەسەڵاتی ناوەند)، یان تەسلیم بوونی بە سیاسەتی ئەمری واقیع و دەسکەوتی رۆژ نییە، بەڵکو کێشەی دیاری کردنی مافی چارەنووسیەتی وەکو گەل و نیشتمان و قۆزتنەوەی ئەم هەلە مێژووییە کە بۆی هەڵکەوتووە.
ئێمە دڵنیاین سەرکردایەتی سیاسی کورد، لەم باردۆخەی العراق نەرۆڵی برا گەورەیی پێ ئەکرێت، نەتوانای میانگیریان هەیە لەبەر کۆمەڵێک هۆو هۆکار لەوانە: خۆی کێشەیەکی هەیە ئەو کێشەیە نەک هەر چارەسەر نەکراوە بەڵکو، زۆربەی زۆری ئەو لایەنانە هەوڵی گەمارۆو خاوکردن و پاشگەزبوون و (تفریغ) کردنی ناوەڕۆکی ئەو کێشە ئەدەن و، ئومێدو هیواش، بۆش و ئیدارەکەی بوو، ئەوانیش لە هەندێ بواردا ئەگەر هاوکاریان نەبن ئەوە زۆر جار بێ دەنگ و بێ هەڵویستن، جگە لەوەش سەنگ و قورسایی رۆڵی برا گەورەیی و دەمڕاست و میانگیری پێویستی بەمرونەت و پێشکەش کردنی دەسکەوت و تەنازولاتە.
سەرکردایەتی کوردیش ئەوەی هەیەتی تەنها مافی رەوای گەلەکەیەتی سەودایی لەسەر بکات. هەر بۆیە دەبینین بەو هەموو نەرمی و ددان بەخۆداگرتنی سەرکردایەتیەکەی و، لە هەندێ بواریش تەنازولات و پاشگەزبوونەوەش، زۆر لەلایەنەکانی عێراقی غەیرە کورد بە ئەمریکاشەوە نارەزاو دوو دڵن لە هەڵوێست و داخوازییەکانی کوردو هەمیشە کورد لەژێر فشاری ئەواندایە...
کێشەیەک ئەوە بە سەرهات و رابردووی بێت، ئەمە ئەزموونی ئەمرۆی بێت لەگەڵ بڕیاربەدەستانی کێشەکەی و، ئاوا رەفتاری لەگەڵدا بکەن، لە کاتێکدا سەرکردایەتییەکەی لە هەموو سەرکردایەتی گەلێکی تر زیاتر پێویستی بە پشتیوانی و هاوکاری و فیداکاری خەڵکەکەیەتی، دەبێت پاشەڕۆژی بەرەو کوێ بڕوات. بۆیە

مافی ڕەوای خەڵکی کوردستانە پرسیار لە سەرکردایەتی خۆی بکات: ئەری گەلۆ بۆ کوێ ئەمانبەن...؟!
گلەیی و گازندەی ئەو خەڵکە دیاردەیەکەو دەبێت بە هەند وەربگیرێت، چونکە مسۆگەر کردنی ڕەزامەندی خەڵک و ڕاکێشانی بۆ گۆڕەپانی ململانێ و خەبات و تێکۆشان بە: سڕ کردن و پەراوێزکردن و چەواشەکردنی نابێت. بە(تعليق) کردنی پرۆسەی دیموکراسی و ململانێی سیاسی و کۆمەڵایەتی و مەنەپۆڵ کردنی بوارەکانی ژیانی ناکرێت، بە (تأجيل)و پاشان تەرحیل کردنی مافەکانی نابێت، بەڵکو بەدەنگ هاتنەوەی سەرکردایەتییەکەی لەخواست و پێداویستییەکانی و زامن کردنی بنەما سادەکانی ژیانی ڕۆژانەو یەکسانی و عەدالەت و ڕاستگۆیی و، لە دەست نەدانی هەل و دەرفەتە دەرەکییەکان و، ڕێزگرتن لە سەروەت و سامان و بەرژەوەندی گەل و نیشتمان و هوشیارکردنەوەو سازدان و بەشداری کردنیەتی لەگشت ڕووداو و پرس و بڕیارە چارەنووسسازەکانی.
هیچ پاساوێک نییە بۆ گوێ نەدان بەئاهو فیغانی ئەو خەڵکەو، خۆ دزینەوە لە گەندەڵی سیاسی و حزبی و پاشان ئیداری و، دواخستنی ریفۆرمی بنەڕەتی لەو بوارانەدا.. مەعلومیشە زۆربەی زۆری گۆڕینە چەندایەتیەکانی مێژوو لە کاتی قەیرانەکاندا ڕووی داوە...!
گرەوکردن تەنها لەسەر لاوازی ڕژێمی ناوەندو ناکۆکییە ئیقلیمییەکان و پشت بەستن بە فاکتەری دەرەکی و، بوون بە پاشکۆی بەرنامەو سیاسەتی هاوپەیمانان لە عێراق و ناوچەکە، موجازەفەیەکی بێ حیسابە. لە مێژەوە بوونی نفوزو دەسەڵاتی ئەمریکاو بەریتانیا لە عێراق و ناوچەکە بەتەحدید. مامان و پشتیوانی گشت ڕژێمە دیکتاتۆرو فاشییەکانی ئەوساو ئێستا بوون، بەرژێمی سەدامی دارماوو، ئێستایش بەهۆی سیاسەتی ئیدارەی بۆش و بلێرو، بیانووی و جوودی هێزەکانی ئەمریکاو بەریتانیاو هاوپەیمان لە عێراق، وایکردووە عێراق ببێتە ناوچەیەکی جەزبی ئیرهاب و توندوتیژی و نەهامەتی و شەڕی ناوخۆو، بەخیلافی هەندێ دیدوبۆچوونی چەوت، کە دەڵێن ئەم شەڕو شووڕە دوورە لەکوردستان، یان کوردستان هێمن و ئاسایشەو کورد پارێزراوە. ئەمە دیدوبۆچوونێکی نا مەسئولانەو بێ بناغەیە، چونکە، قەیرانی کارەباو سووتەمەنی و گرانی باری ژیان و، شەهیدو بزر بوونی بە سەدان کوردی ناوچەکانی مووسڵ و کەرکوک و دوزو تەلەعفەرو جەلەولاو بەغدا... هتد و،

راونانی دەیان هەزار کەسی دیکەی ئەو ناوچانە هێشتا بەردەوامە، یەک لە دەرئەنجامەکانی ئەو واقیعەیە کە هەیە، باشە ئەمانە کێن و لە کوێن..؟ مووسڵ کوردستان نییە، کەرکوک و تەلەعفەرو جەلەولا کوردستان نین و، کوردی بەغداو ناوەڕاست و خوارووی عێراق لەرەگەزی ئێمە نین...؟ مەگەر سەرەتای ئیرهاب لە هەولێرو سلێمانی دەستی پێ نەکرد..! ئەمڕۆ کورد لەسەر ناسنامە دەکوژرێت و، هیچ کات وەکو ئێستا لە گۆڕەپانی عێراقی و عەرەبی و جادەی عەرەبی و ئیقلیمی بە گشتی خوێنی کورد نارێژرێ. مرۆڤ هەر مرۆڤەو، کوردیش هەر کوردە لە هەر کوێیەک بێت و کێ ئازاری دا غەمی هەموومانە...

لێرەدا یەک لەفەرمووده بەنرخەکانی کەسایەتییەکی ئەڵمانم وەبیر دێتەوە بەناوی «قەشە مارتین نێمیولەر(Martin Niemoller) کە یەکێک لە تێکۆشەرانی دژی نازیەت و فاشیەت بوو و، بەدەستی نازییەکانیش کوژرا، وتوویەتی:

(لە ئەڵمانیا کە نازییەکان هاتن و کۆمەنیستەکانیان برد هیچم نەگوت، چونکە کۆمەنیست نەبووم.

کە هاتن جوولەکەکانیان برد، هیچم نەگوت، چونکە من جوو نەبووم.

پاشان هاتن ئەندامانی سەندیکاکانیان برد، هیچم نەگوت، چونکە من ئەندامی سەندیکا نەبووم.

پاشان هاتن «کاثولیکەکانیان» برد، چونکە خۆم «پرۆتستان» بووم، هیچم نەبوو بیلێم.

پاشان هاتن خۆمیان برد، ئەودەم کەس نەبوو تاکو شتێک بلێت..!)

تۆنی بلێر وا خەریکە دەڕوات بە هۆی ئەوەی کە زۆرینەی خەڵکی بەریتانیاو حزبەکەی خۆشی، لەگەڵ سیاسەتەکەی نەبوون، بەتایبەتی لەمەڕ عێراق. وەزیری خارجیەی بەریتانیا لەم رۆژانە داوای داخستنی گرتووخانەی گوانتانامۆی کرد، کە پێشان بۆ کاربەدەستێکی بەریتانیا لە حوکمی موحەڕەمات بوو. سەرۆک ئەرکانی سوپای بەریتانیا داوای کشانەوەی هێزەکانی بەریتانیا دەکات بە پەلە لە عێراق. پانتایی نارەزایی لەسەر سیاسەت و کردەوەکانی بۆش و ئیدارەکەی لەمەڕ عێراق، لە ئەمریکاو لە کۆنگرێسی ئەمریکی و لە حزبی کۆماری و لە هەندێ لە بازنەکانی خودی ئیدارەکەی، لە زیادبووندایەو، داوا دەکرێت دەبێت چاو بەو سیاسەتەدا

بخشێنرێتەوەو، هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق بکێشێتەوەو، تاکو ئێستاش سیاسەتی ئیدارەی بۆش کورت دێنێ لە ناوچەکەو، وا خەریکە لەعێراق بە بن بەست دەگات، جەماوەریەتی بۆش لە مێژەوە سەرو لێژبووەتەوەو لە خوارەوە بەرەو خوارتر دادەبەزێ. ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی کۆنگرێسی ئەمریکا رۆژی ٧/١١/٢٠٠٦، ریفراندۆمێک بوو لەسەر ئەو سیاسەتەو بەتەحدید لەمەڕ عێراق. ئەنجامی کەمەرشکێن بوو بۆ کۆمارییەکان و کارەساتێک بوو بۆ بۆش، هەرچەند ماوەی نێوان بەهاری ٢٠٠٣ و پاییزی ٢٠٠٦، کەمترە لە (٤) ساڵ: (گارنەر) رۆیی، (بریمەر) رۆیی، جۆن نگرۆپۆنتی باڵیۆزی ئەمەریکا لە عێراق رۆیی، جۆرج تنت سەرۆکی پێشووی CIA رۆیی، کۆڵن پاوڵ وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا رۆیی، یاریدەدەری وەزیری بەرگری ئەمەریکا ولفۆویتز رۆیی یەک رۆژ دوای هەڵبژاردنەکانی کۆنگرێس وەزیری بەرگری ئەمریکا (رامسفیلد) ناچار کرا دەست لە کار بکێشێتەوەو (زەلمای خەلیل زاد)یش رۆیشت. هەر هەموو ئەمانە هاندەرو نەخشەکێشی پرۆسەی رزگاری و داگیرکردن و شەڕی « العراق» و، کۆڵەکەو و جێبەجێکەری ئەو ئیستراتیجیەتە بوون بە (پلانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی گەورە)یشەوە، (ئەگەر نەخشەی وا هەیە).

لەم سەراوو دەراوەیشەدا، نە ئەمریکاو نە بەریتانیا بە فەرمی هیچ دیکۆمێنتێکیان نەداوە بەکورد وەکو (پەیمان) لە غەیری مافی هاوولاتیەتی عێراقی نەبێت، باقی تر قسەی خۆش و یەک تەرەفەیە ئەوەش بۆ دەرباز کردنی سیاسەتی رۆژەو حیسابی لەسەر نییەو، لە هەندێ بواریشدا تەرەفداری لایەنە بەرهەڵستکارەکانی کورد دەکەن یان فشار دەخەنە سەر کورد یان بێ هەڵوێستن...

مەزندەیش دەکرێت پاش کۆنترۆڵ کردنی کۆنگرێسی ئەمریکی لەلایەن دیموکراتەکانەوەو گەمارۆدانی ئەو سیاسەتە بێتە پێشەوە کە بۆش و کۆمارییەکانی گەیاندە ئێرەو، گۆڕانکاری تریش بەرێگەوەیە.

بۆش لە ماوەی قۆناغی کۆتایی سەرۆکایەتی کە لە کانوونی دووهەمی /٢٠٠٩ تەواو دەبێت و، بۆ پاراستنی ئابڕووی خۆی و دەرباز بوونی لەو بەسەرهاتانەی کە(نیکسون) یان (بیل کلنتون) کە کاتی خۆی تووشی بوون، یان ئەوەی تونی بلێر، دوور نییە پاشگەز بێتەوە لە لایەنێکی زۆری ئیستراتیجیەتەکەی. بەش بە حاڵی کورد واقیعی تازەی ئەمریکاو چارەنووسی ئەو ئیستراتیجیەتەو ناوەڕۆکی راپۆرتەکەی (بێکەر) گرنگە، دوور نییە پرشی ئەو گۆڕانکارییانە بەر کوردیش

بکەوێت. لەو مەترسییانە مەزەندەی (تەرحیل) کردنی لێ دەکرێ جێبەجێ کردنی ماددەی (١٤٠)ی دەستووری هەمیشەییە بەتایبەتی کێشەیی کەرکووک و ریفراندۆم و گەڕانەوەی تەعریبچییەکان و ناوچە دابڕاوەکانمان و سنووری کوردستان لە رێگای (وقف التنفیذ)ی یاسای هەرێمەکان وەک هەنگاوی یەکەم بۆ (١٨) مانگی دیکەش، هەروەها دوور نییە هەنگاوی دووهەم هەڵوەشاندنەوەی یاساکە بێت یان(تەرحیل) کردنی بێت بۆ دوای خولێکی تری هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی العراق و، خاوو لاوازکردنی ئەو مافانەی کە لە دەستووری هەمیشەیی تەسبیت کراوە، یان ئەوەی کە هەوڵ ئەدرێت لە پێداچوونەوەکەدا وەدەستی بێنێت، هەروەها بەلاوەنان و پاشگەزبوونەوە لە بە دیموکراتی کردنی العراق، لەپێناوی ئەولەویاتی ئەمن و ئاسایش و رزگار بوون لە زەڵکاوی ئەم شەڕو شۆڕە.
خەلیل زاد و هەندێ لە کاربەدەستانی ئەمریکا ماوەیەک بوو خەریکی ئەوە بوون شکستی سیاسەتی خۆیان و ئەو هەموو حەماقەتەی کە تاکو ئێستا پیادە کراوە، بیخەنە ئەستۆی خەڵکی عێراق و هەندێ لەلایەنەکانی، گوایە شەڕەکە لەسەر فیدراڵیەتە، یان لەسەر سەروەت و سامانە، یان دەسەڵات..هتد
گەشبینی باشەو خۆشە، بەڵام نەک تاکو ئاستی (افراط و تفریط). بۆیە کاتی ئەوە هاتووە ئەگەر درەنگیش نەبێت باشترو وردتر تاوتوێی رەوشەکە بکرێت و پێ لە جەرگی خۆمان بنێین و راستییەکان وەکو هەیە بە واقیعی ببینین، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت ئەبێ مرۆڤ دژی ئەمریکاو بوونی ئەمریکا لە عێراق لەقەڵەم بدرێت، یان بخرێتە پاڵ تیرۆریستان، یان تەخوین بکرێت، هەندێ لە لایەنەکانی عێراقی بەوانەشەوە کە دەستکردی ئەمریکان بەعەلمانی و غەیرە عەلمانیانەوە بەخۆیاندا دەچنەوە، زۆریان پاشگەزیش دەبنەوەو هێزو وڵاتانی تریش هەروەها، لایەنەکانی ئیدارەی بۆش و بلێر چاو بە هەڵوێست و سیاسەتی خۆیاندا ئەخشێنن و رۆژانە شتی نوێ کەشف دەبێت و بڵاودەبێتەوە، چ وەکو کارتی فشارو، چ وەکو هەڵوێست. بۆ ئێمەی کورد سڵ لە پێداچوونەوە بە سیاسەت و هەڵوێست و کردەوەکان و درکاندنی راستییەکان بکەین و، گوێ لە نیگەرانی خەڵکی کوردستان نەگیردرێت و بە هانای داخوازییەکانی خەڵکەوە نەچین و، بۆ ئەم خەڵکە بەراست و دروستی هۆشیارو ساز نەکرێتەوەو ئامادەباش نەکرێت بۆ هەر گۆڕانکارییەک، مەگەر هەر ئەو خەڵکە نییە

که کەرەسەو سوتەمەنی گۆڕانکارییەکانن، تا کەی سەرکردایەتی سیاسی کورد کورت بینی و هەڵە زاتییەکانی خۆی دەخاتە ئەستۆی هەل و مەرجە بابەتییەکان...؟!
لە دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق کۆمەڵێک ماف و پرنسیپی باش تەسبیت کراوە، چ لە بەشە گشتیەکانی و، چ ئەوانەی تایبەتمەندن، بە هەموو کەم و کورتییەکانیانەوە، بە مەبەستی موشەڕیعیش، کە زۆرینەی عەرەبی عێراقی بالادەستە. لایەنە ئیجابییەکانی ئەم دەستوورە، بە «گشتی»و بە «تایبەتیەکانیەوە» نکۆڵی لێ ناکرێت، بەڵکو دەروازەیەکی پان و بەرینە بۆ پیادەکردن و چاکسازی و گەشەپێدانی. شان بەشانی ئەمەش ماددەو بڕگەیەکی زۆری تێدایە قابیلی گۆڕین و چاکسازی و هەڵوەشانەوەیە، چ ئەوانەی فەرز کرابێت، یان بەسەردا تێپەڕ بووبێ، یان نا دروستی لەحاڵی بوونی ناوەڕۆکی دەق و مەبەستی موشەڕیع فەرزی کردبن.
پێداچوونەوە بە دەستووری هەمیشەیی العراق دەرفەتێکی ترە، بۆ ئەوەی ئەم هەلەش لە دەست نەدرێت، سەرکردایەتی سیاسی کورد، پاش پتەوکردنی ناوماڵی خۆی و یەکێتی ریزەکانی خەڵکی کوردستان، چەند کارتێکی باشی بەدەستەوەیە لەوانە:

یەکەمیان: گیروگرفتی زیاتر لە ۸۰ ساڵی ژیانی بێ ئارەزوو و بە زۆرلکاندن و پێکەوە گرێدراو بەم قەوارەیەوە، کە پێی ئێژن (العراق)، بە هەموو شێوەکانی زوڵم و زۆرو قڕکردن و نەهامەتی و نسکۆ و تێکدانی ژێرخانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و کلتووری و شێواندنی سەرخانەکەشی، هەروەها ئەزموونی زیاتر لە۳ ساڵی پاش رزگاری (العراق)و پێکەوە دامەزراندنەوەی و، بەشداریی کاریگەر لە (۳) حکومەتەکەی پاش ئەو قۆناغەو، گشت کۆسپ و تەگەرەکانی سەر رێی پراکتیزەکردنی ماددەو بڕگەکانی بڕیارەکانی دەسەڵاتی داگیرکەری ئەمریکاش، «بریمەر»، کە هێزی «دەستووری هەبوو»و، هەردوو دەستووری دوای قۆناغی رزگاری و داگیر کردنی العراق (یاسای ئیدارەی دەوڵەتی عێراق بۆ قۆناغی گواستنەوەو دەستووری هەمیشەیی العراق)، بە تایبەتی کێشەی پێناسەکردنی (العراق)و، مافی چارەنووسی کوردود خودی پێناسە کردنی «فیدراڵیەت» و تەعریب و سنووری هەرێمی کوردستان و، هێزی پێشمەرگەو، دەسەڵاتی هەرسێ دەزگای هەرێمی کوردستان «یاسادانان و کارگێڕی و دادوەری »و،

سەروەت و سامانی وڵاتەکەمان و، بەشی هەرێمی کوردستان لەبودجەی ناوەندو، زمانی کوردی و بەشداری لە دەسەڵاتی ناوەند....هتد

ئەم تاقیکردنەوەو پێکەوە کارکردن و ئەم بەشدارییە گەرم و گوڕە بێ مەرجانەی کورد، ئەم دەستوورەی لێ کەوتەوەو، ئەو واقیعەی بۆ دروست کرد، کە تیایدا کورد لەسەر ناسنامەی رەگەزی تیرۆر دەکرێت و، لە مووسڵ و کەرکوک و بەغداو زۆر جێگای تری ئەم (العراق)ـە خوێنی حەڵاڵ کراوە، زۆر لەو مافانەش کە لە دوو دەستووری پاش رزگاری العراق سەلماندرابوو، سەرپێچی دەکرێت لە جێبەجێ کردنی و هەوڵی پاشگەزبوونەوەش روونە.

مافی لایەنی کوردییە کارەساتەکانی بەهەند وەربگیردرێت و واقیعی ئەمڕۆیشی لە بەرچاو بێت، نەک تەنها بە رێگا گرتن لە پاشگەزبوونەوە لەوەی کە لە دەستووردا هاتووە، بەڵکو هەموو کۆسپ و لەمپەرەکانی نێو ماددەو بڕگەکانی لابدرێت و بە دەقی دەستووری روون گەرەنتی بکرێت و، هەموو ئیمکانیاتی خۆی بەکار بێنێت لە پێناو زامن کردنیان.

دووهەمیان: (ریفراندۆم)ـە؛ کە بە پێی خودی دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق ئەو گۆڕانکارییانە کە لیژنەکە پێشنیاری دەکات و ئەنجومەنی نوێنەران پەسندی دەکات دەبێت گەلانی العراق لەرێگای ریفراندۆمەوە پەسندی بکەن. لەم بارەیەوە (زۆرینەی دەنگدەرانی (٣) پارێزگا ئەگەر دژی بن ئەوە سەر ناگرێت). ئەم کارتەش بەدەستی خودی سەرکردایەتی سیاسی کوردەوەیە، وەکو ماف و وەکو فشارو، وەکو یەک لەئامرازەکانی گەمە دیموکراسییەکەی قۆناغی داهاتووە، بەڵام دیاریشە کە تەنها بۆ یەک جارە، لەوەیش گرنگتر گشت ماددە هەموارکراو، یان زیاد کراوەکانە، کە وەکو یەک (پاکێت) دەخرێنە دەنگدان...!

سێهەمیان: هەڵوەسانی بەشداری، یان کشانەوەی کوردە، لەدەسەڵاتی ناوەندو، جەخت کردن لەسەر ریفراندۆمێک لە کوردستان لەمەڕ بڕیاردان لەسەر مافی چارەنووسی خۆی، لەژێر چەتری هاوپەیمانان و چاودێری دام ودەزگا نێودەوڵەتییەکان و، لەرێگای خەباتێکی مەدەنی و دیموکراتی و شارستانی هەمە چەشنەو دوور لە توندوتیژی و، ئەگەر ناوەندی بەغدا، یان دەسەڵاتی هاوپەیمانی ئەمریکی، کە لە واقیعدا هێشتا ئەوان خاوەن بڕیارن، یان دام و

دەزگا نێودەوڵەتی و مرۆڤایەتییەکان، هاوکار نەبن، ئەوە حکومەتی هەرێمی کوردستان بە هاوکاری رێکخراوە مەدەنییەکانی کوردستان ئەنجامی بدات. ئەگەر سەرکردایەتی سیاسی کورد هەڵوەسان، یان کشانەوە لە دەسەلاتی ناوەند لەبەرژەوەندی پرۆسەکە نازانێت، ئەوە بابگەرێتەوە بو رای خەڵکی کوردستان لەرێگای ریفراندۆمێکی ئازاد سەبارەت بە هەڵوێست لە دەسەلاتی ناوەندو چارەنووسی خۆیان...

خستنەروو و ئامادەکردن و بگرە هەرەشە کردن بە کارتی (دووهەم)و (سێهەم) جۆرە فشارێکە بۆ ئەوەی داخوازی و مافەکانی کورد لەقۆناغی لیژنەکەو ئەنجومەنی نوێنەران بە هەند وەربگیردرێت و تێپەڕ بێت. کەس حیساب بۆ مردوو ناکات و، گوناهێکی گەورەیە نەتەوەیەکی زیاتر لە (٣٠) ملیۆن کەس و خاوەن کێشەیەکی رەواو لەم سەردەمەدا بەم شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێت و، بۆش بۆ باشووری (حکم زاتیەک)یش پێی قایل نەبێت بۆ؟، چونکە، تورکیاو سوریا زیز دەبن.....! بۆیە پێداچوونەوە بە دەستووری هەمیشەیی العراق و مافی ریفراندۆمی ئاییندە، بە پێداچوونەوە بە سیاسەت و کردەوەی پاش قۆناغی رزگاری (العراق) هەلێکی تری زێرینە لە بەردەم سەرکردایەتی سیاسی کورد بۆ چارەسەری گرفتەکان و گۆڕین و چاکسازی لەو خالانەی کە باسمان کرد، یان برگەو خالی تریش، چونکە دوور نییە ئیدی هەلی وای بۆ هەڵنەکەوێتەوەو، ئەگەر ئەم جارەش لە دەستی بدا ئەوا گومان هەیە لەوەی خەڵکی کوردستان بە ئاسانی و بۆ جارێکی دیکەیش لێی خۆشبێت. هەلیش وەک تیغ وایە نەیبریت دەتبرێت.

# پێشەکی*

زۆربەی هەرە زۆری پسپۆڕانی میانی نەوت، کۆکن لەسەر ئەوەی کە کۆماری (العراق):

* بە فەرمی دووهەم وڵاتە لە رووی (یەدەگی) نەوت، (تەنها حیسابی یەدەگی سابت کراوە) کە (١١٥) ملیار بەرمیلە، بە حیساب کردنی یەدەگی (محتمل) (١٥٠) ملیار بەرمیل و، (١٠٠) ملیار بەرمیل یەدەگی مەزەندە کراوی (ئایندە)، ئەوە قەبارەی یەدەگی نەوتی العراق لە (٣٠٠) ملیار بەرمیل تێدەپەڕێت، بەمەش ئەم (العراق)ـە دەبێتە یەکەم وڵات لە جیهان سەبارەت بە یەدەگی نەوت.
* تێچووی (کولفەی) دەرهێنانی نەوتی (العراق) زۆر کەمە بە بەراورد کردنی لەگەڵ وڵاتانی تر، چونکە زۆربەی زۆری نەوتی (العراق)، بەتایبەتی نەوتی (کوردستان)، لە بیرەکاندا، لە قوڵاییەکی کەمدان و، لە ژێر فشارێکی زۆر گەورەدایە و، قەبارەی نەوتەکەشیان زۆرە. بۆ نموونە: تێچووی دەرهێنانی یەک بەرمیلی نەوتی العراق کەمترە لە (٣) دۆلار، لە کاتێکدا تێچووی یەک بەرمیلی نەوتی ئەمریکی لە (١٢) دۆلار زیاترە.
* نەوعیەتی زۆربەی زۆری نەوتی کێڵگەکانی (العراق) نەوتی (سوکە = خفیف) یان سوکی قورس = الخفیف الثقیل)، واتە ئەو نەوعە نەوتەیە کە رێژەی (گۆگرد و ئاسن و خوێ...هتد)ی زۆر کەمە، ئەمەش وای کردووە کە قۆناغی پاڵاوتنی زۆر کورت و ئاسان بێت، بە بەراورد کردن لەگەڵ نەوتی خاوی زۆر لە وڵاتانی نەوتدار.
* زۆربەی هەرە زۆری کێڵگە نەوتییەکانی (العراق) دۆزراوەتەوەو، کێڵگەکانیشی دیاری کراون و مەزەندەی یەدەگی (سابت و موحتەمەل بگرە ئایندەیشی) بۆ کراوە.

---

* ئەم پێشەکییە وەکو وتار لەژێر ناونیشانی (خوێندنەوەیەکی بە پەلەی پرۆژەی یاسای نەوت و گازی کۆماری العراق) لە رۆژنامەی «هاوڵاتی» ژمارە «٣٢٤» لە ٢٠٠٧/٥/٢ بڵاوکراوەتەوە.

ژمارەیەکی بەرچاو لە پسپۆڕانی بواری نەوت مێژوونووسان و، ڕۆژهەڵات ناسان، (نەوت) بە یەک لە هۆکارە بنەڕەتییەکانی داگیر کردنی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و سەرچاوەکانی دادەنێن لە سەرەتای سەدەی ڕابردوو، بنەمای ڕێککەوتننامەی (سایکس - پیکۆ ١٩١٦) بوو، سەبارەت بە دابەش کردنی ئیمپراتوریەتی عوسمانی لە نێوان بەریتانیاو فەرەنسا....

لە حاڵەتی ئێمەدا، زۆری و مسۆگەر بوونی نەوتی ولایەتی مووسڵ (کوردستانی باشوور)، فاکتەرێکی سەرەکی بوو بۆ داگیر کردنی ولایەتی بەسرەو بەغداو پاشتر ولایەتی مووسڵ لەلایەن بەریتانیاو، دابەش کردنی کوردستانی گەورەمان لە دووبەشەوە بۆ چوار بەش و، کوردستانی باشوورمان بلکێنێتەوە بە کیانێکی داتاشراوی خۆی کە ناوی لێ نا (عێراق)و، بە پێی بەرژەوەندی خۆی و هاوپەیمانانی، مەرجی چۆنیەتی ئیستغلال کردنی سەروەت و سامانی نەوت فەرز کات بە سەر حکومەتە دەستکردەکەی خۆی و، بە پێی گرێبەستەکانی کۆمپانیا زەبەلاحەکانیان، ئەو سەروەت و سامانە تالان بکەن و بەشی شێر بۆ ئەوان بێت و، ئەوەشی بۆ دەسەڵاتی (عێراق) دەمایەوە، زۆری بۆ قایم کردنی خۆیان بوو، بە کڕینی چەک و تەقەمەنی و، دامەزراندنی دام و دەزگا داپڵۆسێنەرەکانیان، وەکو سوپاو پۆلیس و ئیدارەیەکی مشەخۆرو گەندەڵ....

قۆناغی بیستەکان تاکو سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، قۆناغی بەربەرەکانی و تێکۆشان بوو دژی ئیستغلال کردنی نەوتی عێراق لەلایەن کۆمپانیا بیانییەکان و، فشار خستنە سەر ڕژێمە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق، کە لە زۆر ڕووەوە نوێنەرو پیادەکەری جەمسەری ئینگلۆ ئەمریکی و، بەرژەوەندییەکانیان بوون و، کۆمپانیاکانیشیان هێماکەیان.....

بەڵام سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردوو، بارودۆخ گۆڕاو، ئەو بەرژەوەندییانە بە فەرمی تەحجیم دەکراو، کەرتی نەوت زیاتر بەرەو خۆماڵی کردن هەنگاوی ئەنا، بە تایبەتی یاسای (٨٠)ی ساڵی ١٩٦١و، یاسای دامەزراندنی کۆمپانیای نیشتمانی نەوتی عێراق و، یاساکانی خۆماڵی کردنی نەوت لە ساڵانی ١٩٧٢و ١٩٧٥.

ئەو گۆڕانکارییە لە بواری ڕزگار کردنی نەوتی (عێراق) لە چنگی کۆمپانیا بیانییەکان لە هەل و مەرجی خۆیدا، وەرچەرخانێک بوو، لە مێژووی عێراق و

ناوچەکەو، لە ئاستی ولاتانی بەرهەمهێنەری نەوت و خودی بازاری نەوتی جیهانیدا. بەلام دەرهاویشتەی (افرازات)ی زیاتر لە نیو سەدەی داگیر کردن و گرا و نەخۆشییەکانی و، هەوابەستەکی توێژەیەکی بەرچاوی سەرانی عێراق و تێکەڵ بوونیان لەگەڵ ئەو بەرژەوەندییانە و دروست بوونی دام و دەزگاکانی دەوڵەتی عێراق لەسەر ئەو بنەمایانەو، زیاد بوونی داخوازی لەسەر نەوت و بەرزبوونەوەی نرخی، وای کرد تاکو دەهات ئەم کالایە گرنگ تر دەبوو، هەروەها داهاتەکەشی زۆرتر دەبوو و، بە شێوەیەکی خراپیش خەرج دەکرا....

ئەم واقیعە، دیاردەی (دیکتاتۆریاتی نەوت)ی هێنایە وجوودو، لە خەسلەتەکانی ئەم (دیکتاتۆر)انە ئەوە بوو:

١. زۆربەی هەرە زۆریان یان دەستکردی رۆژئاواو ئەمریکا بوون یان هەوادار و، ئەو بلۆکە جیهانییە هاوکاری و پشتگیریانی لێ دەکردن و، ئەو پشتگیری و هاوکارییە بۆ زۆربەی زۆری ئەوانە تاکو ئەمرۆ بەردەوامەو، ئەوەشی لێیان هەڵگەرابێتەوە بە هەموو شێوەیەک هەوڵی لەناوبردنیان داوە تاکو رادەی پلانی کودەتاو داگیرکردنی ولاتەکەی. چونکە لەلایەکەوە ئەو رژێمانە زامنی ناردنی نەوتن بۆ بازاری ئەوان و نەوتیش شادەماری ژیانی پیشەسازی و ئابوورییانەو، بازاری ولاتانی نەوتدار باشترین مەیدانی بازرگانییە...

٢. دەرئەنجامە نێگتیڤەکانی ئەو پشتگیرییەو ئیستغلال کردن و بەکارهێنانی ئەو داهاتەو کۆنترۆڵ کردنی و خەرج کردنی بە شێوەیەکی رەها لەلایەن سەرانی ئەو رژێمانە، وای کرد، کە پەیوەندی داهاتی نەوت لەگەڵ زوڵم و زۆرو توندوتیژی و گەندەڵی و رەوتی تاکرەوی و دیکتاتۆریەت و فاشیەت پەیوەندییەکی (راستەوانەیان) لەگەڵ یەکتردا هەبێت. رژێمی نەفرەت لێکراوی سەدامی گۆڕبەگۆڕ، تەعبیرێکی وردو دروستی ئەم هاوکێشەیە بوو و، رێک هێمایەکی شازی ئەو دیاردەیەن و، (خەڵکی کوردستان و کوردستانی باشوورمان)یش کێڵگەیەکی تاقیکردنەوەی زەق و زیندووی دەرئەنجامەکانیەتی و، چوار ساڵ بە سەر رمانی ئەو رژێمە تێپەڕ بوو، عێراق کەوتە قۆناغێکی نوێتر، وەلێ تاکو ئێستاو، دوور نییە تاکو ماوەیەکی دوورتریش، گەلانی عێراق وا بە ئاسانی لەو هاوکێشەیە رزگار نەبن.

بۆیه زیادەڕۆیی نییه ئەگەر هاتوو پێناسەی مێژووی عێراق بکەین به درێژایی سەدەی رابردوو و، تاکو ئەمڕۆیش، به قۆناغی ململانێ و بەرخودانی گەلانی عێراق دژی بەرژەوەندییەکانی ئیستراتیجی زلهێزەکان به تایبەتی بەریتانیاو ئەمریکا، به داگیرکردنی عێراق له پاش ساڵی ٢٠٠٣ لەلایەن ئەمریکاو هاوپەیمانانی، جارێکی دیکه کێشەی نەوتی هێنایه سەر شانۆی ململانێ.

پرۆژەی یاسای نەوت و گازی کۆماری العراق له ٢٠٠٧/٢/١٥ لەلایەن ئەو لیژنەیه که راسپێردرابوو کاری لەسەر بکەن تەواوبوو و، درا به ئەنجومەنی وەزیرانی ناوەندی بەغدا، پاش پەسەند کردنی نێردرا بۆ ئەنجومەنی نوێنەران...

پرۆژەکه بریتییه له (پێشەکییەک «الاسباب الموجبه») و (٤٣) ماددەو (٤) پاشکۆ (ملحق) و ماددەکانیش دابەش کراون به سەر (٨) بەش (فصل).

بەشی یەکەم: مەرجه بنەڕەتییەکان (الشروط الأساسية) له مادده(١-٤)ـه.

بەشی دووهەم: بەڕێوەبردنی سەرچاوه نەوتییەکان (ادارة المصادر النفطية) له مادده (٥-١٢)ـه.

بەشی سێهەم: چالاکی تنقیب و گەشەپێدانی کێڵگەکان (نشاط التنقيب وتطوير الحقول) له مادده(١٣- ٢٠)ـه.

بەشی چوارهەم : گواستنەوه (النقل) له مادده(٢١-٢٢)ـه.

بەشی پێنجەم: گاز (الگاز) له مادده (٢٣- ٢٦)ـه.

بەشی شەشەم: کاروباری رێکخستن (الأمور التنظيمية) له مادده (٢٧-٣٢)ـه.

بەشی حەوتەم: سیستمی دارایی (النظام المالي) له مادده (٣٣-٣٥)ـه.

بەشی هەشتەم: مادده جیاجیاکان (المواد المتفرقة) له مادده (٣٦-٤٣)ـه.

نەخشەی سیاسەتی نەوتی عێراق، هەر وەکو له دیدارێکماندا لەگەڵ رۆژنامەی (هاوڵاتی) ئاماژەمان بۆ کرد، لەلایەن ئەمریکاو هاوپەیمانانی، پێش داگیرکردنی عێراق کاری بۆ کراوەو، له ساڵی ٢٠٠٤ بەملاوه به جیدی ئیشی لەسەر کراوەو، ناوەڕۆکی جێگای باس و لێکۆڵینەوەی پسپۆڕان و ناوەندە ئابووری و پیشەسازی و کۆمپانیاکانی نەوتی جیهانی بووه، به تایبەتی له ئەمریکاو بەریتانیاو، له ژێر چاودێری و هاندانی ئیدارەی بۆش و، زۆرجار له میدیاکانی خودی ئەمریکاو بەریتانیاو وڵاتانی دیکەی ئەورووپا باسی ئەم پرۆژەیه کراوەو جەمسەرکانی شی کراوەتەوه.

به پێچەوانەی ئەوەی سەرەوە، لە عێراق بە گشتی و کوردستان بە تایبەتی، بە دەر لە بازنەیەکی تەسکی دەسەلاتی ناوەندی بەغداو دەورو بەریان، کە لە نێو مەسەلەکەدا بوون یان زانیارییان پێ دەگەیشت لەمەڕ چۆنیەتی دارشتنەوەی ئەو پرۆژە یاسایەو تەنگوچەلەمەکانی، چ زانیارییەکی وەهای لەسەر بلاونەکراوەو پرۆژەکە ئەگەر چ بۆ بێگانە نهێنی نەبوو بەلام، بۆ گەلانی عێراق و رۆشنبیران و ناوەندو دەزگا فەرمییەکان و رێکخراو و مەلبەندەکانی کۆمەلگای مەدەنی تەلەسم و نهێنییەکی سەیر بوو. بۆیە هەر پاش بلاوبوونەوەی پرۆژەکە، رووبەرووی هەلمەتێکی رەخنەو باس و توێژینەوەی هەمە لایەن و هەمە چەشنە بووەوە. سەرانی فەرمی کوردستان ئەگەر چی لە سەرەتاوە هەندێ زانیاری گشتی و کەمیان دزە پێ دەکرد بۆ راگەیاندنەکان، کە پرۆژەکە ئاشکرا بوو، رایانگەیاند کە گرفت نەماوە لە نێوان هەرێم و ناوەندی بەغداو پرۆژەی یاساکە ماف و داخوازییەکانی لایەنی کوردستانی مسۆگەر کردووە. پێش ئەوەو تاکو ئێستایش روون نەکراوەتەوە خالی ناکۆکی و جیاوازی لە نێوان داخوازی ئەوان و پرۆژەکە چی بووەو چۆن چارەسەر کراو، راگەیاندنی کوردستانیش، نە لە پێش و نە لە پاش ئاشکرابوونی پرۆژەکە، نزیکی ئەم کێشەیە نەدەبوونەوەو، ئەگەر لە نێو باسەکانیاندا ئاماژەی بۆ کرابێت، ئەوە زیاتر پۆزەتیڤانە بووە.

شایەنی باسە لە سەرەتای ئاشکرا بوونی پەسند کردنی ئەم پرۆژەیە لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانی ناوەندی بەغداو، لە سەرەتای ئەو هەلمەتە (چاودێر) کە نووسەرێکە جار جار وتاری بە پێزو گرنگ لەمەڕ، گەندەلی ئابووری و مامەلەی ئیدارەی داگیرکەری ئەمریکی لەم بارەیەوە، لە (التاخی) ئەنووسێ لە بابەتێکیدا داوای لە (التاخی) کرد، مەودا بدات رۆشنبیران و پسپۆران ئەم پرۆژەیە باس بکەن و شی بکرێتەوە وەکو تەوەرێکی تایبەتی. تاکو ئێستایش ئەو داخوازییە جێبەجێ نەکرا. ئەم گۆشەگیری و دووره پەرێزییەی لایەنی کوردستانی لە کێشەیەکی وەها گرنگ و چارەنووسساز، سەرنج راکێشە..!

پرۆژەکە بە گشتی کۆمەلێک پرنسیپ و ناوەندو شێوەو شێوازی نوێی تێدا بەدی دەکرێت، بەلام بۆ جەمسەرە سەرەکییەکانی کەرتی پیشەسازی نەوت و، بۆ ولاتێکی وەکو (العراق) هەنگاوێکە بەرە دواوەیە، بە ئومێدی ئەوەی رۆشنبیران و پسپۆرانی مەیدانی ئابووری نەوت بە تایبەتی، ئەم پرۆژەیە شەن و کەو بکەن و، هاوولاتیانی کوردستانی پێ ئاگادار بکەنەوە...

ئەوەی زیاتر لای بەندەو، لەم بوارە گرنگە: مافی خەڵکی کوردستانە و چۆنیەتی رەنگدانەوەیەتی لەو پرۆژە یاساییە، لەم بارەیەوە هەوڵ ئەدەین بە پێی ئیمکان وەکو چاودێرێک و، لەسەر رۆشنایی ناوەرۆکی ئەو پرۆژەیەو (٤) پاشکۆکەی کە لە میدیا بیانییەکان وەدستمان کەوت، تاوتوێیان بکەین و، بۆ خەڵکی خاوەن کێشە و ستەمدیدی کوردستان روونی بکەینەوە.

هەر وەکو ئاماژەمان بۆ کرد ئەم پرۆژە یاسایە، کۆمەڵێک لایەنی باش و پۆزەتیڤی تێدا بە دی دەکرێت و لەو دیدارەماندا لە (هاوولاتی) باسی پوختەکەیمان کرد. لەگەڵ ئەوەش هەر لە سەرەتای راگەیاندنی پرۆژەکە بە فەرمی رەخنەیەکی زۆری ئاراستە کرا. بەم چەند خاڵە هەوڵ ئەدەین پوختەی هەندێ رەخنە لەسەر کەم و کورتی پرۆژەکە بخەینە روو کە ژمارەیەکی زۆر لە پسپۆڕانی میانی نەوت و ئابووری دەرەوەو ناوەوە تاکو حەدێک کۆکن لەسەری و لەوانە:

١. یەک لەو رەخنانە کە ئاراستەی ئەم پرۆژەیە دەکرێت ئەوەیە کە (کاتی راگەیاندنی موناسب نییە). ئەم (موناسب نییە)یش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەم پرۆژە یاساییە پشت بەستە بە چەند ماددەیەکی دەستووری و، دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق، بە پێی ماددەی (١٤٢)ی لە قۆناغی پێداچوونەوەیە بە گشت ماددەو بڕگەکانی لەلایەن لیژنەیەکی سەر بە ئەنجومەنی نوێنەرانی العراق و، ماوەی یەک ساڵی بۆ دیاری کردووەو هێشتا نە لیژنەکە لە کاری خۆی نەبووەتەوەو، نە ئەنجومەنی نوێنەران بڕیاری خۆی لەسەر داوەو نەخەڵکی (العراق) پەسندی کردووەو، نەوت و سامانی نەوت و چۆنیەتی ئیستغلال کردنی، بابەتێکی سەرەکی مشتومڕی لایەنە بەرهەڵستکارەکانی دەستووری هەمیشەیی (العراق) بوون وەکو خاڵێکی خیلاف، ئەم بابەتەو هەندێ کێشەی دیکە بووە هۆکاری سەرەکی ماددەی (١٤٢). واتە پێداچوونەوە بەو دەستوورە. دەرچواندنی ئەم یاسایەو بەو شێوەیە دوور نییە خیلاف و ناکۆکی قووڵ و فراوانتر بکات...

٢. لایەن و کەسانی وەها هەن کە لەو باوەڕەدان لە کاتێکدا ئەم پرۆژە یاسایە دارێژراوەتەوەو حکومەتی ناوەند پەسندی کردووەو نێردراوە بۆ ئەنجومەنی نوێنەران، کۆماری (العراق) هێشتا بە فیعلی داگیر کراوە لەلایەن هێزەکانی ئەمریکاو هاوپەیمانانی و، ناوەندەکانی بڕیاری ئیدارەی (بوش) هێڵە

سەرەکییەکانی ئەم پرۆژەیەیانە داناوەو، هەر ئەم ناوەندانە پەلەی لێ دەکەن و فشار دەکەن بۆ ئەوەی کەرتی نەوت و کێڵگەکانی لەسەر گازی پشت بکرێتەوە بۆ کۆمپانیا بیانییەکان، ئەمەش لە بارودۆخی ئەمڕۆی ئەم (العراق)ـە دروست نییە. ئەندامێکی کۆنگریسی ئەمریکی (دینیس کیسینیش) لە حزبی دیموکرات، لە لێدوانێکیدا وەک رادیو (سەوا) لە ٢٠٠٧/٣/١٥دا رایگەیاند، نیازی وایە داوا بکات لە کۆنگریس سەبارەت بە دەرئەنجامەکانی ئەو خشتە زەمەنییەی کە فەرز کراوە لەسەر حکومەتی العراق بۆ چاکسازی، واتە هەر وەکو خۆی ئەڵێت: (اعادة النظر في العواقب المترتبة على فرض جدول زمني على الحكومة العراقية لاجراء اصلاحات، اهمها سن قانون جديد يفتح الباب للشركات الأجنبية للأستثمار في مجال النفط) و، لە ژمارەی رۆژی (٢٠٠٧/٣/١٤)ی نیویۆرک تایمز، (کیسینیش) وتویەتی: (ان قانون النفط الجديد يشمل بندا يضمن لشركات النفط الأجنبية معاملة مماثلة للشركات العراقية ولا يعطي اي أفضلية للشركات العراقية، سواء كانت خاصة أم حكومية...)، سەبارەت بە هەڵوێستی ئەمریکا هەر لە میانەی قسەکانی (کیسینیش) ئەڵێت: (على الولايات المتحدة أن لا تجبر العراق على فتح حقوله النفطية امام الشركات الأجنبية كشرط على أنهاء الأحتلال، وان اصرار الولايات المتحدة على سن قانون جديد للنفط ليس له اي علاقة بمصلحة الشعب العراقي..). گومان نییە لەوەی کە ئەم وڵاتە داگیر کراوەو، ئەو داگیرکردنەیشە دەرئەنجامی خراپی لێ کەوتوەتەوە، هەر وەکو سەرۆکی شاندی العراق بەڕێز (جەلال تاڵەبانی)، سەرۆک کۆماری العراق، لە وتەکەیدا بەرامبەر بە سەرانی عەرەب و میوانەکانی کۆنگرەی ژمارە(١٩)ی لوتکەی عەرەب لە (ریاض)ی پایتەختی عەرەبستانی سعودی کە لە کۆتایی مانگی رابردوودا گیرا، جەختی لەسەر کرد، وتی (ان تحرير العراق تحول الى احتلال مع نتائج وخيمة)و، هەر لەم بارەیەوە شای عەرەبستانی سعودی بەڕێز (شا عەبدوڵڵا) لە وتەکەیدا بەرامبەر ئەو کۆنگرەیە هەمان مەبەستی پێکا، وتی (ان العراق يقع تحت احتلال غير مشروع...)، کە وڵاتێکیش داگیر کرابوو بڕیاری بە دەستی خۆی نییە.

٣. هەندێ لە پسپۆڕانی بواری نەوت و سیاسەتمەدارانی ناوەوەو دەرەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن کە هەندێ ماددەو پێگەی ئەم پرۆژەیە جیاوازییەکی زۆر گرنگی هەیە لە دەقی ئەصلە (ئینگلیزییەکەی)و دەقە (عەرەبییەکەی). واتە ئەو دەقە عەرەبییە کە دراوە بە ئەنجومەنی نوێنەرانی العراق و چەند رۆژنامەو سایتی عەرەبی و بیانی بڵاویان کردووەتەوە. ئەو جیاوازییانە کە ئاماژەیان بۆ کراوە. جیاوازییەکان زۆرن و جێگای مەترسین، بە تایبەتی هەندێ لە سەرچاوە خەبەرییەکان جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە دەقە ئینگلیزییەکەی لەلایەن لیژنەکەوە ئیمزا کراوە، وەکو دەقی (موعتەمەد)، وەلێ ئەوەی تاکو ئێستا ئەنجومەنی نوێنەرانی العراق لەسەری ئەڕوات سەبارەت بە (دەقی یاسایی موعتەمەد) (دەقی عەرەبیە). شایەنی باسە تاکو ئێستا (دەقی کوردی) نەبووەتە دەقێکی (موعتەمەد)، ئەمەش کەلێنێکی گەورەیە لە بواری یاسادانان و مافێکی دەستووری کورد. بە هەر حاڵ ئەگەر خیلافی وەها هەبێت لە نێوان هەردوو دەق(ئینگلیزی)و (عەرەبی) پێویستە چارەسەر بکرێت و ئەو جیاوازییانە نەمێنێت...

٤. بە پێی برگە (ث)ی ماددەی (٤١)ی ئەم پرۆژەیە چۆنیەتی چارەسەرکردنی ناکۆکی لە نێوان کۆماری العراق و، وەبەرهێنانی بواری نەوت، بە دەر لە دەسەڵاتی دادوەری العراق، هەر وەکو لە دەقی ئەو برگەیەدا هاتووە (يتم اجراء التحكيم بين جمهورية العراق والمستثمرين الأجانب حسب أنظمة اجراءات التحكيم لغرفة التجارة الدولية في باريس او جنيف لتسوية النزاعات بين الدول ومواطني دول اخري......). (ئیستسنا) کردنی وەبەرهێنەرە بیانییەکانی (تاک) یان (کۆمپانیا)، لە ئەحکامی یاساو ڕێساکانی العراق، چ ئەوەی هەیەو چ ئەوانەی کە لە ئایندە دەردەچێت، سەبارەت بە ناکۆکییەکان، تەجاوزە لەسەر سەروەری یاساو لە سوودی گەلانی العراق نییە، بە تایبەتی (ژووری بازرگانی نێودەوڵەتی پاریس یان جنێڤ) بۆ نەهێشتنی خیلافات، دەزگایەکن تەنها بە چاوی بازرگانی تەماشای کێشەکان دەکەن و حیساب بۆ یاساو ڕێسا ناوخۆییەکان یان بەرژەوەندی باڵای وڵاتێکی وەک العراق ناکەن، ئەمەیش لە واقیعدا جۆرە پاشگەزبوونێکە لە سەربەخۆیی وڵات و بنەما دیموکراتییەکانی نێو دەستوور، کە لایەنە پەیوەندارەکان هەمیشە جەختی لەسەر ئەکەن و سیستمی العراق بە سیستمێکی دیموکراتی ناوزەد دەکەن...!

٥. ئەم پرۆژە یاسایە هەر وەکو وتمان پشتی بەستوە بە کۆمەڵێک ماددەو برگەی دەستووری هەمیشەیی العراق. لە دەستووریش زەمینە خۆش کراوە بۆ (خصصە) کردنی کەرتی نەوت. خصصە کردنی کەرتی نەوتیش دوو کێشە دەخاتە روو یەکەمیان: پابەندبوون بە بنەماکانی بازاڕ (مبادئ السوق)و، دووهەمیان: هاندانی وەبەرهێنان (تشجیع الاستثمار)و، هەردوو کێشەکەش لێرەدا روونە ئەویش (کردنەوەی دەرگای (العراق)ـە بەرامبەر کۆمپانیا تایبەتییەکان «الشرکات الخاصە»). تاکو ئێرە دوور نییە بۆ کەسانێک کە دوور بن لە واقیعی کەرتی نەوتی العراق و ئەو سەروەتەی کە هەیەتی و، ئەوەش کە هێشتا ئاشکرا ناکرێت مەقبوول بێت، وەلێ کە هەندێ ورد دەبینەوە لەکۆی گشتی یەدەگی نەوتی العراق (سابت و محتمل و ئایندە) کە مەزەندە دەکرێت بە زیاتر لە ٣٦٥ملیار بەرمیل (١١٥+١٥٠+١٠٠) و، ژمارەی کێڵگەکانی کە زیاترە لە (٨٠) کێڵگەو ئەوانەی کە ئێستا لە کارن و ئیستغلال دەکرێن (١٧) کێڵگە، وێنەکە زیاتر روون دەبێتەوە. بەم پێیە: یەدەگی سابتی نەوتی ئەو (١٧) کێڵگەیە (کە سنووری «٤٠٪»ی کۆی گشتی یەدەگی سابتی نەوتی العراق پێک دێنێت (١١٥م.ب) لە سنووری ٤٦ ملیار بەرمیلەو، یەدەگی سابتی باقی تری ئەو کێڵگانە کە زیاتر لە (٦٣) کێڵگەیەو، (دەبێتە ئامانجی کەرتی تایبەت، لە راستیدا کۆمپانیا بیانییەکانە)، دەکاتە(٦٩) ملیار بەرمیل. واتە بە فیعلی زیاتر لە (٦٠٪) یەدەگی سابتی نەوتی العراق کراوە دەبێت بۆ کۆمپانیا بیانییەکان، پرۆژەی یاساکە رێگا بە کۆمپانیا بیانییەکان ئەدات کە تێکەڵی (٤٠٪)ـەکەش ببنەوە. خۆ ئەگەر یەدەگی گشتی حساب کەین ئەوە زیاتر لە (٨٤٪) یەدەگی نەوتی العراق کراوە دەبێت بۆ کەرتی تایبەت واتە بە عەمەلی کۆمپانیا بیانییەکان و، بە تەحدیدتر کۆمپانیا زەبەلاحەکانی بواری نەوت و لە سەرووی هەر هەموویانەوە ئەمریکی و ئینگلیزەکانن، چونکە ئەو مەرج و شرایتە سەبارەت (بەباشترین ئاستی تەکنەلوجیاو سەرمایەو پیشەیی و پسپۆڕایەتی لە بواری نەوت)، کە لە پرۆژەی ئەم یاسایەدا تەسبیت کراوە بۆ کەرتی تایبەتی، تەنها لەوانەدا بە دی دەکرێن و، پرۆژەکەش هیچ جیاوازییەک ناکات لە نێوان کەرتی تایبەتی (عێراقی) و بیانی و، گرێبەستەکانیش بە کێبڕکێ دەبێت و، ئەو گرێبەستانەش لەسەر بنەمای (مشارکة الانتاج) دانراوەو، لە ژمارەیەکی پێش ئێستای رۆژنامەی (هاوڵاتی) باسی لایەنە سلبییەکانی گرێبەستی (مشارکة الانتاج)مان کردبوو، ئەم جۆرە گرێبەستانە کاتیان بە سەردا چووەو، لە پاش چلەکانی سەدەی رابردوو

کەم وڵات پەسندی دەکرد ئەوەشی دەیکرد، بۆ ئەو کێڵگە نەوتییانە بووە، کە دۆزینەوەی نەوتی لە ئاستی (ئەگەردا) بووە یان تەکلیفەی گران بووەو، پێویستی بە سەرمایەو تەکنەلۆجیایەکی زۆرو پێشکەوتوو هەبووە، لەگەڵ ئەوەش هەمیشە قابیلی گۆڕان بووە. لە بازاڕی نەوتدا ئەمڕۆ (٣) جۆری ئەم گرێبەستە باس و لێکۆڵینەوەی پسپۆڕانی لەسەرە، گرێبەستی (مشاركة الأنتاج)ی روسیاو (عومان) و (لیبیا). خراپەکەیان ئەوەی روسیایەو باشەکەشیان ئەوەی لیبیایەو، ئەگەر هەمان شەرایتی ئەو (٣) جۆرە گرێبەستانە بەراورد بکرێت لەگەڵ کێڵگە نەوتییەکانی العراق، لەمەڕ ریسکی ئەگەری بوونی نەوت و هەرزانی تەکلیفەی گەڕان و دۆزینەوەی و دەرهێنانی و نەوعیەتی، کە لە هەموو ئەو بوارانەدا نەوتی العراق زۆر مسۆگەرو هەرزان و باشترە، ئەوە (قازانج)ی سەرمایە، واتە مەردودی قازانجی ئەو سەرمایەیە کە کۆمپانیا بیانییەکان وەبەرئەهێنن (استثمار)ی دەکەن لە کێڵگە نەوتییەکانی العراق بە پێی مەرجەکانی گرێبەستی (مشاركة الانتاج) لە هەر یەک لەو (٣) وڵاتە، یەک جار زۆرە. وەکو نموونە: ئەگەر هەمان مەرجەکانی ئەو (٣) گرێبەستە پیادە بکەین لەسەر (٣) کێڵگەی نەوت لە عێراق وەک (العمارە) و (الناصریە) و (مجنون) ئەوە رێژەی سوودی ئەو سەرمایانەی کۆمپانیایەکی بیانی دەستی دەکەوێت لە نێوان (٤٢٪) تاکو (٦٢٪) بۆ کێڵگەیەکی بچووک (العمارە و الناصریە) و، (٩٨٪) تاکو (١٦٢٪) سەبارەت بە کێڵگەیەکی گەورە (مجنون)،

**تەماشای ئەم خشتەیە بکە**

| مەرجەکانی گرێ بەستی (مشارکە الانتاج) وەکو ئەوەی: | رێژەی چاوەڕوانکراوی کۆمپانیاکان لەمەڕ وەبەرهێنانی سەرمایە بە پێی ئەم گرێبەستانە لە: | | |
|---|---|---|---|
| | کێڵگەی (العمارە) بچووک | کێڵگەی (الناصریە) مامناوەند | کێڵگەی (مجنون) گەورە |
| روسیا | ٪٦٢ | ٪١٠٥ | ٪١٦٢ |
| عومان | ٪٥١ | ٪٨٣ | ٪١٢٠ |
| لیبیا | ٪٤٢ | ٪٦٧ | ٪٩٨ |
| **نرخی یەک بەرمیل بە (٤٠) دۆلار مەزەندە کراوە لەسەر بنەمای نرخی ساڵی (٢٠٠٦) (هەر زیاد بوونێک لە نرخی یەک بەرمیل نەوت ئەو رێژانە بەرز دەبنەوە).** | | | |

شایەنی باسە وەکو پرنسیپی وەبەرهێنان لە بواری نەوت دا، کۆمپانیا نەوتییەکان سوودی وەبەرهێنانی سەرمایەکانیان، ئەگەر هاتوو (١٢٪) وەدەست بێنێت ئەوە بە پرۆژەیەکی نایاب و سوودمەند دەیژمێرن. یاساکە ئەگەر چ مەودای داوە بە کەرتی تایبەتی ناوخۆ هەوڵی وەبەرهێنان بدات لە بواری دەرهێنانی نەوت، وەلێ هیچ جۆرە ئیمتیازو ئەفزەلیەتێکی بۆ دانەناون، بە پێچەوانە ئەوانەی خۆماڵی و زەبەلاحەکانی بیانی وەک یەک تەماشا دەکرێن، جا خوا هاوکاری ئەو جۆرە کۆمپانیا خۆماڵییانە بێت، (ئەگەر هاتوو لە ئایندە دروست بوون)، کە چۆن بتوانن بەو شەرایتە کە تەسبیت کراوە، کێبرکێی (کۆمپانیای (شل) یان (بریتش بترۆلیۆم) یان (اکسون موبیل)..هتد) بکەن....!

٦. لە پرۆژەی یاساکەداو، بە پشت بەستن بە چەند ماددەیەکی دەستووری هەمیشەیی، ئاماژە بە (هەرێمی کوردستان) یان (پارێزگا) بەرهەمهێنەکانی نەوت دەکات. هەرچەندە لە بەشی دووهەمی ئەم باسەدا بە درێژی باسی (ناوەرۆکی ماددەو برگەکانی ئەم پرۆژەیە دەکەین سەبارەت بە دەسەڵات و مافی خەڵکی کوردستان و ئیدارەکەی)، ئەڵێین لەم پرۆژەیەدا لە چەند جێگایەک باسی هەرێم و دەسەڵات و بەشی خەڵکی کوردستان دەکات. ئەگەر چی بە گشتی ئەو باسکردنە لە چوارچێوەی (تەنسیق) و (ڕاوێژکردن) و بەشدارییەکی (شکلی) تێناپەڕێت، دەبینین هەندێ بەرپرسی کورد، بە دەر لە ناوەڕۆک و راستی ئەو دەقانە بە شان و باڵی ئەم پرۆژەیەدا هەڵئەدەن و، ئاماژە بە چەند ڕستەو برگەیەکی نا تەواو و تەماوی دەکەن و یەک تەرەفە بە خواستی دڵی خۆیان تەفسیری دەکەن، تاکو ئەو ئاستە کە جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە کورد شەریکە لە دەرهێنان و بەرهەمهێنانی نەوت و راستەوخۆ ئیدارەی کێڵگەکانی دەکات...هتد، خۆزگە وا بێت، وەلێ وا نییە. یان خۆزگە لە کاتی باسکردنی یاساکە لە ئەنجومەنی نوێنەران، لایەنی کوردستانی ئەو خۆزگانە تەسبیت بکات. ئەڵێین لەگەڵ ئەو هەموو کەم و کورتی و ناتەواوی ماددەو برگە پەیوەندارەکان بە خەڵکی کوردستان و حکومەتەکەی کە لەم پرۆژەیەدا هاتووە، توێژێکی گەورەی ئەوانەی کە باس لەم پرۆژەیە دەکەن و رەخنەی لێدەگرن، ئەمەشیان کردووە بە خاڵێکی گرنگی رەخنەکانیان، گوایە دابەش کردنی

دەسەڵاتەکان لە کەرتی نەوت، هەنگاوێکە بۆ (جیابوونەوەو پارچە پارچەکردنی العراق) و، تاڵان کردنی سەروەت و سامانەکەی و ڕەخنەیەکی زۆریش دەگرن لەو چەند گرێبەستانە کە لە پێش و لە پاش قۆناغی رزگاری العراق، ئیدارەی هەرێمی کوردستان لەگەڵ چەند کۆمپانیایەکی بیانی پێک هاتبوون، سەیر لەوەدایە بە پێی ئەم پرۆژەیە، دەبێت (لیژنەی ڕاوێژکاران)ی سەر بە (ئەنجومەنی ئیتحادی نەوتی العراق) پاش دروست بوونی، بەو گرێبەستانەدا بچێتەوەو، بڕیاری لیژنەکەش حاسیمەو قابیلی ڕەتکردنەوە نییە، واتە بە عەمەلی ڕاگیراون تاکو ئەودەم. لەگەڵ ئەوەش ئەم لایەنانە هەزمی ئەو چەند دێڕو بڕگانەی پرۆژەکە ناکەن کە زیاتر لە دروشم ئەچێت و، بۆ رازی کردنی لایەنی کوردستانییە....!

بە کورتی و بە گشتی ئەم پرۆژە یاساییە، پرۆژەیەکە، هێڵە سەرەکییەکان و پرنسیپەکانی، لەلایەن پسپۆڕانی ئەمریکی و ئینگلیزی داڕێژراوە. هەر وەکو پرۆژەکانی تریان، هەوڵیان داوە هەر لایەنێک شتێکی هەبێت بۆ خەڵکی خۆی، با دروشمیش بێت، بێ ئەوەی مەودا بدات هەر لایەنێک لە لایەنەکانی ئەم (العراق)ە بگات بە مەبەستی خۆی و، تەنها سەرکەوتوو لایەنی ئەمریکی و هاوپەیمانەکانیەتی لە بواری کەرتی نەوت..
ئێمە لەو باوەڕەداین عێراقی سەدەی بیست و یەک زۆر گرنگتر دەبێت، بۆ ناوچەکە و، بۆ کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، لە عێراقی سەدەی بیست، هەروەها کوردستانی باشوورمان بە تەحدیدو، کوردستانی گەورەمان بە گشتی، لە هاوکێشەکانی ئەم سەدەیە ڕۆڵی گرنگتری دەبێت لەوەی ڕابردوو، بە مەرجێک سەرانی فەرمی کوردستان، لە پاشکۆیەتی ڕووداوەکان و ڕەقەمێکی ئەو هاوکێشانە رزگار بن. سەروەت و سامانی وڵاتەکەمان لە پێناوی سیاسەتی ڕۆژو بەرژەوەندی تەسکی تایبەتی، بە تاڵان نەدەن و، بە هەندێ دروشمی بریقەدارو بێ ناوەڕۆک قایل نەبن و، نەبنە سەڵتە سووری بەر لەشکرو کارتی گەمەی بەرژەوەندی خەڵکی تر و (عالتەراش) ملی پێوە نەنێن و، حیساب بۆ ئەم هەلە هەڵکەوتووە بکرێت و گرانی قوربانییەکانی کوردو گرنگی و قەبارەی یەدەگی نەوت و گاز و سەروەت و سامانی دیکەی وڵاتەکەمان و قوڵایی نەتەوایەتی لەبەرچاو بگیردرێت. کوردستان لەسەر

(دەریایەکی نەوت و گـازە)، ئەوە (٨٠) سـاڵە بە شـێـوەیەکی بازرگـانی و سیاسەتێکی شۆڤینی و ڕەگەزپەرستانە نەک هەر ئەم سامانە تاڵان دەکرێت، بەڵکو، بەو داهاتە کـوردسـتـان وێران دەکـەن و، ئەو سـامـانە نەتەوایەتییـە بەرەو نەمـان ئەڕوات، واتە ڕۆژێک دێت نەوت و گاز نامێنێت و، ئەم پرۆژە یاسایە، بە رواڵەت هەنگاوێکە بۆ پێشـەوە، وەلێ لە پراکـتـیکدا چەند هەنگاوێکە بەرەو دواوە، بۆ ئێمەی کوردسـتانی سەرەتایەکی گرنگ و بێ وێنەیە بۆ چەسپاندنی مافەکانمان و ئیـمکانیـەتی کـۆنتـرۆڵ کردنی ئەم کـاڵایە بە جـۆرێک کـە لـە خزمـەتی ئەم نەوە و نەوەکانی ئایندەمانیش بێت...
ئا لەم روانگەیەوە، جێگای سەرسوڕمانە لایەنی کوردستانی، تاکو ئێستا مەودای نەداوە لە مـیدیاکـانیـان بە گشـتی و بە فراوانی، پرۆژە یاساکە بڵاوبکرێتەوەو باس بکرێت و کەم کورتییەکانی بخرێتە ڕوو.
هەر وەکو لە سەرەتاوە ئاماژەمـان بۆ کرد، لە مێژەوە لە ئەمریکاو بەریتانیـا وڵاتانی دیکەش باسی تەفـاصـیلی ئەم پرۆژەیە کـراوە، کـە دەروازەی کـێـڵگەکـانی عـێـراق دەکاتەوە بۆ کۆمپانیا بیانییەکان و، هەروەها مامەڵە کردنی کۆمپانیا بیانییەکان و کۆمپانیا عێراقییەکان وەک یەک و، هیچ ئەفزەلییەتێکی نەداوە بە عێراقییەکان چ کـۆمـپـانیـای نەوتی نیـشـتـمـانی العراق یان ئەوانەی کـەرتی تایبەت کە دوور نییە دروست بن....
بەش بە حاڵی خۆم، لەم هەمـوو ئەم سەراو و دەراوەو، خسـتنە ڕووی رەخنەو کەم و کـورتی پرۆژەکـە، بۆ ئەوە نیـیـە کـە ئێـمـە لایەنگری کـەرتی تایبـەتی نین لە بواری پیـشـەسـازی نەوت، یان ئەوندە بە پەرۆشی (العـراق)ی هیـوا ئاشـتین. بەدەر لە کوردستـان و، خەڵکی کوردستان، ئەم (العراق)ـە ئەوندە یادگاری شیرینمان نییە لەگەڵی و، بۆ ئێمەی کورد ئەوەندە پیرۆز نییە، کە مرۆڤ ئەوەندە غەم لە نەوت و گـازو سەروەت و سـامـانی بخوات و، بە داهاتی نەوت و گـازەکـەی هەوڵی بەهێـز کـردنی سوپاو ئاسایش و پۆلیس و دەزگـاکـانی تری بدات، لە ژێر ناوی (العـراق الجدید)، یان وەکو کـوردستـانییەک: کـورد فاکـتـەری پاراستن و سەروەری خاکەکەی بێت. بیر لە بە زۆر لکاندنی ئەم بەشەمانە بکەین بەو وڵاتە داتاشراوەوە. باس لە رۆڵی کـۆمپـانیا بیـانییەکان بکەین چۆن هەمیشە فـاکتەری نائارامی و پشتیـوانی دەسەڵاتی ناوەند بوونە، بیر لە هەڵەبجەو ئەنفال و تەعریب و تەهجیر بکەینەوە. لە

بڕیەرو بڕیارەکانی و عەلاوی و الجعفری و دەستووری کاتی و هەمیشەیی العراق و تەسبیت کرنی (٥١ ٪)ی خاکی کوردستانی عێراق بە (المناطق المتنازع علیها)، یان هەڵوێستی حکومەتی (المالکی) سەبارەت بە ماددەی (١٤٠) و هەوڵی مردار کردنەوەی، یان ئەو نەخشانە کە دەیانەوێ (کەرکوک) دەرکەن لە سنووری کوردستان، چ بە کەمتەرخەمی و دواخستنی پرۆسەی گەڕانەوەی ناوچە تەعریبکراوەکانمان بۆ باوەشی هەرێمی کوردستان، یان لە ڕێگای هەندێ لە دەلاڵەکانی ناوخۆ و دەرەوە سەبارەت بە جیاکردنەوەی کەرکوک لە کوردستان بە پاساوی نائارامی و دواخستنی (ریفراندۆم)، یان کەرکوک بکرێت بە هەرێمێکی سەربەخۆ، گوایە ناوچەیەکی پڕ لە نەوتەیە، بە گەڕانەوەی بۆ باوەشی هەرێمی کوردستان، کورد جیا دەبێتەوە لە العراق یان تورکیا زیز دەبێت و، گەڕانەوەی تەعریبچییەکان پێشێل کردنی مافی مرۆڤە...!

ئەوەی بە تەمایە بە بێ دەنگی و بە خشپەکی و لە پشتی خەڵکی کوردستانەوە، بۆ هەر مەبەستێک بێت ئەم پرۆژەیە دەرباز بکات و، پاساو بدرێتەوە گوایە دەرفەتێک دەبێت بۆ ڕاکێشانی بەرژەوەندییە دەرەکییەکان و، کارتێکی یاری دەبێت بە دەستی کوردەوە بۆ دواڕۆژ، بۆچونێکی سواو و ئیکسپایەرو دوور لە واقیعە، چونکە:

پرۆژەی یاساکە ئەو ڕۆڵەی بە لایەنی کوردستانی نەداوە، لەمەڕ ئیستغلال کردنی سەروەت سامانی نەوت و گازی کوردستان و، موڵکیەتی و گرێبەست و داهاتی..

هەم دەستووری هەمیشەیی العراق، کە ئەم پرۆژەیە پشتی پێ دەبەستێت و، هەم خودی پرۆژەکە، لە قۆناغی پێداچوونەوەو داڕشتنەوەدان و، ئەوەی کە ڕەچاو دەکرێت و بە پێی ڕەخنەگرەکان، هەندێ لە خاڵەکانی دەستوورو ئەم پرۆژەیە، ئەوانەن کە پەیوەندییان هەیە بە ماف و ڕۆڵی لایەنی کوردستانی و، لە نێو ئەوانەش نەوت و گازە.

هەڵوێستی ناوەندی بەغدا لەمەڕ ئەو چەند گرێبەستەی پێش و پاش قۆناغی ڕزگاری العراق، وتەکانی وەزیری نەوتی العراق (شهرستانی) کە ڕۆژی ٢٠٠٥/٤/٢٧ بڵاوکرایەوە، جەخت کردنەوەیەک و وەبیرهێنانەوەیەکی دیکەیە بۆ لایەنی کوردستانی لەم بارەیەوە....

ئەوە دەرئەنجامی ڕاکێشانی بەرژەوەندییەکانی ئابووری و بگرە ئەمنی و سیاسی تورکیا لە هەرێمی کوردستانە. قەبارەی بازرگانی تورکیا لەگەڵ هەرێمی کوردستان

لەم یەک دوو ساڵەی دواییدا گەیشتوەتە سنووری (٥) ملیار دۆلار، لە سنووری (٤٠٠) کۆمپانیای تورکی لە هەرێمی کوردستان کار دەکەن. گەورەو مام ناوەندی و بچووک. تەنها گرێبەستەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەگەڵ کۆمپانیاکانی تورکیا تەجاوزی (١) ملیار دۆلاری کردووە، واتە لە سنووری (٢٥٪) بودجەی ساڵانەی هەرێمی کوردستان و، لە بواری نەوتیشدا لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان زیاتر لەدوو گرێبەستیان هەیە، ئەڵێین سەرەڕای هەر هەموو ئەمانەو شتی تریش، حکومەتی تورکیا حیساب نەک هەر بۆ بەرژەوەندی هەرێمی کوردستان و خەڵکی کوردستان ناکات، بەڵکو هەر بە زیاد بوونی رێژەی بەرژەوەندییەکانی لە هەرێمی کوردستان تەهدیدو دەستتێوەردان و نەخشەو پلانی دوژمنانەی زیاد دەکات...

مرونەت و شەفافیەت و ڕاگرتنی بەرژەوەندییەکان سنووری هەیەو کورد لە بۆشاییدا ناژێت، وەلێ کوردیش کێشەیەکی هەیەو بەرژەوەندی تایبەتی خۆی هەیەو، ئەوەندەی هەیەو ئەوەندەیشی پێ دەکرێت، نەهێڵێت وەلاوە بنرێت و تەهمیش بکرێت....

شیوەنی ئێمە بۆ سەروەت و سامان و داهاتی نەوتی کوردستانەو ئەوەی ماوەتەوە، با ژیرترو جیدیتر تەماشای نەخشەکان بکەین، بە قسەیەک و چەند دەقیکی بێ ناوەڕۆک دیسان فیلمان لێنەکەن و تالان بکرێت و، داهاتەکەی جارێکی دیکە نەبێتە ئاگرو بمانسوتێنێتەوە. ئەگەر هەر پێمان نەکرێت وەکو پێویست بیپارێزین و سوودی لێ وەرگرین ئەوە خۆ ئەتوانین نەهێڵین خەڵکی تر سوودی لێ وەرگرێت...

# کوردو پڕۆژەی یاسای نەوت و گازی کۆماری عێراق*

پڕۆژەی یاسای نەوت و گازی حکومەتی فیدراڵی کۆماری عێراق لە ٢٠٠٧/٢/١٥ بە فەرمی لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانی بەغداوە پەسند کراو ڕاگەیەندرا، کە دراوە بە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق. لە وتارێکماندا لە ڕۆژنامەی«هاوڵاتی»، کاتی خۆی، ئاماژەمان بە لایەنە پۆزەتیڤەکانی کرد. جگە لە ڕەخنە (گشتییەکان)، کە هەر لەو نووسینەماندا باسمان کردبوو، ناوەڕۆکی ئەم پڕۆژەیە، ژمارەیەکی زۆر لە پسپۆڕانی بواری نەوت و ئابووریی ناوخۆو بیانیش کۆکن لەسەر ئەوەی کە ئەم پڕۆژەیە هەنگاوێکە بۆ دواوە، بەتایبەتی سەبارەت بە کەرتی پیشەسازی نەوت و، ڕێبازی بەرخودان و ململانێی گەلانی عێراق دژ بە بەرژەوەندییەکانی زلهێزەکان و کۆمپانیا ئیحتیکارییەکانی بە درێژایی زیاتر لە نیو سەدەی رابردوو..

ئەم پڕۆژە یاسایەو، بەو دەقەی کە لەبەردەستدایە و، لە ژێر پەردەی دارمانی ژێرخانی ئابووری و پێویستی ئاوەدانکردنەوەو خاسکردنی بارو گوزەرانی خەڵکی عێراق و نەهێشتنی بێکاری و توندوتیژی، و نەبوونی سەرمایە، دەرگای کەرتی نەوت و گازی عێراقی ڤاڵاکردووە بۆ کۆمپانیا بیانییەکان و، بە تەحدید ئەوانەی کە لە ساڵی ١٩٦١و بەپێی یاسای ژمارە ٨٠ و یاساو بڕیارەکانی پاش ئەو سەردەمە لەمەڕ نەوت، لە دەرگای ئەم وڵاتە دەرکران و، ئەم کەرتە خۆماڵی کراو، بە توانای خۆماڵی و کڕینی خزمەتگوزاری بواری نەوت لە وڵات و کۆمپانییەکان، بۆ ماوەی نیو سەدە ئەم کەرتە بەڕێوە دەچێ بە ئێستایشەوە، تاکو ئەو رادەیەی توانرا ئاستی دەرهێنانی نەوت ڕۆژانە لە ٤ ملیۆن بەرمیل تێپەڕبێت و، بە هەمان شێوە پاش شەڕی ٨ ساڵەی عێراق لەگەڵ ئێران و شەڕی کوێت ١٩٩١، سەقفی دەرهێنانی نەوت ڕۆژانە بگاتە سنووری ٣ ملیۆن بەرمیل، لە کاتێکدا ئەم وڵاتە گەمارۆدرابوو، ناڵە ناڵی بوو لە دەستی دیکتاتۆرێکی وەکو سەدام و ڕژێمە ڕەفتار فاشییەکەی...

* ئەم بابەتە لە ژمارەکانی (٢٥٠٨ تا ٢٥١٢) ڕۆژنامەی «خەبات» لە ڕۆژانی ٢٨/٥تا٢٠٠٧/٦/١ بڵاوکراوەتەوە.

ئەوەی لەم باسەماندا بەلای ئێمەوە گرنگ بێت، مافەکانی خەڵکی کوردستانە سەبارەت بە سەروەت و سامانی نەوتەکەی، بەپێی ناوەڕۆکی ئەم پرۆژە یاسایەی باسی دەکەین.

جێگای داخە تاکو ئێستا لایەنی فەرمی کوردستان، نەک هەر خۆیان بێدەنگن، بەڵکو زۆربەی زۆری کەناڵە راگەیاندنەکانیشیان کپ کردووە، سەبارەت بە گیروگرفتی نەوت و گازی ناوەندو کوردستان، لە کاتێکدا دەسەڵاتی ناوەند خوازیاری ئاودیو کردنێتی لە ئەنجومەنی نوێنەران وەک چۆن بەخشپەکی لە ئەنجومەنی وەزیران دەربازکرا. خەڵکی کوردستان ئاگادار نییە لە:

١ ـ لە چۆنییەتی لەدایک بوونی ئەم پرۆژە یاسایەو ئەو قۆناغ و فلتەرانەی کە پێیدا تێپەڕبووە.

٢ ـ ناوەڕۆکی دەقی ئەم پرۆژە یاسایە بە گشتی، وەرنەگێڕدراوەتە سەر زمانی کوردی و، بۆ شی کردنەوەی لە رێگای رۆشنبیرانی کوردستانەوە، چ ئەوانەی پسپۆڕن لە بواری پیشەسازی نەوت و ئابووری و یاساو، چ سیاسەتوانان و چاودێران..

٣ ـ ئایا ماف و داخوازییەکانی گەلی کوردستان، لە روانگەی ئەم پرۆژە یاسایەوە، بە مادده و بڕگە دیاری کراوە...؟

٤ ـ ناکۆکییەکانی نێوان دەسەڵاتی فەرمی کوردستان و ناوەندی بەغدا، لەمەڕ سەروەت و سامانی کوردستان بەتایبەتیش، نەوت و گاز، چ لە دەستوور و چ لەم پرۆژە یاسایەو، ئایا تا کوێ سازشکاری کراوەو کامەیە خەتی سوور...؟

خەڵکی کوردستان بەرامبەر بە لافاوی رەخنەو داکۆکی سەرانی عێراق لەمەڕ ئەم پرۆژە یاسایە، دۆش داماون. نازانن ناوەڕۆکی ئەم پرۆژەیە چییە؟!. تاکو کوێ مافی پارێزراوە؟!. تێ ناگات بۆ سەرانی وا ئاڵۆز دەبن کاتێک ئاماژە بەم بابەتە دەکرێت. بۆ گاهێک دەڵێن گوایە هیچ نەماوە لە نێوان ئەوان و ناوەندی دەسەڵات سەبارەت بەم پرۆژەیەو، گاهێک دەڵێن گوایە ئەم پرۆژە قبووڵ ناکەن و، گاهێکی دیکە دەڕۆن بۆ بەغدا بۆ دانوستاندن لەسەر ئەم پرۆژەیە، لە کاتێکدا:

* پرۆژەکە لە قۆناغی دارشتنەوەو پەسندکردنی لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانی ناوەندی بەغدا تەواوبووەو، دراوە بە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق...!

* بەپێی قسەی سەرۆک وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ٢٠٠٧/٥/٩،
لایەنی کوردستانی بەشداربووە لە داڕشتنی پرۆژەی یاساکەو، هەرواشە، ئەی مەگەر سەرۆکی لیژنەی داڕشتنەوەی ئەم پرۆژە یاسایە، جێگری سەرۆک ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق «د. بەرهەم سالح»نەبوو....؟!
* باشە ئەگەر خیلاف هەیە چییە و لەسەر چییە..؟

بۆ ئێمەی کوردی کوردستانی باشوور، بەتایبەتی، ئەوەندە خەمخۆرو بە پەرۆش و عەودالی ئێستا و دوا ڕۆژی کالای نەوت و گازی کوردستانین؟ ئەمە پرسیارێکە و لە وەلامیدا دەشێ بلێین: دەکرێت ئەم خەمخۆری و ترس و پەرۆشیمانە کۆکەینەوە لە چەند خالێکی سەرەکی لەوانە:

١ ـ هۆکاری سەرەکی داگیرکردنی کوردستان و، دابەش کردنی لەسەر دەستی بەریتانیاو فەرەنساو ئەمەریکا لە دوو بەشەوە بۆ چواربەش، لە پاش شەڕی جیهانی یەکەم، نەوت و سەروەت و سامانی نەوت بوو. ئەمڕۆش مەترسی ئەوە هەیە لە ژێر چەتری «داگیرکەری ئەمریکی بەشی باشوورمانیش دابەش بکرێت..!
٢ ـ هەر نەوت و سەروەت و سامانی نەوت بووە هۆکاری دروست بوونی ئەم عێراقە بە سنوورو پێکهاتەی ئێستای و لکاندنی کوردستانی باشوورمان بەم کیانە داتاشراوەوە....
٣ ـ هەر کالای نەوت بوو، وەک یەک لە هۆکارە سەرەکییەکانی داکۆکی زلهێزەکانی جیهان و هاوکاری و بگرە دروست کردنی ئەو ڕژێمانەی ئەوساو ئێستا، بە ئەم عێراقەیشەوە، کە کوردستانیان داگیر کردووەو، ئێستاش دان بە گشت مافەکانی خەلکی کوردستان نانێن و، نەتەوەکەمان دەچەوسێننەوەو، هەندێکیشیان نەک هەر نکۆلی لە بوونی کوردو کوردستان دەکەن، بەلکو هەمیشە لە ئامادەباشیشدان بۆ ڕێگاگرتن لە هەر هەنگاوێکی پۆزەتیف لەمەڕ چارەسەرکردنی، یان پشتگیری لە کێشەی کورد لەم پارچە، یان ئەوەی دیکەی کوردستان، یان لە دەرەوەی ولات، لە نێو ئەوانەشدا حکومەتی تورکیا لە هەموویان بەقینتر و نەیارترە..

٤ ـ کۆمپانیا زەبەلاحەکانی ئەمەریکاو بەریتانیا بە تەحدید، لە پشتی تاڵان کردنی سەروەت و سامانی نەوتی کوردستانی باشوورمان بوون بۆ ماوەی زیاتر لە نیو سەدەو سەرەتای ماکی تەعریب و ئاژاوەنانەوە دژ بە کوردو، هاوکارو پشتیوانی رژێمەکانی عێراق بوون تاکو دەسەڵاتیان بەسەر ئەو نەوتەدا هەبوبێت. بە گەڕانەوەی بەرژەوەندییەکانیان دیسان مەترسی ئەو هاوکاری و پشتگیرییە لە ئارادا دەبێت..!

٥ ـ فاکتەری سەرەکی هاندەری«داگیر»کردنی عێراق بە کوردستانی باشوورمانیشەوە لەلایەن ئەمریکا لە ساڵی ٢٠٠٣، هەر نەوت و گازو داهاتەکەی بوو. ئەو داگیرکردنەی کە سەرۆک کۆماری عێراق بەڕێز«جەلال تاڵەبانی» پێناسەی کردووە بە«احتلال ذات عواقب وخیمە»و،«عێراق»ی کردوەتە خاڵی جەزبی ئیرهابی جیهانی بە کوردستانیشەوە...

٦ ـ لە سەرەتای دامەزراندن و دروست بوونی ئەم عێراقە تەنها داهاتی نەوتی کوردستان هۆکاری سەرەکی ژیان و بنیادنانەوەی ئەم کیانە داتاشراوە بوو، ئەمڕۆش هەر ئەو داهاتەیە بووەتە یەک لە سەرچاوە گەورەکانی دامەزراندن و دروست بوونەوەی، بە تایبەتی لەڕووی جەنگی و دەسەڵاتە سەرکوتکەرەکانی. بۆ نموونە: (داهاتی عێراق لە ناردنە دەرەوەی نەوتی خاو لە نێوان ساڵانی «١٩٣١-١٩٤٩»بڕی «١٣٦»ملیۆن دۆلار بووەو، پشکداری هەرێمی کوردستان لەو بڕە پارەیە«١٣٦»ملیۆن دۆلار بووە، واتا ١٠٠٪ داهاتی عێراقی ئەو سەردەمە نەوتی کوردستان بووە، جگە لە کشتوکاڵ..).
هەروەها لە نێوان ساڵانی ١٩٥٠ ـ ١٩٥٥ رێژەکە لە سنووری ٨١٪ بووە، لە نێوان ساڵانی ١٩٧٨-١٩٩٠ کەمتر نەبووە لە رێژەی ٧٨٪.

٧ ـ هەر لەبەر سەروەت و سامان و سەرچاوەی نەوت و گازە کە شێوەیەتی، تاکو ئەمڕۆ ئەم عێراقە بە کوردستانی باشورمانیشەوە نائارامە...!

٨ ـ یەدەگی نەوتی عێراق ئەگەرچی«سابیتەکەی بە ١١٥ ملیار بەرمیل مەزندە کراوە»، بەڵام ئەوەی«موحتەمەل»و ئەوەی«ئایندە»ی، مەزەندە دەکرێت بە«١٠٠+١٥٠=٢٥٠»ملیار بەرمیل بەمەش کۆی گشتی یەدەگی نەوتی عێراق لە ٣٠٠ ملیار بەرمیل تێدەپەڕێت و، بەپێی دیدی پسپۆڕانی ئەم بوارە، رۆژێک دێت نەوتی جیهان تەواو دەبێت، وەلێ دوا بەرمیلی لە عێراق دەبێت و، لە عێراقیش دوا بەرمیلی لە کوردستان دەبێت.

٩ ـ تاكو ئەمڕۆش داهاتی نەوت لە سنووری «٩٥-٩٨ ٪»ی بودجەی كۆماری عێراق پێك دێنێت كە(٤٢ ملیار دۆلار)ەو، بودجەی هەرێمی كوردستانیش (١٠٠ ٪) پشت بەستە بە بودجەی ناوەندی بەغدا.

١٠ ـ لەسنووری«٥١ ٪»خاكی كوردستانمان لە دەرەوەی دەسەڵاتی حكومەتی هەرێمی كوردستانەو، هەر هەمووو ئەو ناوچانەش ناوچەی«نەوت و گاز»و سەرچاوەی كانزای دیكەن. جێگای داخە بۆ یەكەم جار لە مێژووی نەتەوەكەمان سەرانی فەرمی، دانیان بەوەدا ناوە كە ئەو نزیكەی(٥١ ٪)ی خاكی كوردستانی باشوورمان ناوچەی«نیزاع»ن، «المناطق االمتنازع علیها»، لە نێوان كوردو دەسەڵاتی ناوەندی بەغداو، كە لە واقیعدا لە نێوان كوردو نوێنەری عەرەبی عێراقی زۆرینەیە، ئەمەش لە دەستووری هەمیشەیی عێراق تەسبیت كراوەو خەڵكی كوردستانیش ناچار كرا پەسندی بكات. (مەبەستم ئەو ڕێژەیەیە كە دەنگی دا بە«بەڵێ»بۆ دەستووری هەمیشەیی لە كۆی گشتی ئەوانەی كە مافی دەنگدانیان هەبوو لە كوردستان). واتە«بەدرە، جسان، مەندەلی، خانەقین، گشت ناوچەكانی كەركووك، مەخموور، زۆربەی هەرە زۆری پارێزگای مووسڵ و بەتایبەتی شێخان، زومارو تەلەعفەر، شنگار... هتد»كە هۆكاری دابڕانیان لە هەرێمی كوردستان و تەعریبكردنیان دەگەڕێتەوە بۆ نەوت، وەك فاكتەری سەرەكی. دەسەڵاتی ناوەند هەمیشە لە هەوڵی قووتدانی ئەو ناوچانەن. تەماشای ئەمڕۆ بكەین كە چۆن كۆسپ دروست دەكەن لە بەردەم پرۆسەی گەڕانەوەیان و مرداركردنەوەی نەخشەی ڕێگای چارەسەركردنەكان، یان هەروا مانەوەیان وەكو ئێستا، یان چارەسەركردنیان بەشێوەی «پارچە پارچە»كردنیان نەك وەك یەك پاكێت، بۆ ئەوەی ئەم «پارچەیە» كە ئەمڕۆ قووت نادرێت لە دەرفەتێكی دیكەدا قووتی دەن. بڕوانە پارێزگای مووسڵ، ڕۆژئاوای تەعریب كراو تەواوبوو، ئێستا تەعریب ڕوویكردوەتە ڕۆژهەڵاتی. لە سییەكانی سەدەی ڕابردوو «حەویجە» گوندێكی بچووك بوو، عەرەبیان تێدا نیشتەجێ كرد، ئەمڕۆ دوو«قەزا»یە. پاش ٢٠٠٣ تەعریبی جەلەولا گەیشتە لوتكەو بەردەوامە. خۆ ناوچەكانی دیكەی كوردستان كە لە سنووری «٤٩ ٪»ەو، ئەمڕۆ بە فەرمی پێی ئێژن «هەرێمی كوردستان» زۆربەی هەرە زۆری، ئەگەر گشتی نەبێت، ناوچەیەكی«پڕ لە نەوت و گازە»، بۆ بە دووری

بزانین عەرەبی «ڕەسەن»و «ناڕەسەن»ی ئەمڕۆ، بە پشتیوانی، یان بێ پشتیوانی «دۆستان»، لەگەڵ هەندێ گۆڕینی باردۆخەکە، نابنە بنکەو سەردەمی تەوژمێکی دیکەی تەعریبکردنیان...

١١ ـ لە هەموو ڕووبەڕوو بوونێکدا لەگەڵ نەیارانی کوردو بگرە «دۆستان»یشی، لەمەڕ گەڕانەوەی ناوچە دابڕاوەکانمان و، جەخت کردن لەسەر سنووری کوردستان، فاکتەری نەوت دەکەن بە بەهانەو گوایە داکۆکی کورد لە نەهێشتنی تەعریب و دیاری کردنی سنووری جوگرافی و مێژووی کوردستانی باشوورمان و، ڕاست کردنەوەی ئەو غەدرە مێژووییەی کە دەرحەق بە ئێمەی کورد کراوەو، خودی هەمان زلێهزی ئەوساو ئێستا، ڕاستەوخۆ لێی بەرپرسیارن، لەبەر نەوتی ئەو ناوچانەیە.. لەوەش سەیرتر سەرانی فەرمی کورد بە توندی ڕەتی ئەو «تاوانە» دەکەنەوەو نکوڵی لێ دەکەن، وەکو ئەوەی بە ڕاسانی جەخت کردنی لەسەر ئەو سەروەت و سامانەو داواکردن و پێداگرتن لەسەری و، تاوانبار کردنی «بەرامبەر»، چ دەسەڵاتی ناوەندی کۆن و نوێ بێت، یان بە ناو «دۆستان»ی کورد، تاوانێک بێت. مەگەر هەر نەوت و سەروەت و سامانی نەوت و گاز و کانزاکانمان لە پشت داگیرکردن و دابەش کردن و بەعەرەب کردنی کوردستان و تێکدانی ژێرخان و سەرخانی ئابووری و کۆمەڵایەتیمان نەبووە...؟! ئەگەر نەوت نەبێت وەکو هۆکاری سەرەکی دەبێت چ بێت وا لە عەرەبی برامان بکات بە کۆنەپەرست و پێشکەوتووخوازیان، بە عەلمانی ئوسولییان، بە سوونە و شیعەیان، بە نەتەوەپەرست و جاش لیبراڵیان، ئێژین دەبێت چی دیکە بێت هۆو هۆکار جگە لە نەوتەکەی ئەو ناوچانە کە وا لە برا ئازیزانمانە بکات ئەوەندە هۆگری خاکی کوردستان بن..؟!

نکوڵی کردنی هەندێ لە سەرانی لەم ڕاستییە نە خۆیان و نە بەرامبەریان قایل دەکات بە پێچەوانەوە گومان دەخاتە سەر بۆچوون و هەڵوێستی دیکەشیان باوەڕ ناکەم کەسێکی خاوەن ویژدان و عەقڵ هەبێت حاشا لەوە بکات کە هۆکاری سەرەکی لە دابڕانی ئەو ناوچانەو سوور بوونی دەسەڵاتی ناوەندی بەغدا لەسەر بەردەوام بوونی تەعریب و تەگەرە خستنە سەر ڕێگای هەنگاوە سەرەتاییەکانی دەستپێکردنی ئاسایی کردنەوەی بارودۆخی ئەو ناوچانە، نەوت نەبێت، هەروەها کەسێکی خاوەن

ویژدان و زانایش نییه نکۆڵی لەوە بکات کە جەخت کردنی کورد لەسەر ئەم هۆکارە وەکو ماکی تەعریب و کارەساتەکانی، مافی رەوای خۆی نەبێت. بۆ عەیب و شەرم و تاوان بێت پڕ بەدەم بە سەرانی عێراق و هاوکارانیان بێژین: بەڵێ نەوتە هۆکاری پێداگرتنی ئێوە لەسەر تەعریب...!

بە پێچەوانەوە نەخستنەڕووی ئەم هۆکارەو شاردنەوەی و سوور نەبوون لەسەر ئاشکرا کردنی، هەڵەیەکی گەورەیە. ئەمریکا بۆ نەوت هاتووەو نەوتی دەوێت و، ئەوا چوار ساڵە زیاتر لە یەک ملیۆن کەسی گەلانی عێراق بە کوردیشەوە، بوونەتە قوچی قوربانی، بە ملیۆنیش بریندارو سەقەت و بە ملیار دۆلار زەرەرو زیانی ماددی و دیکەش لە عێراق و لە کوردستان و لە ناوچەکە و لە خودی ئەمریکا کەوتووە، کەچی نە شەرم دەکات و نەپێی عەیبە، سەرانی لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا جەختی لەسەر دەکەنەوە. ئەوە عەرەبی عێراق، بە بیرو هەڵوێستی کۆن و نوێیانەوە، بزانە چەند سوورن لەسەر تەعریب و چۆن قەڵس دەبن ئەگەر کورد باسی نەوتی خۆی بکات، نەک هەر ئەوەندە بەڵکو، تاوانباریان دەکەن بە تاوانێک کە ئەوان خۆیان، وەکو هۆکاری سەرەکی تەعریب، باسی ناکەن..!!

کام نەتەوە و میللەت و رژێم و دەسەڵات و سەرکردە، دەستی لە سەروەت و سامانی میللەتەکەی بۆ خەڵکی دیکە هەڵگرتووە، یان بە تاوانی بزانێت هۆکاری سەرەکی تراژیدییەکانی ئەوساو ئێستای بگەڕێنێتەوە بۆ هۆکاری راستەقینە، کاتی هاتووە ئەگەر زۆر درەنگیش نەبێت، سەرانی فەرمی کوردستان راستییەکان وەکو خۆی باس بکەن و، دۆست و دوژمن بزانێت نەوت و گازە گرفتی سەرەکیمان و، مافی خۆمانە سوور بین لەسەری و، خەڵکی کوردستانی پێ تەیار بکەن. ئەو میللەتەی ئاگای لە سەروەت و سامانی خۆی نەبێت و دەستی پێیەوە نەگرێت و بەرگری لێ نەکات، دەخورێت... و دەیخۆن..

مێژووی ئەم پرۆژە یاسایە دەگەڕێتەوە بۆ پێش قۆناغی «رزگاری» و «داگیرکردنی» عێراق لە ۲۰۰۳، ئەودەم نەخشەکێشانی سەرەکی بۆ قۆناغی پاش «رزگاری» عێراق کە بە «پرۆژەی ئایندەی عێراق» ناودەبرا، لەلایەن وەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکا، بەڕێوە دەچوو. سەرەتای دەستپێشخەرییەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ کۆڕو کۆبوونەوەکانی زیاتر لە ۱۷ گروپی کاری «مانگی نیسانی ساڵی ۲۰۰۲»ی واشنتۆن و لەندەن. هەر یەک لەو گروپانە پێکهاتبوون لە ۱۰ ـ ۲۰ پەناهەندەی

عێراقی و بەشداری پسپۆڕانی بیانی، کە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا یەکە بە یەکەیانی هەڵبژاردبوو.
گروپی کاری تایبەت بە «نەوت و وزە» لە ١٥ کەسی عێراقی و بیانی پێکهاتبوو، لەمیانەی مانگی کانوونی یەکەم ٢٠٠٢ و نیسانی ساڵی ٢٠٠٣دا چوار دانیشتنی کرد. هەر ئەودەم یەک لە ئەندامانی ئەو لیژنەیە «ئیبراهیم بەحر لعلوم»بوو، هەر ئەودەم لە راگەیاندنێکی ئەو قۆناغە دەڵێت: لیژنەکەمان گەیشتۆتە ئەو قەناعەتەی کە دەبێت دەرگای عێراق ڤاڵا بکرێت بۆ کۆمپانیاکانی نەوتی جیهانی بە زووترین کات.. «مەبەستی پاش رزگاری عێراق»بوو، «هەر لە پاش رووخاندنی رژێمی سەدام ناوبراو کرا بە وەزیری نەوتی عێراق». لقێکی ئەم گروپە چەند راسپاردەیەکی پێشکەش کرد، لەوانە، گەڕانەوە بۆ گرێبەستی «مشارکە الانتاج PSA» = PRO-DUCTION SHARING AGREEMENTS). هۆکاری گەڕانەوەش بۆ ئەم جۆرە گرێبەستانەش پاشتر بەفەرمی گروپی (نەوت و وزە) لە نیسانی ٢٠٠٣دا بە وردی باسیان کرد بەم شێوەیە: (عامل الجذب الرئيسي في عقود مشاركة الانتاج بالنسبة لشركات النفط هو انه رغم امتلاك الدولة للاحتياطي النفطي، فان اجراءات المحاسبة تسمح للشركات بحجز الاحتياطات لحسابها، لكن السمة الاهم من وجهة نظر شركات النفط الخاصة، اذا تساوت الامور الاخرى، هو ان حصة. الحكومة محددة في شروط عقود مشاركة الانتاج، ولذلك فان شركات النفط محمية بموجب هذه الشروط من اي تشريعات مناوئة في المستقبل..) دەسەڵاتی داگیرکەری ئەمەریکا العراق (دەسەڵاتەکانی هاوپەیمانان) هەر لەسەرەتاوە چەند بەڕێوەبەرێکی تەنفیزی پێشووی کۆمپانیا گەورەکانی بیانی دامەزراند بە ناوی راوێژکاری یەکەم. گروپی ئەو جۆرە راوێژکارانە لە سەرەتای مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٣دا دەستنیشان کران، واتا پێش رزگاری عێراق ئەودەم لە کوێت نیشتەجێ کران و ئامادەبوون بۆ ئەوەی لە کاتی پێویستدا بگەنە بەغدا لە سەرەتادا فیلیپ کارۆڵ کارمەندێکی بەرزی کۆمپانیای نەوتی بەناوبانگی جیهان شل و گاری فوگلەر لە کۆمپانیای نەوتی ئەکسۆن مۆبیل و ٣ کارمەندی بەرزی وەزارەتی وزەی ئەمریکی و کارمەندێکی بەرزی حکومەتی ئوسترالیا بوون، بەڵام لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ٢٠٠٣دا کارۆڵ و فۆگلەر گۆڕان بە بۆب ماکی لە

کۆمپانیای نەوتی کۆنکۆ فیلیپس و تێری ئامادس لە بریتیش پترۆلیۆم ئەمانەش لە ئاداری ساڵی ٢٠٠٤ دا گۆڕان بە مایک ستنسۆن لە کۆمکۆفیلیپس و بۆب مۆرگان بە برتیش پترۆلیۆم لە حوزەیرانی ٢٠٠٤یشدا ستنسون بووە راوێژکاری باڵیۆزخانەی ئەمەریکا لە بەغدا کە بریمەریش دەست بەکاربوو (ابراهیم بحر العلوم) هەر وەکو ئاماژەمان بۆ کرد بووە وەزیری نەوت لە حکومەتەکەی عەلاوی. یەکەم راگەیاندنی (بحر العلوم) بۆ فایناشیاڵ تایمز پاش دامەزراندنی بە وەزیر جەخت کردنی بوو لەسەر خصصە کردنی کەرتی نەوتی عێراقی و ئیستسمار کردنی لەسەر بنەمای گرێبەستی (مشارکە الانتاج) ئەولەویاتیش بۆ کۆمپانیا ئەمریکاییەکان و دووریش نەبوو بەلایەوە کە هەندێ کۆمپانیای ئەوروپیش پرشێکی بەر کەوێت ئەم بۆچوونانە جووت بوون لەگەڵ پرۆگرامی تایبەتی (د.ایاد علاوی) وەکو یەکەم سەرۆک وەزیرانی سەردەمی قۆناغی دەسەلاتی بریمەر کە بریتی بوو لە (خصخصە) کردنی کەرتی نەوت و کارکردن لەگەڵ کۆمپانیا بیانییەکان لەسەر بنەمای گرێبەستی (مشارکە الانتاج) و حکومەتەکانی دواتر (الجعفری)و (المالکی) تاکو ئێستاش لەسەر هەمان پرنسیپن و ناوەڕۆکی (خصخصە)ی کەرتی نەوت و گاز و ڤاڵاکردنی دەروازەی عێراق بەرامبەر کۆمپانیا بیانییەکان.. ئەم پرۆژە یاسایە کە لە حوزەیرانی ساڵی ٢٠٠٥دا رەشنووسە ئینگلیزییەکەی ئامادە کرابوو دواتر لیژنەیەکی تایبەت لە حکومەتەکەی (المالکی) بە سەرۆکایەتی جێگری سەرۆک وەزیرانی عێراق (د.بەرهەم ساڵح) کە بە یەکێک لەو بەرزە لێپرسراوانەی عێراق دەژمێردێت.
زۆر بە گەرمی و توندی لەگەڵ (مشارکە الانتاج)ـە دەستنیشان کرا بۆ دارشتنەوەی، کە لیژنەکەش لە کاری خۆی بووەوە درا ئەنجومەن و ئەنجومەنیش، وەکو پرۆژەی یاسایەک لە ٢٠٠٧/٢/١٥دا پەسندی کردو ناردی بۆ ئەنجومەنی نوێنەران دیارە لەبەر کەم و کورتی و رەخنەیەکی زۆر ئەنجومەنی نوێنەران پرۆژەکەی ناردوەتەوە بۆ ئەنجومەنی وەزیران هەر وەکو هەندێ لە کەناڵەکانی راگەیاندنی عێراقی و بیانی ئاماژەیان بۆ کردو باسی ئەوەش هەیە کە ئەم پرۆژەیە لە مانگی ئەیلوولی ئەمساڵدا کاری پێ بکرێت.. پرۆژەی یاسای نەوت و گازی کۆماری عێراق کۆمەڵێک پرنسیپی پۆزەتیڤ و دەستگای نوێی لەسەر کاغەز تێدا بە دی دەکرێت و بۆ ئێمەی کوردستانی سەرەتایەک و وەرچەرخانێکە کە دەبێت بە هەند وەربگیردرێت لەوانە:

١- جاری یەکەمە دەسەڵاتی ئیدارەکردن و بەرهەمهێنانی نەوت و گاز دابەش دەکرێت لە نێوان دەسەڵاتی ناوەندو هەرێم و پارێزگا بەرهەمهێنەرەکان و ئەویش بە پشت بەستن بە دەستووری هەمیشەیی کۆماری عێراق.

٢- جاری یەکەمە لە مێژووی ئەم عێراقەدا کە داهاتی نەوت و گازەکەی لەسەر ناوچەکانی دابەش دەکرێت بەپێی ژمارەی هاووڵاتیانی دەڤەرەکانی هەر وەکو دەستوور جەختی لەسەر کردووە.

٣- جاری یەکەمە لە مێژووی ئەم وڵاتە لە دابەش کردنی داهاتی نەوت و گازەکەی، بەپێی دەستوور بارودۆخی ئەو ناوچانە لەبەرچاو دەگیردرێت، کە لەسەر دەستی رژێمەکانی پێشوو و قۆناغی ئێستاش تووشی زەرەرو زیان و پەراوێز کردن بوونە..

٤- جاری یەکەمە لە مێژووی ئەم عێراقەدا کە گشت داهاتی نەوت و گازەکەی کۆدەبێتەوە لە یەک سەندووقی فیدراڵی بە ناوی (صندوق الموارد النفطية) و بەپێی یاسایەکی تایبەت چۆنیەتی دابەش و خەرج کردنی دیاری دەکرێت..

٥- جاری یەکەمە لە مێژووی ئەم وڵاتەدا بیر لە نەوەکانی داهاتوویش دەکرێتەوە سەبارەت بە سەروەت و سامان و داهاتی نەوت و گازو لەو داهاتە رێژەیەکی وەلاوە دەنرێت و، برە پارەکەی تەحویلی سەندوقێک دەکرێت بە ناوی (سەندووقی ئایندە= صندوق المستقبل)و بەپێی یاسایەکی تایبەت مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت..ئەگەر لە نێو ئەنجومەن یان ئەنجومەن خۆی لەبەر هەر هۆکارێک بێت لە ماوەی دیاری کراو بیەوێت یان بیانەوێت (مماطله) بکەن یان سەرۆک وەزیران مەودای بڕیاردان نەدات، یان ئەنجومەنەکە کۆ نەکاتەوە ئەوە گرێبەستەکە دەرباز دەبێت با کەم و کورتیشی زۆر بێت..

٦ ـ جاری یەکەمە لە مێژووی ئەم وڵاتەدا، دان بەوەدا دەنرێت، کە کورد مافی ئەوەی دەبێت، لە گشت بوارەکانی سیاسەتی کەرتی نەوت ئاگاداربێت و «تەنسیق»و «راوێژ»ی لەگەڵدا دەکرێت و، دەستووریش، بەو جۆرە کە تەفسیر دەکرێت زامنە...

٧ ـ جاری یەکەمە لە مێژووی ئەم عێراقەدا، کە دەسەڵاتی کوردستانی بۆی هەیە گفتوگۆ و ئیمزای سەرەتایی «اولی» گرێبەستیش بکات لەگەڵ کۆمپانیاو

لایەنی خۆماڵی و بیانی لە گشت بوارەکانی کەرتی نەوت و گاز، بەو نەخشەیەی کە دەستوور داینەوەو پرۆژەکە ئاماژەی بۆ کردووە...

٨ ـ لایەنی کوردستانی وەکو کورد لە گشت دەزگاکانی کەرتی نەوت و گاز لە ناوەندی بەغدا بەشداری بکا...

ئەمانەو چەند پرنسیپێکی دیکەی «پەیوەندار»، چ لە دەستووری هەمیشەیی و، چ لەم پرۆژە یاسایەدا، لایەنە پۆزەتیڤەکانی ئەو دوو دیکۆمێنتەن، وەلێ هەر وەکو هەمیشە عیبرەت لە دەقدا نییە بە ئەندازەی چۆنییەتی دارشتنی ئەو دەقە، چونکە لەوەش زیاتر مەبەستی«مشرع»ـەو، لەوەش گرنگتر ئیرادەو چۆنییەتی و «کەی» جێبەجێ کردنەکەیەتی و، لە هەر هەمووشی گرنگتر، داکۆکی و سوور بوونی لایەنی فەرمی کوردستان و پابەندبوونێتی بە ماف و داخوازییەکانی خەڵکەکەی خۆی....

مێژووی ئەم نەتەوەیە پڕە لە وانەو پەند، دەکرێت کێشەی کورد وەکو نموونەیەکی بێ هاوتا، تەماشا بکرێت کە چۆن وەکو کێڵگەی تاقیکردنەوەی سیاسەت و نەخشەو پلانی گشت زلهێزو داگیرکەران بووەو، زۆرجار بۆ مەرامی خۆیان بەکاریان هێناوەو، سەرکردایەتییەکەی دەستخەرۆ کراوە، میللەتەکەش تووشی کارەسات و ماڵوێرانی بووە، بە«فێڵکردن»، یان نەمانزانی، یان «ئەوەندەمان پێ دەکرێت» ئاودیو دەکرێت..

لە«سیڤەر ـ ١٩٢٠» بە دیکۆمێنت پەیمانی دەوڵەتی سەربەخۆیان پێدایین. لە«لۆزان ـ ١٩٢٣»یشدا پاشگەزبوونەوە. حکومەتی قاسم «١٩٥٨»بە دەقی دەستووری کاتی ئەودەم (عەرەب و کورد شەریک بوون لە عێراق... ماددەی ٣)و گۆڕینی قەوارەی نەتەوایەتیمان دەست پێکرد. بەعس و سەدامی خوێنڕێژ، گوایە دانیان بە مافی کورددا ناو «خودموختارییان ـ حوکمی زاتی»یان بۆ ئیقرار کردو، لە دەستوورە کاتییەکانیاندا تەسبیت کراو یاسای ئۆتۆنۆمیشی دەرچواند و «ناوچەی کوردستان»یشی دیاری کرد، کەچی گەورەترین و درندەترین شاڵاوی تەعریب و کاول کردنی کوردستان و قڕو جینۆساید کردنی میللەتێکی پیادە دەکردو «٥١٪ی خاکەکەی تەعریب کرد». ئەوە ئیدارەی هاوپەیمانان «بریمەر»و، هەر سێ حکومەتەکەی دوای قۆناغی «رزگاری عێراق»، ئەوە رێبازی ماددەی ١٤٠و گیروگرفتی هەندێ دەق و ماددەی دەستووری هەمیشەیی پەیوەندار.. هتد، گشت ئەمانە و دەیان رووداوی دیکە پەندو عیبرەتن و، گەواهی ئەوە دەدەن، کە چەند دەق

و دەقنووس ڕێکوپێک و روون و رەوان بێت ئەوەندەیش ئیرادەو هۆشیاری و سوور بوونی لە جێبەجێ کردنیان گەرەکە...
ئەم پرۆژە یاسایەی نەوت و گاز پشتبەستە بە چەند ماددەیەکی دەستووری و، خودی ئەم پرۆژەیە ئاماژەی بۆ کردووە، چ لە پێشەکییەکەی: «وحيث ان المادة ١١١ من الدستور الدائم المشار اليه تنص على ان النفط والغاز هو ملك كل الشعب العراقي في كل الاقاليم والمحافظات»و«حيث ان المواد ١١٠ و ١١٢و ١١٤و١١٥ و اللواتي يقران في ضوء المادة ١١١ قد عرفت بشكل عام مسؤوليات وصلاحيات السلطات الاتحادية وسلطات الاقاليم والمحافضات بضمنها ما يختص بقطاع النفط.» یان ئەوەی لە ماددەی «١١ ـ أ»یدا هاتووە «بناء على ما جاء في الدستور«المواد ١٠٦، ١١٢، ١١١، ١٢١، ثالثا...».
بۆیە بێ لێکدانەوەی ناوەڕۆکی هەندێ لەو ماددانە کە پەیوەندی بە مافی خەڵکی کوردستانەوە هەیە، لایەنی پۆزەتیڤ و نێگەتیڤەکانی ئەم پرۆژەیە بە باشی دەرناکەوێت. لێرەدا ئاماژە بە چەند ماددەو بڕگەیەکی دەستووری هەمیشەیی پەیوەندار بە نەوت و گاز دەکەین لەوانە:

## یەکەم

«مادەی ١١١»ی دەستووری هەمیشەیی عێراق: نەوت و گاز موڵکی هەموو گەلی عێراقن لە هەموو هەرێم و پارێزگاکانیدا. واتا گشت نەوت و گازی کوردستان موڵکی گەلی عێراقە وەکو نەوت و گازی ناوچەکانی عەرەبستانی عێراق. ئەگەر مرۆڤ هەندێ وردتر و روونتر لەم ماددەیە بڕوانێت و بگەڕێتەوە بۆ چەند ماددەیەکی دیکەی«م٣» ، دەردەکەوێت:
* عێراق بە وتە«العراق» «ال التعريف»واتە یەک«عێراق»ی واحیدی موەحەد..
* گەلانی عێراق بوەتە«گەلی العراق».
* بەمەش:
١ ـ ئەم«العراق»ـە یەک«گەل»ـەو «یەک»خاکەو، لە ماددەیەکی دیکەی دەستووریشدا ناسنامەی ئەم«العراق»ـە وەکو وڵاتێکی عەرەبی پێناسە کراوە... ماددە ٣.

٢ ـ «گەلی»عێراق لە سنووری ٢٨ ملیۆن کەسە. بەڕێوەبردن و نەخشەدانان و چۆنییەتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەو موڵکە لە ڕێگای نوێنەرانییەوە دەبێت. نوێنەرانیش ئەمڕۆ ٢٧٥ ئەندامی ئەنجومەنی نوێنەرانە. لەو ژمارەیەشدا تەنها ٥٣ی لە لیستی کوردستانییە. زۆربەی زۆری بڕیارە چارەنووسسازەکان، «ئەگەر چ پرنسیپی(التوافق)بە تیۆری قەبوڵکراوە» ، بە دەنگدان دەربازبووە. جگە لەو کێشانە کە ڕێژەکەی دیاری کراوە، بڕیارەکانی ئەم ئەنجومەنە بە زۆرینەی سادەیە«١+٥٠»ی ئامادەبووانی دانیشتنێکی یاسایی. واتا«١٣٨»ئەندام. لەو ئەنجومەنە کە نوێنەرایەتی گەلی عێراق دەکات، عەرەب زۆرینەیە. بڕیاری زۆرینەش یەکلاکەرەوەیە. واتا چارەنووسی«نەوت و گاز»وەکو موڵکی هەموو«گەلی عێراق»بە کردەوە بەپێی بڕیارو ئیرادەو بەرژەوەندی عەرەبی عێراق بەڕێوەدەچێت، کە زۆرینەی ئەو«گەلە»یە..

## دووەم

ماددەی ١١٢: سەبارەت بە ناوەڕۆکی ئەم ماددەیە کاتی خۆی لە ڕۆژنامەی «خەبات»بە وردی باسمان کرد. داڕشتنی ئەم ماددەیە پێویستی بە هەموار هەیەو بەو ئومێدەی لایەنی کوردستانی لە لیژنەی پێداچوونەوە بە دەستووری هەمیشەیی چارەسەری بکەن و پێشنیارەکەشمان خستەڕوو. بەدەر لەوەش «پێناسەی الحقل»و «الحقول المنتجه»یش، دوورن ییە ببێتە گرفتێکی دیکە. بەتایبەتی ئەگەر هاتوو هەندێ لە «پاشکۆی ژمارە١ و ژمارە٢و ٣ پرۆژەی یاسای نەوت و گازی ناوەندی بەغدا و پێناسەی «الحقل»و دەسەڵاتەکانی دەزگا ناوەندییەکان... هتد ورد بینەوە، بۆ نموونە دەکرێت ئاماژە بکەین بۆ:

١ لە ماددەی «٤-١٠»یدا، "الحقل " منطقة تحتوي على مكمن او مجموعة مكامن، مجتمعة أو مرتبطة بنفس التركيب الجيولوجي أو الوضع الستتغرافي. أن اسم الحقل يشير الى المنطقة السطحية ولكن ربما يشير أيضا" في ذات الوقت الى السطح و التكوينات المنتجة في باطن الارض.» ، ئەمەش زۆر هەڵدەگرێت، بەدەر لەوانەش:

٢ ـ زاراوەی «الحقول الحاليه المنتجه» لە ماددەی«١١٢»ی دەستووردا هاتووە، لە سەرەتاوە مرۆڤ وای بۆ دەچێت کە بە عەمەلی مەبەست ئەو کێڵگانەن کە

ئێستا بە کردەوە بەرهەمهێنەرن، واتا کێڵگەکانی «کەرکووک و بەسرەو بەشێک لە کێڵگەکانی میسان»، بەڵام کە لە ماددەی «٦ ـ ب»ی پرۆژەی یاسای نەوت و گازی کۆماری عێراق ورد دەبیتەوە، کە دەڵێت(٦ ـ ب): «يتضمن نطاق عمليات شركة النفط الوطنية العراقية ما يلي: اولا ـ ادارة وتشغيل حقول الانتاج الحالية المذكورة في الملحق رقم ـ ١ وترتبط بها كل من شركة نفط الجنوب وشركة نفط الشمال. ثانيا: تطوير وادارة وتشغيل الحقول المكتشفة وغير المطورة المناطقة بها والمذكورة في الملحق ـ ٢.»و، کە تەماشای پاشکۆی ١و پاشکۆی ٢ی، ئەم پرۆژە یاسایە دەکەین، بۆمان دەردەکەوێت: «زاراوەی الحقول الحالية المنتجة» تەجاوزی ئەوەی «المنتجة فعلا» دەکات، ژمارەیەکی کێڵگەی زەبەلاحی دیکەی تێدایە کە ئێستا «بەرهەمهێنەر نییە». پاشکۆی ژمارە١ کە لە ژێر ناونیشانی«الحقول المنتجه»دایە، بریتییە لە ٢٧ کێڵگە کە ٩یان لە کوردستانەو، پاشکۆی ژمارە ٢ «الحقول المنتجة القريبة من عقد الانتاج»یش، بریتییە لە«٢٥»،کە«١٩»ی لە کوردستانە.

٣ ـ لە ماددەی «٨ ـ أ»ی پرۆژەکەو سەبارەت بەو کێڵگانە باسی پاشکۆی ژمارە ١ ناکات، هەروەها ناوەڕۆکی تەڵخ تر دەبێت کە لە زاراوەی«الحقول المنتجه» ورد دەبینەوە، چونکە هەندێ لەو کێڵگانە تەنها لە رووی شکلییەوە «بەرهەمهێنەرن»و پێویستی بە وەبەرهێنانی باشی هەیەو، پرۆژەکە داویەتی بە«کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی عێراق«٨ ـ ا»: فيما يتعلق بالاولويات الهادفة الى اعادة تاهيل وتعزيز الانتاج المقترنة بتحسين استخلاص النفط من الحقول المنتجة حاليا، تعتبر شركة النفط الوطنية العراقية المشغل و المفوض بالدخول مباشرة في عقود الخدمات او عقود الادارة مع شركات مناسبة للنفط او الخدمات، ان اقتضت الحال ذلك من اجل التعجيل في تحقيق الاهداف بمقتضى هذه المادة.) و، لەم دەقەدا هەندێ شتی دیکەشمان بۆ دەردەکەوێت:

١-ماددەی ١١٢ی دەستوور ئاماژەی بە -بەڕێوەبردنی(الحقول الحالية المنتجة)ی نێوان ناوەندو (هەرێم)و پارێزگا بەرهەمهێنەرەکان- کردووە. کەچی لێرە دراوە بە کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی العراق. بەتایبەتی

گرێبەستەکان. بە پێی پلەو پایەی دەستوورو یاسایش، دەستوور بالاترە. واتە ئەم ماددەیە پێویستی بە هەموار هەیە.

٢-دەقی ئەم ماددەیە بە پەناو پێچە: بۆ نموونە: زاراوەی(شرکات مناسبة) گشتییەو لێکدانەوەی جیاجیا هەڵدەگرێ و(پێناسە نەکراوە).

٣-ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ دوا رستە(التعجيل في تحقيق الاهداف بمقتضي هذه المادة)، مەبەست لە(الاهداف) (تاهيل و تطوير الحقول و التنقيب عن النفط و الگاز)ە.

٤-زارەوی (المشغل)و (المفوض): پێناسە کراوە (م٤-٢٣ "المشغل": الهيئة المعينة من قبل الهيئة المختصة بالتشاور مع مالك حق التنقيب و الانتاج للقيام بالعمليات النفطية بالنيابة عن الاخير.) و(الهيئة المختصة)یش پێناسە کراوە (م٤-٣٥): کە وەزارەتی نەوتی ناوەندە، یان کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی (العراق)ە، یان وەزارەتی سەرچاوە سروشتییەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستانە. بەڵام لەم حاڵەتەدا وەکو ئاماژەمان بۆ کرد، دراوە بە کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی العراق و بەپێی (م٦-ب-پێنجەم)یش کۆمپانیای نیشتمانی، کۆمپانیای(مشغل) دروست دەکات کە بە تەواوی خۆی خاوەنداریەتی دەکات، لە(هەرێم) و (پارێزگا بەرهەمهێنەرەکان) بۆ جێبەجێ کردنی ناوەڕۆکی ئەم ماددەیەو، (م٤-١٩) زاراوەی العمليات النفطيه)ی پێناسە کردووە.

٥-ماددەی(٨-ث)کە دەڵێت:(٨-ث: يجب بذل الجهود الحثيثة من اجل ضمان التطوير العاجل و الفعال للحقول المكتشفة غير المطورة كليا او جزئيا عند صدور هذا القانون. على انه يجوز تطوير هذه الحقول مع شركات نفط ذات سمعة محمودة و تتمتع بامكانيات مالية رصينة ومهارات ادارية و تقينية و تشغيلية مرموقة وفقا للصيغ التعاقدية و التعليمات الصادرة من المجلس الاتحادي للنفط و الغاز.)، بە روونی مەبەستی(مشرع) دەردەکەوێت، چ سەبارەت بەباس نەکردنی جۆری گرێبەستەکان، یان زیادکردنی زاراوەی (جزئيا) لە رستەی (حقول مكتشفه غير مطوره كليا...)دا، بەمەش پرۆژەکە دەرگای بە کراوەیی هێڵاوەتەوە بۆ کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی العراق بۆ ئەوەی هەمان مامەڵەش لەگەڵ زیاتر

لەنیوەی کێڵگەکانی پاشکۆی ژمارە(١)یش بکات، هەروەها گشت کێڵگەکانی پاشکۆی ژمارە ٢و، کە لەمەرجەکانی پێویست سەبارەت بەو کۆمپانیانە کە کارەکانیان پێ رادەسپێردرێت ورد دەبینەوە، ئەوە تەنها لە کۆمپانیا گەورەکانی جیهاندا بەدی دەکرێت. گرێبەستەکانیش (تعاقدیە) دەبێت.

٦-مادده(٨-ب)هەمان بۆچوونی پێچاوپێچ و تەڵخی پێوە دیارە، کە دێتە سەر پاشکۆی ژمارە(٣) (الحقول الغیر المنتجە البعیدە من عقد الانتاج)، کۆی گشتیان (٢٦)کێڵگەیە و(١٠)یان لە کوردستانە. بە کورتی لە لایەکەوە کێڵگە بەرهەمهێنەرەکان، دەکەونە دەرەوەی سنووری (هەرێمی کوردستان)ی ئێستاو، کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی العراق بەرپرسیارەو، گشت کێڵگەکانی تری پاشکۆی ژمارە ٣،٢،١یش دراوە بەهەمان کۆمپانیا، هەرچەندە ماددەی ١١٢یش، رێگای داوە دەسەڵاتی کوردیش بەشدار بێت لە بەڕێوەبردنی کێڵگە بەرهەمهێنەرەکانی(ئێستا)ی هەرێمی کوردستان، وەلێ(چۆن و کام و چەند)یان، هێشتا ساغ نەکراوەتەوە..

## سێیەم

دەسەڵاتی ناوەندی بەغدا، بەپشت ئەستووری بەدەسەڵاتە(حصریە)کانی:

١-ماددەی (١١٠-یەکەم) (نەخشەکێشانی سیاسەتی دەرەوە..سیاسەتی قەرزکردن، ئیمزاکردنی گرێبەست و، رەسم کردنی سیاسەتی ئابووری و بازرگانی دەرەوە..)، هەر هەموو ئەم بوارانە لەسەر بنەمای بەرژەوەندی ئابووری بونیاد دەنرێت. بەرژەوەندی ئابووری وڵاتێکیش وەکو العراق مانای نەوت و گازە.

٢-ماددەی(١١٠-سێیەم):نەخشەکێشانی سیاسەتی دارایی. دانانی بودجەی گشتی بۆ دەوڵەت.. یەک لە بنەماکانی ئەو دەسەڵاتەیە بە پێی ئەم ماددەیە، پێناسەی سیاسەتی داراییش، رێک داهات و خەرجی حکومەتی. داهاتی حکومەتی عێراقیش زیاتر لە(٩٥٪)ی ئەو برە پارەیە لە نەوتەکەیەوە دەستی دەکەوێ و، بودجەی دەوڵەتیش لەسەر داهاتی نەوتەکەی دادەنرێت و، ئەگەر لەو رێژەیەش زیاتر نەبێت ئەوە کەمتر نییە..

## چوارەم

لەزۆربەی زۆری ماددەو برگەکانی پرۆژەی یاسای نەوت و گازی کۆماری العراق، مافی بەشداری لایەنی کوردستانی تەحدید کردووە بە(تەنسیق)و (راوێژ)کاری. ئەم پرنسیپەش لە چەندین ماددەو برگەی ئەم پرۆژەیە دووپات بووەتەوە. تەنسیق و راوێژکارییش (مولزم)نییە بۆ خاوەن بریار، کە زۆرینەی(عەرەبی عێراقن).

## پێنجەم

بەدەر لە دەسەلاتەکانی ناوەندی بەغدا، بە(حصریە)کان و(هاوبەشەکان)ەوە، بەپێی ماددەی (٥)ی پرۆژەی یاسای نەوت و گاز، دەسەلاتی جێبەجێ کردنی ناوەرۆکی گشت بوارەکانی کەرتی نەوت و گاز، کە ماددەکانی ئەم پرۆژە یاسایە باسی دەکات، لەچەند ناوەندێکدا کۆ کراوەتەوە وەک:

١-ئەنجومەنی نوێنەرانی العراق: هەموو یاساو رێککەوتننامەکانی پەیوەندار بەکەرتی نەوت و گاز، پەسند کردنیان و دەرچوونیان مافی ئەم دەسەلاتەیە. (ماددەی٥-یەکەم و دووهەم). دیاریشە کە بریارەکانی ئەم ئەنجومەنە ئەگەر رێژەی بۆ دیاری نەکرابێت ئەوە بەزۆرینەی سادە دەبێت و، لەژمارەی ٢٧٥ ئەندامیش تەنها ٥٣ ئەندامی لە لیستی کوردستانین.!

٢-ئەنجومەنی وەزیرانی ناوەندی بەغدا: تەنها ئەم ئەنجومەنە خاوەن دەسەلاتە سەبارەت بە پەسندکردن و سەرپەرشتی کردنی سیاسەتی کەرتی نەوتی العراق لەگشت بوارەکانی. (م٥ -یەکەم، دووەم و، سێیەم).

٣-ئەنجومەنی فیدرالی نەوت و گاز: لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە تەعین دەکرێت، سەرۆک وەزیرانی العراق یان نوێنەرەکەی سەرپەرشتی دەکات و، پێک دێت لە:

١-وەزیرانی نەوت، دارایی و نەخشەکێشان)ی حکومەتی ناوەند.
٢-پارێزگاری بەنکی ناوەندی العراق.
٣-هەر هەرێمێک یەک نوێنەر. لەبەر ئەوەی هەرێمێکی دیکە نییەو تەنها هەرێمی کوردستان هەیە. واتا هەرێمی کوردستان یەک نوێنەری دەبێت.
٤-هەر پارێزگایەکی بەرهەمهێنەری نەوت و گاز، کە لەنێو هەرێمێک نییە، نوێنەرێکی دەبێت.

٥-سەرۆکەکانی جێبەجێکەری گرنگترین دەستگاکانی نەوتی پەیوەندار، لەوانە کۆمپانیای نیشتمانی نەوتی العراق و کۆمپانیای(تسویق)ی نەوت.. هتد
٦-پسپۆڕانی تایبەت بەبواری نەوت و گاز و دارایی و ئابووری، کە لە(٣) کەس زیاتر نەبن بەناوی (مکتب المستشارین المستقلین)..
* ئەم ئەنجومەنە دەسەڵاتێکی فراوانی هەیە(م٥-دووهەم تاکو یازدەهەم).
* مەزندەی ئەندامانی بە(١٥)کەس دەکرێت. مەزەندەی ئەوە دەکرێت تەنها (١-٢)ی ئەو ژمارەیە کورد بێت.
* ئەم ئەنجومەنە خۆی بۆ خۆی «پەیڕەوێکی ناوخۆ دادەنێت».
* بڕیارەکانی بە دەنگدان دەبێت و هەر بڕیارێک «دوو لەسەر سێ»ی دەنگی کۆی گشتی ئەندامانی ئامادەبووانی هەر دانشتنێکی پێویستە. لە کۆی ١٥ ئەندام ١٠ دەنگی پێویستە. جا کورد ئەگەر «٢»یشی هەبێت هیچ ناگۆڕێت لە واقیع.

٤ ـ وەزارەتی نەوتی ناوەند.
٥ ـ کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی عێراق.
٦ ـ «الهیئە الاقلیمیە» تاکو ئێستا وەزیری سەرچاوە سروشتییەکانی «هەرێمی کوردستان»ـە. دەسەڵاتەکانیشی «لە چوارچێوەی «تنسیق»و «راوێژکاری» دەرناچێت. لە خوارەوە دەقی برگەی «ح» ماددەی«٥»تەسبیت دەکەین سەبارەت بە دەسەڵاتی ئەم«هەیئەتە».

«م٥ ـ ح»: تكون للهيئات الاقليمية الاختصاصات التالية:
اولا: تولي التحضيرات اللازمة من اجل اقتراح النشاطات والخطط للسلطات الاتحادية نيابة عن الاقليم لكي يتم تضمين تلك الخطط والنشاطات في الخطط الاتحادية للعمليات النفطية. كما عليها ان تساعد السلطات الاتحادية في المداولات التي تقود الى اتمام الخطط الاتحادية وذلك وفقا للمتطلبات.
ثانيا: القيام باجراءات الترخيص المتعلقة بالنشاطات في الاقليم في مجال التنقيب وتطوير الحقول المكتشفة غير المطورة المذكورة في ملحق رقم ٣ وفقا للاليات المنصوص عليها في المادة ٩ بمشاركة ممثل عن الوزراة وباعتماد النماذج التعاقدية المعدة من قبل المجلس الاتحادي للنفط والغاز وبناء على التعليمات الصادرة من المجلس الاتحادي للنفط والغاز ومع الشركات النفطية العالمية المؤهلة وفق الاسس التي يضعها المجلس الاتحادي للنفط والغاز.

ثالثا: الحضور في المداولات الجارية من قبل المجلس الاتحادي للنفط والغاز وفق احكام المادة ٥ من هذة القانون.
رابعا: التعاون مع الوزارة للقيام بمهام المراقبة والاشراف للعمليات النفطية من اجل ضمان انسجامها مع القوانين والانظمة والتوجهات والشروط الخاصة لعقود التنقيب والانتاج المعنية، لضمان التطبيق الموحد والمتناغم في كافة مناطق العراق.
هەموو دەسەڵاتەکان بریتییە لە خۆسازکردن بۆ ئامادە کردنی «پێشنیار» بۆ دەزگاکانی ناوەندی پەیوەندار. ئەویش لەکاتی پێویست پێشنیاریش وەکو زانراوە «مولزەم» نییە. دەسەڵاتەکانی خاڵی دووەم رووکەشییە، چونکە هەر هەموو لە ژێر چاودێری دەزگاکانی ناوەندەو بەپێی یاساو رێساو مەرجەکانی ناوەندەو، سێهەمیشیان «زیادە»، چونکە هەر خۆی ئەندامە لە ئەنجومەنی ئیتیحادی نەوت و گاز.
بەپێی ماددەی« ١٠ ـ أ»بۆ ئەم هەیئەتە هەیە بەپێی گشت ئەو مەرج و یاساو رێسایانەی دەزگاکانی ناوەندو، بە حزووری نوێنەری ناوەند دانوستاندو ئیمزای «سەرەتایی= اولی» گرێبەست بکات لەو کێڵگانە، کە دەرفەتی پێی دراوە، گرێبەستی وەهایش، ئەودەم کاری پێدەکرێت کە لەلایەن دەزگاکانی ناوەندەوە پەسند بکرێت و، ئەمەش نەخشەی رێگای بۆ دانراوەو، لە ناوەڕۆکدا رۆڵی ئەم «هەیئەتە» لە حاڵەتی هەرێمی کوردستاندا وەزارەتی سەرچاوە سروشتییەکانە تەنها دەوری «منسق» دەبینێت. بە کوردییەکەی هەر ماندووبوونەکەی بۆ دەمێنێتەوە!.

## شەشەم

ئەم پرۆژە یاسایە کۆمەڵێک برگەو ماددەو پرنسیپی جۆراوجۆری تێ ئاخێنراوەو، وەکو تیغی دوودەم وایە، دەکرێت لە کاتی پێویست بەکار بهێندرێت. لەوانە ئەو زنجیرە دامودەزگایەیە بە کۆمەڵێک دەسەڵات و هەندێ جار وەک یەک و هەندێ جار دژ بە یەک و هەندێکیشی ناتەبا لەگەڵ دەستوور. هەروەها پرۆسەی ئیمزاکردنی گرێبستەکان و پەسندکردنی، لایەنێکی تری ئەو گرفتانەیە بۆ نموونە:

١ـ بەپێی دەستوور (ماددەی ١١٢)، هەر وەکو لایەنی کوردستانی تەفسیری دەکەن، بە دەر لەکێڵگەکانی بەرهەم هێنەری ئێستا (الحقول الحالیه المنتجه- کە هەر هەمووی لەدەرەوەی هەرێمە)، وەزارەتی سەرچاوە سروشتییەکانی هەرێمی کوردستان ئەتوانێت لە رێگای کۆمپانیای خۆماڵی خۆی، یان لە رێگای تەرەفی سێیەم (بیانی)، دەست بکات بەئیستغلال کردنی نەوت و گازی گشت ناوچەکای هەرێم، وەلێ هەر لە هەمان دەق و دەقی دیکەی دەستووردا، چ بە هۆی هونەری دارشتنی دەقەکان و، چ بە حوکمی هەندێ لە ماددەو برگەکانی پرۆژەی یاسای نەوت و گازی ناوەندی بەغدا، نەک هەر ئەو مافە لە زۆر بواریدا، سنووردار کراوەو شێوێنراوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەندێکی قەتیس و وەلاوەنراوە.

٢ـ هەتاکو ئەگەر لایەنی کوردستانی گرێبەستێکیش ئیمزا بکات، بەپێی هەموو ئەو مەرج و دەسەڵاتەی ناوەند، ئەو پێکهاتن و ئیمزا کردنە (ئەولی)ـە، گرێبەستەکە دەروات بۆ ناوەند، نەک بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان. لە ئەنجومەنی ئیتحادی نەوت و گاز عەرز دەکرێت (م١٠ ـ أ)ی پرۆژەکە دەدرێت بە (مەکتەبی راوێژکارانی سەربەخۆ). شێوەو شێوازی ئەم دەستگایە واتا (ئەنجومەنی ئیتحادی) لە پێکهاتەو لە مامەڵە کردنی و لە شێوەی دەنگداندا، رۆڵ و گرنگی لایەنی کوردستانی پەراوێز دەکات و شێوەی دەنگدانەکەشی هیچی وەهای بۆ ناهێڵێتەوە. ئەمەش ماددەی ١٠ی پرۆژەکە بە وردی باسی دەکات:

١- ماددة (١٠-ب: تنص عقود التنقيب و الانتاج المشار اليها في المادة (١٠-ا) على مايلي: يكون العقد نافذا ما لم يمانع المجلس الاتحادي للنفط و الغاز وفقا لاحكام قانون النفط والغاز المرقم() لعام ٢٠٠٧ بما في ذلك الاليات المنظمة للتفاوض و التعاقد و نماذج العقود و ما قد يصدر من تعديلات بهذا الخصوص من قبل المجلس الاتحادي للنفط و الغاز).

٢- (١٠-ت: يجب احالة العقد الاولي المشار اليه في المادة (١٠-ب) الى المجلس الاتحادي للنفط و الغاز خلال (٣٠) يوما من التوقيع الاولي عليه، والا يعتبر لاغيا)

٣- (١٠-ث: يتبع المجلس الاتحادي للنفط و الغاز عن اتخاذ قراراته بشأن العقود المرفوعة اليه.. الخطوات التالية:
١- احالة العقد الاولي المذكور في المادة (١٠-ت) ان ارتأى المجلس الاتحادي للنفط و الغاز الى مكتب المستشارين المستقلين لدراسة و بيان الرأي بشانه و مدي تطابقه مع نماذج العقود المعتمدة من المجلس الاتحادي للنفط و الغاز و التعليمات الصادرة عنه المنظمة لتراخيص التنقيب و الانتاج، حسب المادة (٩)
٢- في حالة وجود انحرافات جدية في العقد الاولي عن نماذج العقود و التعليمات الصادرة عن المجلس الاتحادي للنفط و الغاز يتخذ المجلس الاتحادي للنفط و الغاز قراراته النهائية باغلبية ثلثي الاعضاء الحاضرين، مسترشدا بتوصيات مكتب المستشارين المستقلين.)
٣- تبلغ الوزارة او شركة النفط الوطنية او الهيئة الاقليمية بقرار الممانعة على العقد الاولي والاسباب الموجبة خلال (٦٠) ستين يوما من استلام العقد الاولي من قبل المجلس الاتحادي للنفط و الغاز ويعتبر العقد الاولي موافق عليه في حالة عدم صدور قرار من المجلس بعد مضي الفترة المذكورة. وفي حالة تعذر عقد اجتماع المجلس الاتحادي للنفط و الغاز خلال (٦٠)ستين يوما من استلامه للعقد الاولي، فعلى المجلس ان يتخذ قراره بشانه خلال ال (٤٥) الخمسة و الاربعين يوما التالية باستخدام مختلف و سائل الاتصال المتاحة، و سيعتبر العقد نافذا في حال عدم صدور القرار بعد انقضاء المدة المذكورة)

لەم چەند بڕگەیەدا چیمان بۆ دەردەکەوێت...؟
١ـ ئەم پرۆژە یاسایە چ بەم بڕگانەو چ بە ماددەو بڕگەی دیکە، گەمارۆی ئەو چەند پرنسیپانەیان داوە کە لە دەستووری هەمیشەییدا تەسبیت کراون، لەگەڵ کەم و کورتی ئەو دەقانەو، ئەو هەوڵانەشدا کە ئێستا لە ئارادان بۆ لادان و نەهێشتن، یان هەر چ نەبێت لاوازکردنیان، کە لەلایەن لیژنەی داڕشتنەوەوە دەدرێت.
٢ـ هەتاکو ئەو دەسەڵات و مافانەش کە لێرەو لەوێی ئەم پرۆژەیە ئاماژەی بۆ کراوەو، لەم ماددەیەو لە ماددەی دیکەدا، یان (نسخ) کراوە، یان لێکدانەوەی

جیا جیای بۆ دەکرێت و، یان ناوەڕۆکیان شێوێنراون. واتە بە رووکەشی وەکو دروشم تەسبیت کراون، کەچی لە ناوەڕۆکدا کە بە یەکترەوە گرێدەدرێنەوە زۆربەیان پووچ و بەتاڵ دەبێتەوە.

٣ـ وەک دەبینین دەقی یاساکە پڕە لە پێچ و پەنا، بۆ نموونە: کە ناوەند گرێبەستی نموونەیی دانێت. کە جۆری کۆمپانیاکان دەست نیشان بکات. کە بەپێی یاسا کێڵگەکان دیاری کات. کە بڕی نەوت و گازی دەرهێنراوە، رۆژانەو ساڵانە هەر لە سەرەتاوە ببڕێتەوە، کە شێوەو شێوازی گفتوگۆ و نوێنەرایەتی خۆی دەستنیشان بکات، کە بڕیاری پەسند کردنیان رەتکردنەوەی بەدەستی خودی ناوەند بێت...هتد، ئیدی چی بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان ماوەتەوە لە غەیری ماندوبوون و دەلالی. دەڵێن کورد بەشدارە لە هەموو قۆناغەکان، بەڵێ راستە، بەلام دیارە کە هەر هەموو بۆ شاهیدی ئەشهەدوبیلایە.!

٤ـ **قۆناغ و شێوەی پیاچوونەوەو بڕیاردان لەسەر گرێبەستەکان:** گرێبەستەکان دەنێردرێن بۆ ئەنجومەنی ئیتحادی. ئەوان دەیدەنە مەکتەبی راوێژکاران تەماشای دەکەن. بڕیاردان لەسەر ئەو گرێبەستانە بە دەنگدان دەبێت. دەنگدانیش رێژەییە. رێژەی پێویستیش دوو لەسەر سێی ئامادەبووانی ئەو دانیشتنەیە نەک کۆی گشتیان. با وای دابنێین ژمارەی ئەندامانی ئەنجومەن ١٥ کەسن. لەو دانیشتنەدا کە بڕیار دەدەن ٥ کەس ئامادەبوو، یان کەمتر. ئەگەر ٥ بن ٣یان بەسە دەنگ بە (بەڵێ) یان بە(نە) بدەن و دەبێ بە بڕیار. ئەگەر ١٠یان ئامادەبێت ئەوە ٧ دەنگ بەسە. ئەگەر هەر هەموویان ئامادە بن ئەوا ١٠ دەنگی دەوێت. بۆیە سەرۆکی ئەم ئەنجومەنە کە سەرۆک وەزیرانی حکومەتی ناوەندە، زۆر بە باشی دەتوانێت ژمارەو کاتی دەنگدانەکە وا رێکبخات کە بە دڵی خۆی بێت. چونکە لەلایەکەوە ئەندامانی ئەنجومەنی ئیتحادی نەوت و گازی کۆماری عێراق لەلایەن سەرۆک وەزیرانی حکومەتی ناوەندەوە تەعیین دەکرێن و، لەلایەکی دیکەوە هەموویان لە ئاستی وەزیرو کارمەندی پلە بەرزی حکومەتن. واتا دوا بڕیار لای حکومەتە. هەروەها ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری عێراق، پەیوەندار نییە بە گرێبەستەکانەوە، بە واتایەکی دیکە ئەو گرێبەستانە ناگەڕێنەوە بۆ ئەنجومەنی نوێنەران بۆ باس و بڕیاردان لەسەری، ئەمەش یەک لە

لایەنە هەرە لاوازەکانی ئەم پرۆژە یاسایەیە، بە پێچەوانەی زۆر وڵاتانی دیکە، ئەم جۆرە گرێبەستانە دەگەڕێنەوە بۆ پەرلەمانەکەیان بۆ بڕیاردان لەسەری، ئەمەش کێشەیەکی سادەو ئاساییە، چونکە نەوت و گاز کاڵایەکی ئیستراتیژی و حەیاتییە بۆ خەڵکی ئەو وڵاتانە. لە عێراق لە سنووری ٩٨٪ داهاتی وڵاتەکەیە. جا ئەگەر پەرلەمانێک ئاگای لە وردەکاری و ناوەڕۆک و کەین و بەینی ئەو گرێبەستانە نەبێت سەبارەت بەم کاڵایە، ئیدی دەبێت ئاگای لە کوێ و لە چی ئابووری وڵاتەکەی بێت..؟!

٥ـ وەکو دیارە پێکهاتەی (ئەنجومەنی ئیتحادی) بەپێی ئەم پرۆژە یاسایە، دەبێت ڕەنگدانەوەی پێکهاتەی عێراق بێت: م٥-ت-٦: ویراعی في تشكيل المجلس الاتحادي للنفط والغاز تمثيله للمكونات الأساسية للشعب العراقي) بەپێی مادده ١٠ ـ ث ـ ثالثا: لەسەر ئەنجومەنی ئیتحادیە لە ماوەی ٦٠ ڕۆژ لە (ڕۆژی وەرگرتنی گرێبەستێک)، بڕیاری ڕازی نەبونی خۆی بدات لەگەڵ ڕوونکردنەوەی هۆکارەکان، بەڵام ئەگەر وەڵام نەبوو لەو ماوەیەدا ئەوە گرێبەستەکە قبوولکراوەو کاری پێدەکرێت (ويعتبر العقد الاولي موافق عليه في حالة عدم صدور قرار من المجلس بعد مضي الفترة المذكورة) با وا پێشبینی بکەین یەکێک لەو پێکهاتانە ویستی گرفت دروست بکات، یا ئەگەر (لە نێو ئەنجومەن یان ئەنجومەن خۆی) لەبەر هەر هۆکارێک بێت لە ماوەی دیاری کراو بیەوێت یان بیانەوێت (مماطله) بکەن، یان سەرۆک وەزیران مەودای بڕیاردان نەدات، یان ئەنجومەنەکە کۆ نەکاتەوە، ئەوە، گرێبەستەکە دەرباز دەبێت با کەم و کورتیشی زۆر بێت.

## حەوتەم

ماددەی ١١ـ أ: جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە یاسایەک دەردەچێت بە ناوی یاسای داهاتی فیدراڵ تیایدا:

١ـ چۆنیەتی دابەش کردنی داهاتی نەوت و گاز بەپێی ماددەکانی دەستوور دیاری دەکات.

٢ـ حیسابێک دەکرێتەوە بە ناوی سەندوقی داهاتی نەوت دەبێت گشت داهاتی نەوت و گاز ڕەوانەی ئەوێ بکرێت، یاساکەش میکانیزمی چۆنیەتی ئیدارەکردنی ئەو سەندووقە و دابەش کردنی ئەو داهاتە ڕێکدەخات.

٣ـ سەندووقێکی دیکەش دروست دەکرێت بە ناوی سندووقی ئاینده، رێژەیەک لە داهاتی نەوتی بۆ دیاری دەکرێت، ئەمەش بە یاسایەکی تایبەتی رێکدەخرێت.

هێشتا ئەو دوو یاسایە بیرۆکەن و نازاندرێت ناوەڕۆکی چییە، بە تایبەتی بۆ خەڵکی کوردستان: ئایا ئەو حیسابە لە دەرەوەی وڵات دەبێت یان لە ناوەوە...؟ و بەشی هەرێمی کوردستان چەندو لە کوێ دەبێت و؟ کێ ئیدارەی ئەو دووسندوقە دەکات و..؟ ئەو پارەیە بە چ عوملەیەک دەبێت و...؟ لایەنی کوردستانی دەسەڵاتی چەندەو چۆنە سەبارەت بە بەشی خۆی.... هتد...؟ ئەمانە کۆمەڵێک پرسیارن پێویستییان بە وەڵام هەیە... بۆیە باشتر وایە پێش پەسندکردن و دەرچواندنی پرۆژەی یاسای نەوت و گازی کۆماری عێراق هەموو کێشەکان چارەسەر بکرێن وەک یەک پاکێت و بخرێنە بەردەم رای گشتی عێراقی و کوردی و پاش ئەوە بدرێت بە ئەنجومەنی نوێنەرانی کۆماری عێراق بۆ باسکردن و دەرچوواندنیان، بەتایبەتی: یاسایی داهاتی ئابووری نەوتی فیدراڵ. یاسای سندووقی ئایندەو جۆر و مەرجەکانی گرێبەستەکان و ئەو مەرجانەی کە پێویستە لە کۆمپانیا خۆماڵی و بیانییەکاندا هەبێت و مەرج و شێوەو شێوازی گفتوگۆ... هتد، هەروەها چارەسەرکردنی کەم و کورتییەکانی هەردوو دیکۆمێنت: دەستووری هەمیشەیی و پرۆژە یاسای نەوت و گازیش...

## هەشتەم

هەر وەکو پێشتر باسمان کرد ئەم پرۆژە یاسایە دەرگای بواری کەرتی نەوت و گازی العراقی بۆ کۆمپانیا بیانییەکان و، بە تەحدید ئەمریکی و ئینگلیزی، کردوەتەوەو، بنەمای گرێبەستەکانیش (مشارکە الانتاج)ە ئەم جۆرە گرێبەستانەش، نەک هەر کۆنن و کاتیان بە سەر چووە، بەڵکو چەترێک و حیلە شەرعیەیەکە بۆ هەرزانفرۆشی نەوت و گازی وڵات و، لە دەستدانی سەروەت و سامانێکی زۆرە، کە وەکو سوود دەگەڕێنەوە بۆ کۆمپانیا زەبەلاحەکانی و، گەڕانەوەی نفووز و دەسەڵاتیانە، پاش دوورخستنەوەیان بۆ ماوەی نزیکەی نیو سەدە، ئەم گۆڕانکارییە زەمینە خۆشکەرە بۆ فشارو دەستتێوەردانی ئەم کۆمپانیا زەبەلاحانەو بە تەحدید فەرز کردنی ئەجیندەکانی زلهێزەکان و لە پێش هەمووشیانەوە ئەمریکا، لە ناوچەیەکی وا ئاڵۆزو نا سەقامگیر، مەعلومیشە چارەنووسی کوردو، زۆر لە تراجیدیەکانی ئەم نەتەوە

لەبەشی باشووری، دەگەڕێتەوە بۆ بوونی ئەم سەروەت و سامانە، چ لە دروست بوونی زۆربەی رژێمە یەک لە دوای یەکەکانی العراق لەسەر دەست و بە پشتیوانی ئەو زلهێزانەو لە پێش هەمووشیانەوە ئەمریکا کە لە زۆر بواردا رێخۆشکەرو پاڵپشتی رژێمی گۆڕ بە گۆڕی سەددام بوو لە بەهێزکردنی و لە تەعریب و لە ئەنفال و کیمیابارانی هەڵەبجە، واتا جینۆساید کردنی کورد. ئەوە چوار ساڵیشە ئەمریکا دەسەڵاتی فیعلی و داگیرکەری (العراق)ـە بە کوردستانی باشوورمانیشەوە، کەچی هێشتا تەعریب بەردەوامە. کورد تەهجیرو تیرۆر دەکرێت لەسەر ناسنامەو، دەسەڵاتی ناوەند بە هەموو لاوازیەکیەوە لە هەوڵی دروست کردنی گرفتەو، هەمیشە خولیای پاشگەزبوونەوەیە هەتاکو لەو گفتانەی کە خۆیان داویانەو دیکۆمێنت کراون...!

ئێمە دژی پرنسیپی (خصخصە) کردنی کەرتی پیشەسازی نەوت نین، یان هاتنی کۆمپانیا بیانییەکان، یان بوونی ئەمریکا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، یان داکۆکی لە بەرژەوەندییەکانی خۆی.. هتد.

مەترسی ئێمە لەوەدایە، ئەمریکا نەوتی ناوچەکەی دەوێت. بۆ نەوتی (العراق) هاتووەو دەیەوێت. لەم (العراق)ـە کوردو پارچەیەکی کوردستان هەیەو بە زۆری زۆرداری کراوە بە بەشێک لە (العراق)و، هۆکاری سەرەکیش نەوتەکەیەتی کە لە کوردستان بووە. ئەم واقیعە تاڵە زلهێزەکان فەرزیان کردووە، بۆیە کوردی (العراق) کێشەیەکی هەیە. بۆ یەک سەدەیە لە ململانێدایە لەگەڵ داگیرکەرانی. جگە لە فاکتەری زاتی خودی جوڵانەوەی رزگاریخوازی کورد، ئەمریکا یەک لە هۆکارە سەرەکییەکانی زۆربەی هەرە زۆری تراجیدیەکانی پاش شەڕی جیهانی دووەهەمی خەڵکی کوردستانە، چ لە دروست کردن و پشتگیری کردنی ئەم رژێم یان ئەوی تری ئەم (العراق)ـەو بە تەحدید رژێمی سەدامی خوێنڕێژ، هەر وەک باسمان کرد، یان بە دەستتێوەردان و بە کارهێنانی ئەم بزووتنەوەیە لە قۆناغە جیاجیاکاندا بۆ مەرام و بەرژەوەندی تایبەتی خۆی، نسکۆی ١٩٧٥ و کۆڕەوەکەی ١٩٩١ و قۆناغی پاش ئەوەش و، سەرەتاکانی ٢٠٠٣ بە ئەمڕۆیشەوە دەرئەنجامەکانیەتی لە هەموو سەراوو دەراوەکان، ئەمەریکا، بە هیچ شێوەیەک مەودای ئەوەی نەداوە کورد کیانی سەربەخۆی خۆی هەبێت... ئەمریکا نەوت و بازاڕی گەورەی دەوێت و، هەوڵی قووتدانێکی بێ گیروگرفتیان دەدات. بەرژەوەندی ئەو لەگەڵ گشت نەوتی

(العراق)ـه نەک (بەشێکی)، لەگەڵ گشت بازاڕی (العراق و ناوچەکەیە، نەک، پارچەیەکی)، لە گەڵ یەکێتی خاکی العراق. لەگەڵ (گەلی العراق)ـە (نەک گەلانی)، لەگەڵ کیانی یەکگرتووی (العراق و ناوچەکەیەو ڕێزگرتن لەو سنوورانەی کە خۆی و هاوکارانیان تەسبیتیان کردووە، نەک گۆڕینی)، ئەمریکا لەگەڵ زیندووە نەک مردوو. کارتی هێزو توانای خۆی بەکار دێنێت و، لەسەر ئەوەش دروست و گەورە بووە، کوردیش بەش بە حاڵی خۆی کارتی (نەوت) و هێزی خۆی هەیە. ئەگەر بە باشی بەکاری بهێنێت ئەتوانێت ئەم جۆرە قاڵبدانەو ئەو جۆرە قەوارەیە بگۆڕێت، ئەمریکا خۆی و ئەو هێزانەی کە حیسابیان بۆ دەکات لە (العراق)، هەمیشە لە هەوڵی بچووک کردنی کوردستانی باشوورو دەسەڵاتی کوردن لە پێناوی ئەو بەرژەوەندییە ئامادەن هەر چۆن ئامادە بوون بەش بەشمان کەن و لە کاتی پێویستدا بمانفرۆشن، هیواداریین ئەو کوردانە کە(موریدو دەروێشی ئیدارەی جۆرج دەبلیو بۆش)ن تەنگەنەفەس نەبن و خراپ لێمان تێنەگەن..!
کورد قوربانی سیاسەتی زلهێزەکانە. بە خەباتێکی دوورو درێژو زەحمەتێکی زۆرو بە خوێن و فرمێسک نزیکی ئامانج دەبێتەوە، کەچی زۆر بە ئاسانی و سوک و لە ماوەیەکی کەمدا لە دەستی دەدات. ئەمڕۆ کلیلی کێشەی کورد لە بەغدا نییە. لای ئەمریکایە. نەوتی کوردستان بۆ بەغدا نییە بۆ ئەمریکایە. بۆیە دەبێت سەرانی کورد گشت کارتەکانی کێشەی کورد بە تایبەتی نەوت لەگەڵ ئەمریکا روونترو وردترو جەربەزەتر باس بکات، ئەگەر وەکو ئەوەی (دەروێشان و مووریدانی کاکە(بۆش) بانگێشەی بۆ دەکەن) کە ئەمریکا، دەوڵەتی کوردیمان بۆ دادەمەزرێنێت و کیانی کوردستانیمان بۆ مسۆگەر دەکات، و ئەمن و ئاسایشمان بۆ تەئمین دەکات و باری ژیانی خەڵکیمان بۆ خۆشتر دەکات، هەرزانی و ئاوەدانکردنەوەو ژێرخانی ئابووریمان بۆ سازدەکات و، دیموکراتی و ئەم دەست و ئەو دەستی دەسەڵاتمان بۆ دەڕەخسێنێت، ئەڵێین ئەگەر وایە نەک هەر نەوتەکەمان کە هەمیشە تاڵانکراوە، پێشکەش و عافیەتی بێت، بەڵکو با کوردیش جەندرمەی بێت. کاتی ئەوە هاتووە، واتا پێش دەرچواندنی ئەم جۆرە یاسانەو، دەرباز بوونی ئیدارەی بۆش لەم قەیرانە، لایەنی کوردستانی ساغی کاتەوە، چی دەوێت لە ئەمریکاو ئەمریکا چی بۆ دەکات و، خۆی چی پێ دەکرێت و لە هەموو ئەو حاڵەتانە دەبێت خەڵکی کوردستان ئاگادار بکرێتەوەو ئامادەبێت بۆ هەر ئەگەرێک. خۆ قەزەلاندن و لەزەت وەرگرتن لە بێ

دەسەڵاتی نرخی تەنها ئابرو چوون و ریسوایی نییە، بەڵکو تراجیدیای گەورەی لە دوایە...
ئەم پرۆژە یاسایە یەک لە پرۆژە گەورەکانی ئیدارەی (بۆش)ـە لە العراق، کە زۆر بە هەند وەریگرتووە. جەخت کردنی سەرانی العراق لەسەر(خصخصە)و گەڕانەوە بۆ کۆمپانیا بیانییەکان لە بواری نەوت و گازو لەسەر بنەمای (مشارکە الانتاج) یان گرێبەستی دیکەی وەک ئەوە، پیادەکردن و ملکەچکردنە بۆ ئەو خواست و ویستە کە لە زۆر بواریدا هاوتەریب نییە لەگەڵ خواست و ویستی گەل و نیشتمان. بۆ ئەوەی هەندێ ئەم لایەنە روونکەینەوە، ئەڵێین:
نەوتی العراق هەم زۆرەو هەم نایابەو هەمیش تێچووی دەرهێنانی هەرزانە. تێچووی یەک بەرمیلی نەوتی خاو مەزەندە دەکرێت لە نێوان (٥،.-٣) دۆلار. ئەگەر نرخی یەک بەرمیلی نەوتی خاو بە (٦١) دۆلار حیساب بکەین و (٥٪) سوودی یەک بەرمیل پاش دەرکردنی خەرجی دەرهێنان بۆ کۆمپانیاکە بێت بە پێی گرێبەستی (مشارکە الانتاج)و، لە حاڵەتی تێچووی گشتی یەک بەرمیل بە (١) دۆلار ئەوە:
سوودی کۆمپانیاکە (٣) دۆلار دەبێت. واتە بەرامبەر کەمتر لە (١) دۆلاری وەبەرهێنان لە لایەنی کۆمپانیاکەوە، (٣) دۆلار قازانج دەکات، واتا ٣٠٠٪، لە چی کەرتێکی خزمەتگوزاری یان کشتوکاڵی یان پیشەسازی رێژەی قازانج (٣٠٠٪)ـە. جا ئەگەر رێژەی سوودی کۆمپانییەکان بکرێت بە (١٠٪ یان ٢٠٪) ئەوە قازانجییان لە (٦٠٠٪)، یان (١٢٠٠٪) زیاتر دەبێت. ئەگەر ئەمە فەرهودو تاڵان نەبێت دەبێت چی بێت...؟!
هەندێ لە بەرپرسانی کوردو عەرەبی العراق، بۆ پاساودانی تاڵان کردنی ئەو سەروەت و سامانە، پەنا دەبەن بۆ بارودۆخی ئابووری کوردستان و العراق و دارمانی ژێرخانەکەی و بێکاری و پێداویستی ئاوەدانکردنەوەو گەشە پێدان، و نەبوونی سەرمایە....هتد
عێراق بە گشتی و کوردستان بە تایبەتی وڵاتێکی دەوڵەمەندە. سەرەڕای کارەساتەکانی رژێمە یەک لە دوای یەکەکانی و بەتایبەتی سەدامی گۆڕ بە گۆڕ وڕژێمەکەی و، ئەو هەموو گرفت و تێکدان و ئیرهاب و گەندەڵی و، دزی و جەردەییە، تۆێژەیەکی زۆری بەرپرسانی و، مافیاکانی تاوانی مونەزەمی ئابووری و بازرگانی ناوەوەو دەرەوە، کە داگیرکەری ئەمریکی، پاش قۆناغی(رزگار)ی،

پاڵپشت و زەمینەخۆشکەری بەرچاوییەتی (بە پێی راپۆرتی پشکنینی دەزگا فەرمییەکانی خودی ئەمریکا)، دەڵێین لەپاش هەر هەموو ئەمانە، بە ئیمکانیاتی خودی عێراقییەکان رۆژانە بەرهەمی دەرهێنانی نەوت لە سنووری (٣) ملیۆن بەرمیلە (بەو نەوتەیشەوە کە مافیاکانی دەسەلات و ئیرهابییەکان تەهریبی دەکەن). داهاتی رۆژانەی لە (١٨٠) ملیۆن دۆلار تێدەپەرێت. ساڵانە دەگاتە(٦٥) ملیار دۆلار. بەم ئیمکانیاتە و بەم یەدەگە زۆرەی نەوتەکەی، دەتواندرێت بە چەندین شێوە و شێواز سەرمایەی پێویست تەئمین بکرێت بۆ چاکسازی و گەشەپێدانی کەرتی نەوت، چ لە رێگای کرینی خزمەتگوزاری هونەری و ئیداری بە نەوتی خاو، بۆ نموونە بۆ (ماوەی ٥ ساڵ و ١٠ ساڵ)و، چ لە رێگای ئاڵوگۆری نەوت بە سەرمایەو تەکنەلۆجیای پێویست لەگەڵ وڵاتان و کۆمپانیاکانی دەرەوەی بازنەی زەبەلاحەکان. بازارو بازرگانی نەوت، ئەزموونێکی دەوڵەمەندی هەیە لە جیهان و ئەلتەرناتیڤیش زۆرە. دەسەلاتی ناوەندی بەغدا دەتوانێت:

١- ساڵانە برە پارەیەک بە ناوی (وەبەرهێنان) لە داهاتی نەوت وەلاوەنێت، بۆ گەشەپێدانی کێڵگە بەرهەمهێنەرەکانی ئێستا. پسپۆرانی ئەم میانە پێویستی ساڵانەی (وەبەرهێنان) لە بواری نەوتی العراق مەزندە دەکەن بە (٢,٥- ٣) ملیار دۆلار بۆ ماوەی (٣) ساڵ. لە بودجەی ساڵی ٢٠٠٥ کە(٣٠) ملیار دۆلار بۆ (٣) ملیاری تەخصیص کرا بوو بۆ وەبەرهێنان لە کەرتی نەوت، واتا(١٠٪) ئەو بودجەیە. بودجەی ساڵی ٢٠٠٧ لە سنووری (٤٢) ملیار دۆلارە، دەکرێت هەر بە هەمان رێژە (٤,٢) ملیار دۆلار تەرخان بکرێت بۆ هەمان مەبەست.

٢- حکومەتی ناوەند راستەوخۆ، یان لە رێگای وەزارەتی نەوت، یان کۆمپانیای نەوتی نیشتمانی، یان هەر دەزگایەکی دیکەی پەیوەندار بە کەرتی نەوت و گاز، هەڵسێت بە قەرزکردنی برە پارەیەکی پێویست لە حکومەتە بیانییەکان، یان دەزگا نێودەوڵەتییەکان و، گەرەنتیەکەشی نەوت و گازەکە بێت..

٣- لە بانک و بنکەو دەزگاکانی ئابووری ناوخۆ و ئیقلیمی و جیهانی، یان لە رێگای دەرکردنی (سندات)ی تایبەت لەلایەن حکومەتی العراق و، فرۆشتنی بە هاووڵاتیان، یان دەزگای گشتی و تایبەتی، دیسان گەرەنتی نەوتی خاو و گاز و موشتەقاتی بێت...

٤- له ڕێگای بانگێشەکردنی کۆمپانیای نەوتی بیانی و به پێی گرێبەستەکانی ناسراو بە(خزمەتگوزاری)، (بەڕێوەبردن)، (دووبارە کڕینەوە)، (مەترسییەکانی خزمەتگوزاری)، (گەشەپێدانی بەرهەمهێنان)...هتد. بە خیلافی گرێبەستی (مشارکە الانتاج)، ئەم جۆرە گرێبەستانە، کۆمپانیا بیانییەکان دوور دەخاتەوە له خاوەنداری نەوتی کێڵگەکان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، دەرفەتیش دروست دەبێت بۆ وەبەرهێنانی ئەو کۆمپانیانە، واتە عەرزی تەکنۆلۆجیاو سەرمایە لەلایەن بیانییەکان و، کڕینی خزمەتیان بە گەرەنتی نەوت و گاز لەلایەن دام و دەزگاکانی العراق.

## نۆیەم

ئەمڕۆ(العراق) داگیر کراوە. دەسەڵاتی ناوەند لاوازو بێ توانایە. دۆسیەی نەوت و ئابووری و ئەمن و ئاسایش هێشتا لای داگیرکەری ئەمریکییە. شەڕی ناوخو تاکو دێت توندوتیژتر دەبێت. گەندەڵی سیاسی و ئیداری و ئابووری له لوتکەیە. دەستتێوەردانی ئیقلیمی و نێودەوڵەتی له پەرەسەندندایە. کەڵەکەبوونی گشت لایەنە نیگەتیڤەکانی ڕژێمی سەددام و، دارمانی ژێر خانی ئابووری و دەرئەنجامەکانی شەڕەکانی و سیاسەتی دیکتاتۆری و فاشی ڕەفتارەکەی، هەر هەموو ئەمانەو فاکتەری دیکەش وای کردووە دەسەڵاتی ئێستای (العراق) تواناو و بواری و توێژی ئەوتۆی نەبێت، کە بکەوێتە ژێر باری جۆرە ڕێککەوتنێکی درێژخایەن و، گرێبەستی (مشارکە الانتاج) لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوتی زەبەلاح، چونکە ئەم پرۆژە یاسایە، هەر وەکو لە چەند جێگای ئەم بابەتە ئاماژەمان بۆ کردووە دەرگای والاکردووە بۆ ئەو جۆرە گرێبەستانەو، زەمینەشی خۆش کردووە بۆ ئەوکۆمپانیانە کە زیاتر لە (٨٣٪) یەدەگی نەوتی العراق مەنەپۆڵ بکەن و، لە ئاستە جیاجیاکانی دەسەلات و ناوەندەکانی بڕیاری فەرمی، ژمارەیەک (دەلاڵیان) هەیە کە کار بۆ هەمان مەبەست دەکەن....!

هەندێ له سەرانی فەرمی بەغداو بگرە لە هەرێمی کوردستانیش، به نهێنی و له پشت خەڵکی کوردستانەوە، کار(بۆ) و(لەم) پرۆژە یاسایە دەکەن. تاکو ئەم سات و ئانە، جگە لە هەندێ قسەی هەڵدانی گشتی نەبێت بە شان و باڵی ئەم پرۆژەیەدا، کە جارو بار دەیخزێننە نێو دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە، تاکو ئێستا پرۆژە یاساکە

هێشتا نهێنیه بۆ خەڵکی العراق و کوردستان. له واقیعدا ئەم جۆره رەفتاره، له بارەیەوه، نوێ نییه، به تایبەتی له هەرێمی کوردستان، بەڵکو دەگەڕێتەوه بۆ سەرەتای ئەم سەدەیەو به تەحدید بۆ ساڵانی پاش ٢٠٠٠.
ئاشکرایه له پاش رووداوی ١١/ ئەیلولی/٢٠٠١، نەخشەی رمانی سەدام و رژێمەکەی له لایەن ئەمریکاوه له قۆناغی گومان دەرکەوت. له نێوان ساڵانی (٢٠٠٣ـ٢٠٠٤) هەردوو ئیدارەی حکومەتی هەرێمی کوردستان(هەولێر و سلێمانی) چەند گرێبەستێکیان ئیمزا کرد لەگەڵ کۆمپانیاکانی نەوتی(تورکی)و هاوبەشی (تورکی و نەرویجی)و لایەنی دیکەیش. لای کەمەوه دووانیان له ئیدارەی سلێمانی و دووانی دیکەیان له ئیدارەی هەولێر. ئەگەر چی ئەم گرێبەستانه زۆر به نهێنی بوو بۆ کوردو راگەیاندنی کوردستان و دام و دەزگا فەرمییەکانی هەردوو ئیدارەو، هەروەها هەتاکو له پەرلەمانی کوردستان شاردرایەوەو له زۆربەی هەره زۆری ئەندامانی هەردوو حکومەتەکەی ئەو سەردەمە. له ئاستی سەرکردایەتی هەردوو حزبی دەسەڵاتداریش. (یەکێتی و پارتی) له چەند کەسێکی لوتکەی دەسەڵات و هەندێ دەستوپەیوەندی ئەوانه نەبێت، که کەمترن له پەنجەی دەست، نەک هەر ئەوانی دیکه بێ ئاگابوون له ناوەڕۆکی ئەو گرێبەستانه، بەڵکو هەتاکو له بەستنی یان هەر بوونیانیش. دواترو، له رێگای چەند کەناڵێکی راگەیاندنی بیانییەوه، هەندێ زانیاری لەسەر ئەو گرێبەستانه بڵاوکرایەوه، ئەودەم و به ئەمڕۆیشەوه تەفاصیل و ناوەڕۆکی ئەو چوار گرێبەستانه (تەلەسمێکه) بۆ خەڵکی کوردستان و حزب و لایەنەکانی سیاسی و رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی ئەم وڵاته، کەچی هەر له سەرەتاوه دەسەڵاتدارانی تورکی نەیاری کوردو دەسەڵات و خەڵکی دیکەی بیانی و ناوەندەکانی دیکەی پەیوەندار به پیشەسازی نەوت له تەفاصیلی ئەو گرێبەستانه ئاگاداربوون و به حکومەتی ئێستای ناوندی عێراقیشەوه..!
به هەر حاڵ مرۆڤ سەرسامه له مامەڵەی سەرانی فەرمی هەرێمی کوردستان سەبارەت به کاڵایەکی وەها ئیستراتیجی و گرنگ بۆ ئەمڕۆ و ئایندەی خەڵکی کوردستان و، ئاستی هەست کردنیان به مەسئوولیەت بەرامبەر ئەو خەڵکه و قوربانییەکانی، تۆ بڵێیت ئەمه بێ باوەڕی بێت به خەڵک، به رای گشتی کوردستان، به ناوەندەکانی سیاسی جەماوەری کوردستان. به حکومەتەکەی و به

پەرلەمانەکەی، یان خۆ بە زلزانینە لە ئاستی ئەو هەموو دیاردانەو، یان جۆرە بازرگانییەکی تایبەتییە لە نێوان نوخبەی دەسەلاتی ئەم ولاتەو کۆمپانیا بیانییەکان، یان هۆو هۆکاری دیکەی لە پالدایە.. ؟!
ئەگەر چی سەرانی فەرمی دەستڕۆی هەردوو حزبی دەسەلاتدار تاکو ئێستا ئامادەنین ناوەڕۆکی ئەو چوار گرێبەستە بۆ خەلکی خۆیان و ناوەندە فەرمییەکانیش ئاشکرا بکەن، لێرەدا، بە کورتی ئاماژە بە چەند لایەنێکی ئەو گرێبەستانە دەکەین، هەروەکو لە هەندێ کەنالەکانی راگەیاندنی بیانی بلاوکراوەتەوە، بە ئومێدی ئەوەی دەسەلاتی فەرمی هەرێمی کوردستان ئەو گرێبەستانە بلاوبکاتەوەو جەماوەری ستەمدیدە و هەژاری کوردستانیان لێ ئاگادار بکاتەوە لە تەفاصیلیان:
١- گرێبەستێک لەسەر بنەمای (مشارکه الانتاج) ( Production Sharing) لە ٢٠٠٣/١/١٤ لە نێوان ئیدارەی حکومەتی سلێمانی ئەودەم و کۆمپانیایەکی تورکی بە ناوی (پت ئۆیل پترۆلیوم) (Pet Oil Petroleum Products International Exploration & Production Inc .
ئەم گرێبەستە پێش (رزگار)ی العراق، ئیمزا کراوە، واتا پێش ٢٠٠٣/٤/٩و، لە دیباجەی ئەم گرێبەستەدا هاتووە:

١-١ بۆ ئەم گرێبەستە، پشت بەستراوە بە یاداشتی کۆتایی بە ناوی (المذکره النهائیه = ( Final Statement) کە لە ١٧/ ئەیلولی ١٩٩٨ لە نێوان پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا لە واشنتۆن ئیمزا کرا.
١-٢ ئەم گرێبەستە لەسەر ئەساسی (مشارکه الانتاج)ـە.
١-٣ ماوەی ئەم گرێبەستە بۆ (٤٠) سالە.
١-٤ ئەو کێلگانەی کە دراوە بەم کۆمپانیا (کێلگەکانی چیاسورخ، کێلگەکانی کفری و، کێلگەکانی چەمچەمال)ـە، ئەمەش بە پێی نەخشەیەکی تایبەتی کە هاوپێچی گرێبەستەکەیە وەکو پاشکۆیەک.
١-٥ بەلێندەر کە کۆمپانیایەکی تورکییەو، بە پێی ئەم گرێبەستە، تەمویل کردنی عەمەلیاتی نەوتی لەسەرە، واتە تەکالیفی بە دوا گەڕان و بیرلێدان و دەرهێنانی نەوت و گواستنەوە، ئەو برە پارانە وەردەگرێتەوە پاش

دەستپێکردنی بەرهەمهێنانی نەوت و، ئەمیش بە شێوەیەکی ورد و بە تەفصیل بە پێی چەند هاوکێشەیەکی تایبەت تەسبیت کراوە. پاش دەرهێنانی تەکلیفەی بەرهەمهێنان و گشت خەرجییەکانی دیکە، قازانجەکەی دابەش دەکرێت بە ڕێژەی (٥١ ٪)ی بۆ پارێزگای سلێمانی و (٤٩ ٪) بۆ کۆمپانیا تورکیەکەیە.

١-٦ ئەم گرێبەستە بە زمانی ئینگلیزی (٤٣) لاپەڕەیە، لە لایەن ئیدارەی سلێمانی ئەودەم (فەرەیدون عەبدولقادر) (وەکو جێگری سەرۆک وەزیرانی ئەو ئیدارەیە) و پرۆفیسۆر **H. G. koksal** سەرۆکی ئەنجومەنی ئیدارەی کۆمپانیای (پت ئۆیل) ئیمزا کراوە.

٢- لە ٢٠٠٤/١/٢٠ گرێبەستێکی دیکە لە نێوان ئیدارەی (سلێمانی) و کۆمپانیایەکی دیکەی تورکیا بە ناوی (جنێل بۆ وزە) **Genel Energi A.S**، ئیمزا کراوە. ئەم گرێبەستە:

٢-١ لە دیباجەکەیدا، پشت بەستراوە بەوەی کە گەلی کوردستان لە ڕێگای هەڵبژاردنێکی دیموکراتی پەرلەمانێکی بۆ خۆی هەڵبژاردو ئەم پەرلەمانە حکومەتێکی بۆ هەرێم دامەزراند هەر ئەوانیش یاسایان ڕچواند بۆ بەڕێوەبردنی ئەو هەرێمەو، لەبەر ئەوەی گەلی کوردستان خاوەنی سەروەتی سروشتی هەرێمە، ئەو دەسەڵات بە حکومەتی هەرێم دەدات بۆ وەبەرهێنانی ئەو سەروەت و سامانە سروشتیە، هەروەها دیباجەکەی ئاماژە بە هەمان (یاداشتنامەی کۆتایی لەنێوان پارتی و یەکێتی واشنتۆن دەکات...).

٢-٢ ماوەی ئەم گرێبەستە (٢٥) ساڵەو، قابیلی درێژکردنەوەیشە بۆ (٥) ساڵی دیکە.

٢-٣ ئەو کێڵگانەی کە ئەم گرێبەستە شمولی دەکات لە نەخشەیەکی تایبەتی بە وردی و بە تەفصیل دیاری کراون وەکو پاشکۆیەکی.

٢-٤ ئەم گرێبەستە لەسەر بنەمای (مشارکە الانتاج)ـە.

٢-٥ ئەم گرێبەستە لەلایەن حکومەتی هەرێمی کوردستان (د. بەرهەم ساڵح) وەکو سەرۆک وەزیرانی هەرێمی کوردستان (ئیدارەی سلیمانی و، لە لایەن کۆمپانیای تورکی «محەمەد سێپیل **Mehmet Sepil**»)، ئیمزا کراوە.

٢-٦ ئەم گرێبەستە بریتییە لە (٣١) مادده لەگەڵ دوو پاشکۆ بە (٧٠) لاپەرە.

٣- لە ڕێکەوتی تەمموزی /٢٠٠٤، گرێبەستێک لە نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان (ئیدارەی هەولێر)و کۆمپانیای (DNO) نەرویجی و تورکی ئیمزا کراوە. بە پێی راگەیاندنێکی فەرمی ئەو کۆمپانیایە بڵاوکرایەوە -International Oil Daily لە ١٢/ ئابی / ٢٠٠٥ ئەم گرێبەستە:

٣-١ لەسەر بنەمای (مشارکه الانتاج)ە.

٣-٢ ئیمتیازی ئەم کۆمپانیایە ناوچەیەکی نزیکی (زاخۆ)و دەشتی هەولێرە.

٣-٣ بە پێی راگەیاندنی ئەو کۆمپانیایەو چەند قسەکەرێکی حکومەتی هەرێمی کوردستان، پاش (مەسحێکی سیزامی) لە ناوچەی زاخۆ دەستکراوە بە لێدانی چەند بیرێک و، لەوە دڵنیا بوونە کە نەوتێکی زۆریان دۆزیوەتەوە بە تێچوویەکی(کولفەیەکی) کەم لە ماوەیەکی کورت و، سەرەتا توانای بەرهەمهێنانی رۆژانەی ئەو بیرانە (١٥) هەزار بەرمیلە، هەروەها قەول بوو (مسح)ی سیزامی دەشتی هەولێریش تەواو بێت.

٣-٤ باس لەوە دەکرێت کە ماوەی ئەم گرێبەستە (٤٠) ساڵە.

٤- لە پاش ساڵی ٢٠٠٣ حکومەتی ناوەندی بەغدا دوو یاداشتنامەی لەیەک تێگەیشتنی ئیمزا کردووە، یەکەمیان لە گەڵ کۆمپانیای (وودساید ئەنەرجی)ی ئوسترالی، بۆ نرخاندنی کێڵگەی (تەقتەق)و، دووهەمیان لەگەڵ کۆمپانیای (وسترن ئۆیل ساندز)ی کەنەدی، بۆ نرخاندنی عەمەلیاتی جیولۆجی لە کوردستان.

ئەوەی ڕەچاو دەکرێت لەو زانیاریانەی کە تاکو ئێستا بڵاوکراوەتەوە سەبارەت بەم سێ - چوار گرێبەستانەی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەرێگای (هەردوو ئیدارەی) جارانی:

١- لەمەشدا رەچاوی دیاردەی (پەنجا بە پەنجا) کراوە.

٢- زۆربەیان لەگەڵ کۆمپانیای تورکین. یان راستەخۆ، یان بە هاوبەوش. ئەمەش یەکەم جارە کە تورکیا بەفەرمی داخل بە کەرتی نەوتی ئەم وڵاتە دەبێت، بڕوانە

«٢٦» بڕوانە دەقی چاوپێکەوتنی رۆژنامەی هاوڵاتی لە پاشکۆی ژمارە«١٠».

خەت و ناوچەی ئیمتیازی گرێبەستی یەکەم (چەمچەماڵ،کفری، خانەقین..!) یان ئەوەی سێهەم (زاخۆ و خەتی دەشتی هەولێر بە پردێ..!!).

٣- ئەم گرێبەستانە لەسەر بنەمای (مشارکە الانتاج)ـە ئەمەش هەر وەکو لە دیمانەیەکماندا لە ڕۆژنامەی هاوولاتی ژمارە(٣٢٢) ئاماژەمان بۆ کرد«٢٦»، جۆرە گرێبەستێکی بواری پیشەسازی نەوتە کە لە مێژەوە وەلاوەنراوە،ئەگەر پیادەیش کرابێت ئەوە بۆ ئەو ناوچانەیە کە ئەگەری دۆزینەوەی نەوت و گازی بە دەگمەن لێدەکرێت، واتا سەرمایەیەکی زۆرو تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو و تەحەمولی (مجازفە)یەکی گەورەو، کولفەی گران بە دوای نەوت و بیر لێدان و دەرهێنانێکی زۆر، کە هەر هەموو ئەمانە لە ولاتی ئێمە بوونی بۆ نییە، هەتاکو بەپێی هەموو ئەو مەرجانە ئەگەر ولاتێکی ناچاربێت بۆ بەستنی ئەم جۆرە گرێبەستانە ئەوە پاش چاکسازییەکی باش بووە لەسەر بنەماکانی.

٤- تاکو ئێستا ناوەڕۆکی ئەم گرێبەستانە بۆ خەڵکی کوردستان و دەسەڵاتە فەرمییەکانی و ناوەندەکان هەر وەکو وتمان، تەلەسمێکە..!

٥- باس لەو دەکرێت کە ڕێژەی قازانجی کۆمپانیا بیانییەکان لە نێوان (٥٠-٤٠٪ )ـە. ئەمە ئەگەر وابێت جۆرە تالان کردنێکی سەروەت و سامانی نەوتی کوردستانە. هەر بۆ نموونە ئەگەر هاتوو یەک بەرمیلی نەوت بە (٦٣) دۆلار حیساب بکەین و، تێچووی یەک بەرمیلی نەوت لە نێوان (١-٣) دۆلار بێت. ڕێژەی سوودی کۆمپانیاکانیش (٤٩٪) (بێت بەپێی گرێبەستی یەکەم): ئەوە بە گشتی کۆمپانیاکە پاش کەم کردنەوەی (کولفەی بەرهەمهێنان= (٣دۆلار)، لە بەرمیلێکی نەوت (٢٩,٤) دۆلار قازانجیەتی. واتە ڕێژەی قازانجی هەر دۆلارێک لە(٣٠٠٠٪) زیاترە کەچی ڕێژەی (١٢٪) وەکو سوود، بە پێی قیاساتی کەرتی پیشەسازی نەوت بە پلەی (نایاب) دەژمێردرێت ..!

٦- باسی ئەوە هەیە کە نرخی یەک بەرمیلی نەوت لە هەندێ لەو گرێبەستانە لە کەمتر لە (٢٠) دۆلار حیساب کراوە بۆ ئەو کۆمپانیانە، لە کاتێکدا نرخی یەک بەرمیلی نەوتی ئەو سەردەمە لە پەنجا دۆلار زیاتر بوو، ئەمڕۆ لە سنووری (٧٠) دۆلارە. ئەمەش ئەگەر وابێت جێگای سەرسووڕمان و پرسیارە. بە تایبەتی هەموو ئەو کۆمپانیانە کۆمپانیایەکی (نەناسراون لە بازاڕی نەوت)، یان هەر هیچ نەبێت زۆربەیان. ئەگەر گرێبەستەکان وەکو خۆی جێبەجێ بکرێت

و پاش چەند ساڵی دیکە دەست بکەن بە بەرهەمهێنانی نەوت، دوور نییە نرخی یەک بەرمیلی نەوت لە (٨٠) دۆلار تێپەڕ بکات. هەروەها نەزانراوە نرخی یەک بەرمیلی نەوت لە(سەر) بیرەکان حیساب کراوە یان لە دوا قوناغی بازاڕی نەوت.

٧- ماوەی ئەو گرێبەستانە وەکو باسی لێوە دەکرێت لە نێوان (٤٠-٣٥) ساڵە. ئەمەش بۆ واقیعی ئەمڕۆی بازاڕو ئایندەی نەوت و، واقیعی کوردستان و عێراق، ماوەیەکی یەکجار درێژەو پەسند نییە.

٨- بازدانی بازنەی دەسەڵاتی دەستڕۆی هەرێمی کوردستان بە سەر حکومەتی هەرێم و پەرلەمانی کوردستان و ناوەندەکانی دیکەو، بە سەر خودی بنکەو بازنەی فراوانتری سەرکردایەتی حزبەکانی خۆیانیشەوەو، ئاشکرا نەکردنی ناوەڕۆکی ئەو گرێبەستانە، جێگای پرسیارو گومانەو، دژی پرنسیپی (شفافیە)ت وریزگرتن لە راو خواستی خەڵکی کوردستان و دەزگا فەرمییەکانێتی. بە پێی یاسای ژمارە یەکی کوردستان، کە تاکو ئێستا بە (دەستوور)ی هەرێمی کوردستان دەژمێردرێت، تەنها پەرلەمانی کوردستانە مافی بڕیاری چارەنووسسازی هەیە. تۆ بڵێیت لە نەوت و کێشەی نەوتی ئەم وڵاتە، دیاردەیەکی دیکە هەبێت بە ئەندازەی نەوت چارەنووسسازتر بێت...؟! هەروەها، بودجەی حکومەتی هەرێمی کوردستان، ئەگەر (١٠٠٪)ئیعتیمادی لەسەر داهاتی نەوت نەبێت ئەوە لە (٩٥٪) کەمتر نییە...!

٩- بەو زانیاریانەی ئەگەر چی زۆر کەمە، دوور نییە ناوەندی بەغدا، وا بە ئاسانی، ملکەچ نەبێت بۆ پەسند کردنی ئەو گرێبەستانە. لایەکی سیاسی و شۆفینزمەکەیەتی، هەروەها ناوەڕۆک و جۆری گرێبەستەکانەو، لایەکی دیکەی لایەنی یاساییە. بۆ لایەنی سێهەمیان کە (یاسایەکەیەتی):

٩-١- ئەم گرێبەستانە لە پەرلەمانی کوردستان، بڕیار یان یاسایەکی پێ دەرنەچووە، تاکو ئەمڕۆ لایەنی کوردستانی پشتی پێ ببەستێت و بۆ ئیعتیماد کردن لەسەر ماددەی (١٤١)ی دەستووری هەمیشەیی کۆماری العراق (يستمر العمل بالقوانين التي تم تشريعها في أقليم كوردستان منذ عام ١٩٩٢، وتعد القرارات المتخذة من حكومة أقليم كوردستان بما فيها قرارات المحاكم والعقود ـ نافذة المفعول، ما لم يتم تعديلها أو

الغاوها حسب قوانين أقليم كوردستان، من قبل الجهة المختصة فيها. وما لم يكن مخالفة لهذا الدستور.). وەكو ياسايەک. لەوەش گرنگتر،

٩-٢- له دەستوور (العقود= گرێبەست) پێناسه نەکراوە. ئايا مەبەست (عقودی دادگاكانه، يان عقودی زەواجه..هتد). دوور نييه لايەنی ناوەندی بەغدا ئەم (العقود)ـه بە گرێبەست لەگەڵ كۆمپانيای بيانی له قەڵەم نەدات. يان پەنا ئەبات بۆ زاراوەی (نافذه المفعول) يان دوا رستەی ئەم ماددەيه (وما لم يكن مخالفه لهذا الدستور). ساڵی ٢٠٠٤ به تەفصيل له بابەتێكماندا له (خەبات) باسی (فرت و فيێڵی)ی ئەم ماددەيەمان كرد له ياسای ئيدارەی دەوڵەت بۆ قۆناغی گواستنەوەو، پێشنيارمان كرد له دارشتنی دەستووری هەميشەييدا رەچاو بكرێت، كەچی موعالەجە نەكرا. هيوادارم لايەنی ناوەندی بەغدا له تەفصيل و لەپيادەكردنی ئەم ماددەيەدا گرفت بۆ لايەنی كوردستانی دروست نەكەن .

٩-٣-بە پێی پرۆژەی ياسای نەوت و گازی كۆماری العراق، ناكۆكييەكی زۆر هەيه لەگەڵ خودی ناوەرۆک و جۆری دەسەڵات له نێوان پرۆژەكەو ئەم گرێبەستانەدا... ناكۆكييەكانی له توێی هەڵوێست و قسەكانی كاربەدەستانی ئەمريكی و، راپۆرتی بێكەر -هاميلتۆن و، (رايس) و (خەليلزاد)و راپۆرتی (گرووپی قەيرانەكان)و، وەزيری نەوتی العراق و زۆر له نوێنەرانی ئەنجومەنی نوێنەران و لايەنە سياسييەكانی عێراقی غەيره كوردو وڵاتانی ئيقليمی بەتايبەتی توركيا وەدەردەكەوێت...هتد

٩-٤- له مێژەوه مشتومرو ناكۆكی نێوان ناوەندی بەغداو دەسەڵاتی فەرمی هەرێمی كوردستان بەدی دەكرێت. رێككەوتننامه نهێنييەكەی نێوان حكومەتی هەرێمی كوردستان و حكومەتی ناوەندی بەغدا له ٢٠٠٧/٢/٢٦، هەرچەنده به فەرمی رانەگەيەنراوە، بەڵام لايەنێكی گرنگی ناكۆكييەكان روون دەكاتەوە. ئەوەی تاكو ئێستا مەعلومه لەو (ناكۆكييانه) ئەو چەند خاڵه سەرەكييانەيە كە له پێشەكی پرۆژەی ياسای نەوت و گازی ناوەندی بەغدا تەسبيت كراوەو، دووريش نييه هەر ئەو چەند خاڵەيش بێت. ئەو رێككەوتننامەيه پاش سەردانەكەی وەزيری دەرەوەی ئەمريكا (رايس) بۆ العراق له ٢٠٠٧/٢/١٧ ئەنجام دراوە. هەر چەنده به

فەرمی وا بڵاوبووەوە : کە سەردانەکەی ناوبراو بۆ العراق، تایبەت بووە بە باری (نەخشەی ئاسایش)ی ئەم وڵاتە (الخطه الأمنیه)، بەڵام لە نووسینێکی (نیویۆرک تایمز)دا لە ٢/١٧ لە ژێر ناونیشانی (لە سەردانە چاوەڕوان نەکراوەکەی بۆ بەغدا، رایس فشار دەخاتە سەر سەرکردە عێراقییەکان بۆ وەدەستهێنانی دەستکەوتەکان) جەختی کردووە لە سەریان: (ان علیهم انهاء العمل علی قانون النفط) هەروەها دەڵێت: (سەرکردەکانی عێراقی دەڵێن یاساکە تەقریبەن تەواو بووە.)و، بۆ ئەوەی (رایس) بێ تەحەمولی و پەلە کردنی ئەمریکا دووپات بکاتەوە بەردەوام دەبێت لە قسەکانی بۆ رۆژنامەوانان و دەڵێت: (لقد قلت لزملائي بانني سمعت مثل هذا الكلام سابقا، وفي هذه المرة يجب ان يعني ان القانون قد أكمل فعلاً... كما في المعنى الحرفي لكلمة أكمل..). جێی خۆیەتی ئاماژەش بۆ رستەیەک لە قسەکانی (رایس) بکەین، سەبارەت بە هەمان بابەت کاتێک، لە ٢٠٠٧/١/١١، لە بەرامبەر ئەندامانی کۆنگریسی ئەمریکی وتی: (بالرغم من توقع أن يؤكد الكورد بأنهم سيسيطرون بسهولة على الموارد النفطية بنفسهم، ولكن هذا ليس ما سيقوم به القانون..)

٩-٥- فشاری ئەمریکا لەسەر لایەنی کوردی بۆ بە هێز کردنی دەسەڵاتی ناوەندی بەغدا لەسەر حیسابی دەسەڵاتی کوردستانی تەنها لەراپۆرتی بێکەر - هامیلتۆن و راگەیاندنەکانی (کوندالیزا رایس) لەو بارەیەوە بەدی ناکرێت، بەڵکو لە دوا سەردانەکانی باڵیۆزی ئەمریکا (زەڵمای خەلیلزادە) بۆ کوردستان و کۆبوونەوەی لەگەڵ تاڵەبانی و بارزانی -یش.

٩-٦- کۆبوونەوەکە هەر وەکو هەندێک لە چاودێران مەزەندەیان کردووە زیاتر بۆ حەسم کردنی هەڵوێستی کورد بوو لەمەڕ پرۆژەی یاسای نەوت و گازی ناوەندی بەغدا و پێکهاتنی حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی ناوەند لە ٢٠٠٧/٢/٢٦ لەسەر ئەو چەند خاڵەی کە بووەتە وەرەقەیەکی پرۆژەکەو پاش ئەو سەردانە سەرۆکی هەرێمی کوردستان و ئەنجومەنی وەزیرانی کۆماری العراق هەریەک لەلای خۆیەوە ئاماژەیان بۆ ئەوە کرد کەچی گرفت لە رێگای یاسای نەوت و گاز نەماوەو ئەنجومەنی وەزیران پرۆژەکەی پەسند کردووەو دەنێردرێت بۆ ئەنجومەنی نوێنەران، بۆش و رایس

و زەڵمـای گـەرمـاو گـەرم پیـرۆزبایی و خـۆشـحـاڵی خـۆیان پیـشـانداو بەسەرکەوتنێکی مەزنیان دانا.

٩-٧- ئەو رێککەوتننامەیە کە یاداشتێکی ئیمزا نەکراوە، وەکو وەرەقەیەک لەپێش پێشەکییەکەی پرۆژەی یاسای نەوت و گازی کۆماری العراق مێژووی ٢٠٠٧/٢/٢٦ پێوەیەو، لە سنووری دوو لاپەڕەیەو پێکهاتووە لە دیباجەیەک و (٥) خاڵ. ئەگەر چی دیباجەکەی جەخت لەسەر ماددەی (١١١و ١١٢)ی دەستووری هەمیشەیی دەکات بێ ماددەو بڕگەکانی دیکەی پەیوەندار، هەر (٥) خاڵەکەی تەعبیرە لە ناوەڕۆکی ناکۆکییەکان لە نێوان هەردوولا. لە خاڵی (١)دا جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە دەبێت پرۆژەی یاساکە لەگەڵ هەر (٤) پاشکۆکەی، پاش ئەوەی پێکدێن لەسەر بنەماو مەرجە گشتییەکانی نموونەکانی گرێبەستە نەموزەجییەکان و، لەگەڵ پرۆژەی یاسای ئیدارەی داهاتی ئابووری، پێکەوە بدرێت بە ئەنجومەنی نوێنەران. دەبێت لایەنەکان کار بۆ ئەوە بکەن کە پێش ٣١ /٢٠٠٧/٥ ئەنجام بدرێت. وا ئێستا کۆتایی مانگی (٢٠٠٧/٥)ە، کەچی هێشتا باس لە تەواوبوونی ناکرێت. لە خاڵی (٢)ی ئەو رێککەوتننامەیە، ناوەندو هەرێم جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە دەبێت پرۆژەی یاسای کۆمپانیای نیشتمانی نەوتی العراق و یاسای وەزارەتی نەوتی ناوەند جووت بێت لەگەڵ ماددەکانی یاسای نەوت و گازی ناوەندو، هەروەهایش دەبێت پرۆژەی یاسای نەوت و گازی هەرێمی کوردستان هاوتەریب و رێک بێت لەگەڵ ئەحکامی یاسای نەوت و گازی ناوەندو دەستووری هەمیشەیی العراق. لە خاڵی (٣)یدا جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە: گشت جۆرە (عەمەلیاتێکی نەوتی) لەو ناوچانەی کە مەشموله بە ماددەی(١٤٠) هەڵدەواسرێت، چونکە ئەگەری گۆڕانکاری ئیداری لە سنوورەکانیاندا دەکرێت، بەڵام هەر هەمان خاڵ مەودای کارکردنی کۆمپانیای نیشتمانی نەوتی کۆماری العراقی داوە، کە بەردەوام بێت لە(عەمەلیاتی نەوتی خۆی لەو ناوچانەو سەبارەت بە کێڵگە بەرهەمهێنەرەکانی ئێستا)و، لە خاڵی (٤)یدا هەموو لایەک دەبێت پابەند بن بە راگرتنی مۆر کردنی هەرجۆرە گرێبەستێک، یان چوونە ژێر باری هەر جۆرە ئیلتزاماتێک سەبارەت بە چالاکی بە دواداگەڕان و بەرهەمهێنانی نەوت لە گشت خاکی العراق، تاکو

دەست بەکاربوونی یاسای نەوت و گازی ناوەندو، لە خاڵی (٥)یدا باسی ئەوە دەکات کە: حکومەتی ناوەند بە تنسیق لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان هەڵدەستن بە تەواو کردنی موستەلزەماتی جێبەجێ کرنی یاسای نەوت و گازو تەفعیل کردنی ئەو دامودەزگانەی کە یاساکە ناوزەدی کردوون، لە پێش تەواو بوونی مانگی (٢٠٠٧/٥) و، ئەگەر لەو ماوەیەدا تەواو نەبوو، سەرۆک وەزیرانی العراق و سەرۆک وەزیرانی هەرێمی کوردستان کۆدەبنەوە بۆ باس کردنی تەواو کردنیان لە ماوەی یەک مانگ و، دۆزینەوەی رێگا چارەیەک لەسەر بناغەی ئەم دوو هەڵبژاردە:

یەکەمیان : ئەگەر هاتوو خاڵی (٥) جێبەجێ نەکرا تاکو ٢٠٠٧/٥/٣١، هەردوولا بۆیان هەیە ئیمزای گرێبەستی (گەشەپێدان و بەرهەم) بکەن، هەر وەکو لە دەستوورو لە پرۆژەی یاسای نەوت و گازی ناوەندو بنەماکانی گرێبەستە (نەموزەجییەکان)دا هاتووە، ئەمە هەڵبژاردەی یەکەمە (الخیار الاول)، (ئەمەش ناگونجێت لە گەڵ ناوەڕۆکی پرۆژەی یاسای نەوت و گازی کۆماری العراق).

دووهەمیان: ئەو ماوەیە کە لەم خاڵەدا هاتووە (٥)، درێژەی پێ بدرێت. ئەم درێژە پێدانەش تەحدید نەکراوە لەم رێککەوتننامەیەدا، واتە کراوەیەو گفتوگۆی لەسەر ئەکرێت.

## دەیەم

لە خاڵی (٢)ی ئەو رێککەوتننامەیەدا، ئاماژە بە پرۆژەی یاسای نەوت و گازی هەرێمی کوردستان کراوە. ئەم پرۆژەیە بە فەرمی رانەگەیەندراوە، وەلێ لە میدیاکانی جیهانی باس کراوەو، چەند بەرپرسێکی حکومەتی هەرێمی کوردستان ناویان هێناوەو، دەقی پرۆژەکە بە ئینگلیزییەو، هەر بە ئینگلیزیش لە هەندێ سایتی بیانی بلاوکراوەتەوە، زۆر ناوەندو دەزگاو، حکومەت و میدیای بیانی و لایەن، بە ئاگان و شرۆڤەو باسی کردووە، کەچی نە تەرجومە کراوە بۆ کوردی، نە بۆ عەرەبی و، نە دراوە بە ناوەندەکانی دەسەڵاتی فەرمی و نە بە میدیاکان و کەناڵەکانی راگەیاندنی کوردستانیش و، نەخەڵکی کوردستان لێی بە ئاگایە. ئەمەش وەکو خودی یاسای نەوت و گازی ناوەندی بەغداو گرێبەستەکانی هەرێمی کوردستان لەگەڵ کۆمپانیاکانی تورکیاو بیانییەکان و، هەتاکو ئەو

ڕێککەوتننامەیەی مێژووی ٢٠٠٧/٢/٢٦ لە نێوان حکومەتی ناوەندو حکومەتی هەرێم، لە خانەی زۆر نهێنیدایە....!
بە هەر حاڵ دیارە حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ٢٠٠٦/٩/٩ (پرۆژەی یاسای نەوت و گازی هەرێمی کوردستانی داوە بە چەند دەزگاو ناوەندێکی ڕاگەیاندنی بیانی. پرۆژەکە هەر وەک ئاماژەمان بۆ کرد، بە زمانی ئینگلیزی ئامادە کراوە. وەکو لە میدیاکانی بیانی باسی دەکەن گوایە پرۆژەکە لەلایەن دەزگای (بی. اف. سی. ئەنرجیسی ئەدفایزەر)ی ئەمریکی ئامادە کراوە، **(B.F.C.Energys Adviser)** کە دەزگایەکی پیشەیی یاسایی ناسراوی ئەمریکایە بۆ کاروباری ڕاوێژکاری. هەندێ لە پسپۆڕانی بواری کەرتی پیشەسازی نەوت لەو باوەڕەدان کە پرۆژەی یاسای نەوت و گازی هەرێمی کوردستان لە رووی یاسایی و میهەنییەوەو، لە رووی ڕێکوپێکی و دروستی زاراوە یاسایی و ئابووری و هونەرییەکانی نەوتی و چۆنیەتی داڕشتنی ماددەو بڕگەکانی زۆر باشترە لەوەی حکومەتی ناوەندو، باشتر وابوو ئەم پرۆژەیە لەلایەن وەزارەتی سەرچاوە سرووشتییەکانی حکومەتی کوردستان بە فەرمی تەرجومە بکرایەتە سەر زمانی کوردی و لە ڕاگەیاندنەکانی کوردستان بڵاوبکرایەتەوە، هەر چۆن ئینگلیزییەکەی لە میدیاکانی بیانی بڵاوکراوەتەوە. لە کوردستانیش ئەوەندە روشنبیرو ئابووریناس و پسپۆڕی بواری یاساو نەوت و ئابووریمان هەیە، هەر چ نەبێت بە ئەندازەی هەندێ لە بەرپرسانی ئەمڕۆی بواری نەوت و کانزا سرووشتییەکانی کوردستان، موهتەم بن بە سەروەت سامانی وڵاتەکەیان و، کاریان بۆ کردبێت و شەرم نەکەن لە زمانی کوردی شیرینی خۆیان و، لەوان زیاتر حیساب بۆ رای گشتی کوردستان بکەن، بە تایبەتی سەبارەت بە کاڵایەکی ئیستراتیجی وەکو نەوت. سەیر لەوەدایە ئەو پرۆژەو گرێبەستانە بدرێن بە ڕاگەیاندنەکانی بیانی بە هەموو جۆرێ، یان باسی گشت وردەکارییەکانی پرۆژەیەکی وەها بکەن، کە ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە چارەنووسی خەڵکی کوردستانەوە هەبێت، کەچی، ئەم جۆرە کاربەدەستانە هەمان ماف بۆ خەڵکی کوردستان بە ڕەوای نابینن، کە دەزگا پەیوەندارەکانی خۆیان، ڕاگەیاندنی خۆیان، خەڵکی خۆیان ئاگادار نەکەنەوە لە ناوەڕۆکی ئەو گرێبەست و بگرەوبەردەو ناکۆکییەکانی بواری ئەو کاڵا چارەنووسسازە ...!
باس کردنی ناوەڕۆکی پرۆژەی یاسای نەوت و گازی هەرێمی کوردستان زۆر هەڵدەگرێت و لە دەرفەتێکی نزیکدا باسی دەکەین...

به هەر حاڵ، لە کاتێکدا دەستوور مافەکانیان بۆ مسۆگەر دەکات، نە هیچ یەک لە پێکهاتەکانی تری کەرکوک کە بەشی سەرەکین لە حکومەتی بەغدا و نە دەوڵەتانی دراوسێی عێراق پشتیوانی لەو رێوشوێنانە دەکەن. ئەوەتا تورکیا بە تایبەتی رایگەیاندووە کە ناتوانێ بیرۆکەی توانەوەی کەرکوک لە ناو هەرێمێکی کوردیدا قبوڵ بکات و چەندین رێگای دیپلۆماسیەتی ناچار کردنی بە دەستەوەیە لەم چوارچێوەیەدا بە دەستتێوەردانی سەربازییشەوە لە پێناو رێگا گرتن لە داواکارییەکانی کورد.

لەبەر ئەوە، لە ماوەی ساڵێکدا کورد رووبەرووی ئەگەرێکی سەرەکی دەبێتەوە، واتا بە کارهێنانی پاڵەپەستۆی دەستووری دژ بە نارەزایی لایەنەکانی ترو دروست بوونی مەترسی ململانێی توندو تیژ، یان پاشەکشە کردن و گەڕان بە دوای چارەسەردا لە رێگای دانوستانەوە.

لەوانەیە رادەی سۆزەکە زۆر لەوە بەرزتر بێت کە پەنا وەبەر ئەگەری دووەم ببرێت، بەڵام بە رەچاوکردنی دوو ساڵ لە گفتوگۆ لەگەڵ نوێنەری هەموو پێکهاتەکانی شاری کەرکوک و هەروەها حکومەتەکانی عێراق و تورکیا و ئەمریکا و حکومەتی فیدراڵی کوردستان، گروپی تەنگژەکان بڕوای وایە کە دەکرێ رێوشوێنێکی تەوافقی بە دی بێت کە بەرژەوەندی ژیاریی هەموو لایەک لەبەرچاو بگرێت.

ئەڵبەتە شکست هێنانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی لە کاردانەوەی خێراو یەکلاکەرەوە لەوانەیە ببێتە هۆی ئاڵۆزبوونی زیاتر. هاوکات لەگەڵ نزیک بوونەوەی دوا مۆڵەت لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٧. لەوانەیە دەرەنجامەکەش بریتی بێت لە ململانێی توندی تایفەگەری و شەڕی ناوخۆ و، لەوانەشە دەستتێوەردانی سەربازی دەرەکی، گومانیش هەیە لەوەی عێراقێک کە ئەوەندە بە هۆی ناکۆکی ئەتنی و توندوتیژی تیرۆریستییەوە نا سەقامگیرە، بتوانێ خۆی لە بەردەم گورزێکی سەرەکی تر دا رابگرێت لە ناوچەیەکدا کە گەورەترین جۆراوجۆری ئەتنی لەسەر ئاستی وڵاتدا بەخۆوە دەبینێت.

## ئامۆژگارییەکان

**بۆ حکومەتی عێراق:**

١- داوەت کردنی ئەنجومەنی ئاسایشی سەر بە UN بۆ دەستنیشان کردنی نوێنەرێکی تایبەت بە مەبەستی:

أ- ئاسان کردنی چارەسەرێکی بونیاتنراو لەسەر گفتوگۆ کردن سەبارەت بە دۆخی کەرکوک و ئەو ناوچانەی تریش کە کورد داوایان دەکات.

ب- دابین کردنی یارمەتی پێویست بۆ ئاوەدان کردنەوەی کەرکوک و دڵنیا بوون لەوەی کە ئەو یارمەتییە لەسەر بنەمای پێویستی بەکار بهێنرێت، نەک لەسەر بنەمای ئەتنی.
ج- چاودێری کردنی پابەندبوونی هەموو لایەک بەو رێککەوتنەی کە بە ئەنجام دەگات.
د- ناردنی راپۆرتی بەردەوام بۆ ئەنجومەنی ئاسایش.

٢- چالاک کردنی پرۆسەی هەڵگەڕاندنەوەی نارەواییەکانی پێشوو لە رێگای:
أ- گەڕاندنەوەی بە بەرنامە بۆ ئەوانەی کە بە زۆر دەرکراون لەلایەن رژێمی پێشووەوە.
ب- ئاسانکاری و قەرەبوو کردنەوەی ئەوانەی لەلایەن رژێمی پێشووەوە هێنراون (بە نەوەکانیانەوە) کە ئامادەن بە رەزامەندی خۆیان بگەڕێنەوە.
ج- بڕیاردان سەبارەت بە کێشەی موڵکداری لە رێگای ئەو میکانیزمانەی کە دانراون.
د- ئەنجامدانی پرۆسەیەک کە تێیدا ئەو ناوچانەی پێشتر سەر بە پارێزگای کەرکوک بوون یان دەگەڕێنەوە بۆ سەر پارێزگای کەرکوک و یان هەر لەسەر شوێنەکانی خۆیان دەمێننەوە.

**بۆ حکومەتی عێراق، ئەنجومەنی نوێنەران، نوێنەرانی نەتەوەکانی کەرکوک و حکومەتی هەرێمی کوردستان**

٣- نیشاندانی ئارەزوو بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کەرکوک و ناوچە ململانێ لەسەرەکانی تر لە رێگای گفتوگۆی ئاشتییانەو پابەند بوون بە لۆجیک لەم بارەیەوە.
٤- گفتوگۆ کردن لەگەڵ نوێنەری تایبەتی (UN) دەبارەی چارەسەرێکی کاتی بۆ ماوەیەکی دیاری کراو (لەوانەیە ١٠ ساڵ بێت) کە ئەم خاڵانە بگرێتەوە:
أ- پەرەپێدانی گتفوگۆکان دەربارەی کەرکوک بۆ ئەوەی لایەنەکانی تریش بگرێتەوە بە تایبەتیش نوێنەرانی کۆمەڵگای مەدەنی، وەکو سەندیکاکان و رێکخراوە خێرنەویستەکان و رێکخراوەکانی ئافرەتان.
ب- لە کاتی پێداچوونەوەیەکی دەستووریدا، ئەنجومەنی نوێنەران بیرۆکەی ئەنجامدانی ریفراندۆم لەسەر کەرکوک وەلاوە دەنێت و لە جێگای ئەوە یاسایەک دادەڕێژێت بۆ مامەڵە کردنی تایبەت لەگەڵ ئەو پارێزگایەدا.

ج- ئەو یاسایە حاڵەتی هەرێمی فیدراڵ بە پارێزگای کەرکوک دەبەخشێت بۆ ماوەیەکی دیاری کراو.
د- هەر چوار پێکهاتەکەی کەرکوک لەسەر رێوشوێنی تایبەت بە بەشداری کردنی یەکسانانەی دەسەڵات رێکدەکەون.

**بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان**

٥- ئامادە کردنی رای گشتی بۆ گفتوگۆی پێویست دەربارەی کەرکوک و ئومێدەکانی تری گەلی کورد وەکو رازیبوون بەوەی پارێزگای کەرکوک وەکو هەرێمێکی فیدراڵی بۆ ماوەیەکی دیاری کراو بمێنێتەوە.
٦- واز هێنان لەو بەرێوەبەرایەتیانەی پارێزگای کەرکوک کە پارتە کوردییەکان لە نیسانی ٢٠٠٤ کۆنترۆڵیان کردووە و هاوکاری کردن لەگەڵ نوێنەری تایبەتی UN بۆ دووبارە دابەش کردنی پۆستە گەورەکان لە پارێزگاکە لەسەر بنەمای یەکسانی.

**بۆ حکومەتی تورکیا**

٧- پابەند بوون بە چارەسەر کردنی ئاشتییانەی کێشەی کەرکوک و دوور کەوتنەوە لە قسەو وتار لەم بارەیەوە.
٨- ئاسانکاری کردن بۆ بازرگانی بە تایبەتیش بازرگانی بەرهەمە نەوتییەکان، لە نێوان تورکیا و باکووری عێراق بۆ نموونە، ئەویش لە رێگای کردنەوەی هێڵێکی تری سنوورییەوە بێجگە لەوەی خاپوور و، هەروەها برەودان بە وەبەرهێنان لەگەڵ هەرێمی کوردستانی عێراق.
٩- پابەند بوون بە نەهەناردنی هێزی سەربازی بۆ ناو عێراق و یان جێبەجێ کردنی رێوشوێنی دیپلۆماسییەتی توندوتیژی وەکو داخستنی هێڵی پەرینەوەی خاپوور و، یان هێڵی نەوتی بێجی بۆ جیهان.

**بۆ حکومەتی ئەمریکا**

١٠- پاڵپشتی تەواوی ماددی و دیپلۆماسی لە چارەسەری ئاشتییانەی دۆخی کەرکوک و ناوچەکانی تر بکەن کە ململانێیان لەسەرە. ئەمەش بکەنە پێشینەیەکی دیپلۆماسی لە عێراق و، هەروەها هەموو لایەنە سیاسیە عێراقییەکان بهێننە سەر ئەو بڕوایەی کە گفتوگۆ کردن بۆ دۆزینەوەی چارەسەر بۆ کێشەی کەرکوک پێویستە.

سەرکردە سیاسییەکانی عێراق هان بدەن کە بڕیاری شەفافتر و یەکلاکەرەوەتر بدەن دەبارەی ئایندەی کەرکوک لە ڕێگای بەشداری پێکردنی گروپ و لایەنی زۆرتر لە گفتوگۆکاندا.

**بۆ ئەنجومەنی ئاسایشی سەر بە UN**

١١- کار لەسەر داواکاری عێراق بکەن سەبارەت بە دەستنیشان کردنی نوێنەرێکی تایبەتی بۆ شاری کەرکوک کە پاڵپشتی ئەنجومەنی ئاسایشی لە پشتەوە بێت و دەسەڵاتەکانی ئەو نوێنەرە بە پێی پێشنیارەکانی ناو ئەم راپۆرتە دیاری بکەن.

**عەمان/ برۆکسل ٢٠٠٦/٧/١٨**

## عێراق و کورد: شەڕی دروستکراو لەسەر کەرکوک

١- پێشەکی

بە پێچەوانەی ترس و پێشبینی زۆرێک لە چاودێران، کەرکوک بە گشتی لە ململانێ و توندوتیژی ئەتنییەوە بە دوور ماوەتەوە لەوەتەی لە نیسانی (٢٠٠٣)وە ڕژێمی سەدام حوسێن رووخاوە. بەڵام هەر لە بنەڕەتەوە شارێکی سەقامگیر نەبووە. گەلی کورد کە دوای چەندین دەیە لە ململانێ، بە سەرکەوتوو دەردەکەون، هەوڵ بۆ ئەنجامدانی گۆڕانکاری دەدن لە کەرکوک و چەند ناوچەیەکی تر کە دانیشتووانەکانیان پێکهاتەی تێکەڵن و زۆربەیان بە نەوت دەوڵەمەندن. بە سوود وەرگرتن لە هێزی سیاسی تازەیان لە بەغدا، سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان رۆڵیان لە داڕشتنی چوارچێوەیەکی دەستووریدا بینی کە نەک تەنها چەند دەیەیەک لە پرۆسەی تەعریب کردن سەراوژێر دەکات، بەڵکو ڕێگا بۆ ئەوە خۆش دەکات کە ئەو ناوچانە بکەونە سەر هەرێمی کوردستان. ئەوان بڕوایان وایە کە ئەم شێوازەو هاوکات لەگەڵ هەوڵەکانیان لەسەر بنەمای رەت کردنەوەی سیاسەتەکانی ڕژێمی پێشوو (لەڕێگای گەڕاندنەوەی کوردە دەرکراوەکان، کۆنترۆڵ کردنی دۆخی سیاسی و ئیداری و ئەمنی و لابردنی عەرەبە تازە هاتووەکان) یارمەتییان دەدات لە سەرکەوتن لەو ریفراندۆمە نێوخۆیانەی کە چارەنووسی کەرکوک و ناوچەکانی تر دیاری دەکەن کە دانیشتووانەکانیان پێکهاتەی تێکەڵن بەر لە تەواو بوونی ساڵی ٢٠٠٧.

تەنگژەی دروستبوو لەسەر کەرکوک و ناوچە ململانێ لەسەرەکانی تر لەوانەیە لە چەند مانگی داهاتوودا لە ڕێگای یەکێک لەم دوو شێوازە بگاتە لوتکە:
یەکەم: ئەگەر کورد هەوڵەکانی چڕ بکاتەوە بۆ کۆنترۆڵ کردنی ئەو ناوچانە لە ڕێگای یاسایی و یان بە بەکارهێنانی هێز، ئەوا بە دڵنیاییەوە ڕووبەڕووی بەربەرەکانێی گروپەکانی تر دەبنەوە، بێجگە لە ڕووبەڕووبوونەوەی حکومەتی ناوەند و لەوانەشە ئەکتەرە هەرێمییەکان. دەرەنجامەکەش شەڕی نێوخۆیی دەبێت و لەوانەشە دەست تێوەردانی سەربازی دەرەکیشی بە دواوە بێت.
دووەم: لەوانەیە کێشەی کەرکوک وەکو تەگەرەیەکی سەرەکی بکەوێتە سەر ڕێگای پرۆسەیەکی سیاسی و نیشتمانی بەربڵاوترەوە، ئەوەتا دەستووری تازە سیستمی فیدراڵی پەسەند کردووە کە تێیدا هەموو پارێزگایەک دەتوانێ ببێتە هەرێمێکی فیدراڵ، یان لەگەڵ پارێزگای تردا یەک بگرێت بۆ دروست کردنی هەرێم. بەڵام ئەم ڕێوشوێنە لەلایەن زۆرێک لە سەرکردەکانەوە ڕەت کراوەتەوە بە سەرکردە شیعییەکانیشەوە و پێویستە لە کاتی پێداچوونەوە بە دەستووردا چارەسەر بکرێت. بەڵام گۆڕینی دەستوور پێویستی بە ڕەزامەندی کورد هەیە کە پێشبینی دەکرێت ئەو ڕەزامەندییە نیشان نەدەن هەتاکو دەربارەی کێشەی کەرکوک و ناوچەکانی تر کە داوایان دەکەن دڵنیا نەکرێنەوە. لەبەر ئەوەش کە وەدەست هێنانی کەرکوک لەلایەن کوردەوە بەلای زۆربەی عەرەبی عێراقەوە هێڵی سوورە، لەوانەیە ئەم کێشەیە ببێتە هۆی دروست بوونی تەنگژەی دەستووری کە لە ئەنجامدا دارمانی پرۆسە سیاسییەکەی لێ بکەوێتەوە.

٢- ململانێ لەسەر داواکاری و شوێنەکان
بە درێژایی ئەو هێڵەی کە کوردستان لە عەرەبی عێراق جیا دەکاتەوە و لە سنجارەوە لە باکوری ڕۆژئاوا شۆڕ دەبێتەوە بەسەر ناوچەکانی تەلەعفەر و موسڵ و کەرکوک و خورماتو بەرەو خانەقین و مەندەلی لە ڕۆژهەڵاتی بەغدا، کورد و عەرەب و تورکمان و کلدان و ئاشووری و شەبەک سەدان ساڵە پێکەوە دەژین. لە ڕووی ئایینیشەوە، مەزهەبە جیاجیاکان: شیعەو سوننەو هەروەها مەسیحییەکان بە ناوە جیاجیاکان و یەزیدیش دەگرێتەوە. ئەم گروپانە لەگەڵ یەکدا تێکەڵ بوون، بەڵام هاوکات زمان و کلتوری تایبەت بە خۆیان پاراستووە. ئیتر پێکەوە ژیاون جا چ لادێی بوون، یان شاری، لە چوارچێوەی هۆزدا بووبن، یان نا. هەرچەندە جار بەجار ململانێ لە نێوانیاندا هەبووە، بەڵام بە زۆری بە شێوەی ئاشتییانە پێکەوە ژیاون.

ئێستا پیاوە بە تەمەنەکانی کەرکوک بە خۆشحاڵیەوە یادی ئەو رۆژانە دەکەنەوە کە لە سەردەمی پاشایەتیدا دانیشتووانی شارەکەیان پێکهاتبوو لە کورد و تورکمان، هاوکات لەگەڵ رێژەیەکی گرنگ لە مەسیحی و یەهودی (ئەوکاتە شارەکە زۆر جوان و هێمن بوو، بەراستی مۆزاییک بوو) (٢).

٢- گروپی تەنگژەکان چاوپێکەوتنی لەگەڵ ئیبراهیم تەها لە عەممان لە رۆژی ٢٠٠٦/٦/٢٠ و نەزیر کردار لە ئەستەمبول لە ٢٠٠٦/٥/٢٩ ئەنجام دا. هەرچەندە کەرکوک رێژەیەکیش عەرەبی تێدابوو، بەڵام بە زۆری عەرەبەکان لە گوندەکانی رۆژئاوای شارەکە دەژیان.
واش رێککەوتووە کە ئەو ناوچانەی دانیشتووانەکانیان تێکەڵن، بە نەوت و غاز دەوڵەمەندن. ئەوەتا یەکێک لە گەورەترین کێڵگە نەوتییەکانی عێراق کە (١٣٫٥١) ملیۆن بەرمیل نەوتی وەکو یەدەک تێیدایە و دەکاتە (١٢٪)ی رێژەی گشتی، دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای کەرکوک. (٣)
لە دوای دۆزینەوەش لە سالآنی بیستەکاندا، رژێمەکانی عێراق بەتایبەتیش لە دوای پاشایەتی (دوای ساڵی ١٩٥٨) دەستیان دایە زنجیرەیەک لە هەڵمەتی تەعریب لە ناوچەکە بە مەبەستی ئەنجامدانی گۆڕینێکی دراماتیکی لە دیموگرافیای ئەو شارە. دوای هێنانی دەیان هەزار عەرەب کە زۆربەیان عەرەبی شیعەی هەژار بوون لە باشووری عێراق، یان هاوولاتیانی غەیرە عەرەب لە شارەکە دەرکران، یان کرانە عەرەب لە رێگای سیاسەتی راستکردنەوەی نەتەوەوە. (٤)
٣- پارێزگای کەرکوک (٦) کێڵگەی نەوتی تێدایە، بەڵام ئێستا تەنها چواریان بەرهەم دێنێت. لە کاتێکدا کە رێژەی نەوتی کەرکوک زۆر گرنگە، بە پێی راپۆرتی (چاودێری داهاتی عێراق)، بەرهەمە کۆکراوەکانی (لە ساڵی ١٩٣٤)ەوە هەتاکو ئێستا رێژەی (٦٢٪)ی لە یەدەکی بنەڕەتی پێکهێناوە کە لەو بیرانەدا هەژمار کراون. ئەمەش مانای وایە کە ئەم کێڵگە زەبەلاحە لە کۆتاییەکانی تەمەنی خۆیدایە و توانای بەرهەمهێنانی ئێستای کە (٤٧٠٠٠٠) بەرمیلی رۆژانەیە، دوای (١٠) ساڵی تر بۆ نیوە دادەبەزێت و بۆ کەمتر لە (١٠٠٠٠٠) بەرمیل لە دوای ٢٥ ساڵ.
٤- نوری تاڵەبانی، تەعریب کردنی ناوچەکانی کەرکوک (لەندەن، ١٩٩٩).
لەم سیاسەتەشدا کورد زیاتر زەرەرمەند بوون بە حوکمی گواستنەوەیەکی گەورەیان لە گوندەکانەوەو دواتریش کوشتنی گوندنشینان بە تایبەتیش لە دەوروبەری کەرکوک لە کاتی ئەنفالەکاندا.

دیاره سەرژمێرییەکی باوەڕپێکراو بۆ دانیشتوان لەبەر دەستدا نییە و عێراقییەکان متمانەیان بەو سەرژمێرییانە نییە کە هەر دە ساڵ جارێک ئەنجام دەدرا، چونکە رژێمەکانی عێراق کۆنترۆڵیان دەکرد. هەروەها هاووڵاتیانی غەیرە عەرەب لە ناوچە ستراتیجییەکاندا ناچار دەکران کە خۆیان بە عەرەب بنووسن*، ئێستاش دانیشتووانی پارێزگای کەرکوک بە (٥ر١) ملیۆن کەس مەزەندە دەکرێت کە نزیکەی (٨٠٠٠٠٠)یان لە ناو شارەکەدان. لە ساڵی ١٩٥٧، بەر لە سیاسەتی تەعریب (سەرژمێری ئەو کاتە بڕوا پێکراوە) کورد لە پارێزگاکەدا بە زۆرینە حساب کراوە هەرچەندە لە ناو شاری کەرکوک بەو شێوەیە نەبوو و ئەو کاتە رێژەی تورکمان زۆرتر بوو**.

* لە سەرژمێری ساڵی ١٩٧٧، مەسیحییەکان ناچار کران کە خۆیان بە عەرەب ناونووس بکەن. لە ساڵی ١٩٨٧، من یەکێک بووم لە سەرژمێریکاران و رێنمایی کرام کە هەموو ئەو خەڵکەی فۆرمیان بۆ پڕ پڕدەکەمەوە بە عەرەب ناونووسیان بکەم بە بێ ئەوەی پرسیاریش لە خۆیان بکەم. لە ساڵی ١٩٩٧، بە کورد و تورکمان راگەیەنرا کە تەنها کاتێک دەتوانن ئۆتۆمبیل یان ماڵ بکڕن ویان پۆستی حکەمەتی وەربگرن کە خۆیان بە عەرەب ناونووس بکەن. ئەوە دوا سەرژمێری و خراپترین سەرژمێری بوو. (چاوپێکەوتنی گروپی تەنگژەکان لەگەڵ فەیحاء زین ئەلعابدین ئەلبەیاتی، سەرۆکی ئەنجومەنی ئافرەتانی تورکمان، بەغدا، ١٧/٦/٢٠٠٦.

** بە پێی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧، تورکمان زۆرینەیان لە ناوشاری کەرکوک پێکهێناوە بە (٤٥٣٠٦ بەرامبەر ٤٠٠٤٧ بۆ کورد و ٢٧١٢٧ بو عەرەب)، بەڵام لە ناوچەکانی کەرکوکدا لە دوای کوردو عەرەب هاتن (تورکمان ٣٨٠٦٥، کورد ١٤٧٥٤٦، عەرەب ٨٢٤٩٣)، لە سەرجەم پارێزگای کەرکوک، کور گەورەترین کروپ بوون بە (١٨٧٥٩٣ کەس) بەرامبەر (١٠٩٦٢٠ بۆ عەرەب و ٨٣٣٧١ بۆ تورکمان).

ئەلبەتە مێژووی ئەو گروپانە (وەکو ئەوەی خۆیان باسی دەکەن) و ئەزموونی تازەیان، بۆچوونی گروپەکان سەبارەت بە مافەکانیان لە کەرکوک دیاری دەکات.

## (أ) بۆچوونی کورد

هەرچەندە کورد دان بەوەدا دەنێن کە کەرکوک و ئەو ناوچانەی تر کە داوایان دەکەن، فرە نەژادن، (لە دەستووری تازەدا بە ناوچەی ململانێ لەسەر ناویان هاتووە)، بەڵام لە راگەیاندنە گشتییەکانیاندا سوورن لەسەر ئەوەی کەرکوک بەشێکی جیا نەکراوەیە لە

کوردستان. لەمەشدا زیاتر پێ لەسەر پێوەری جوگرافی دادەگرن نەک ئەتنی. ئەوان دەڵێن کەرکوک شارێکی کوردی نییە، بەڵام شارێکی کوردستانییە و ئەوەش ڕەت دەکەنەوە کە بایەخدانیان بە کەرکوک بە پلەی یەکەم بە هۆی سامانی نەوتەوە بێت، بەڵکو دووپاتی بوونی مێژووی کورد لە پارێزگاکەدا دەکەنەوە. هەروەها دەڵێن کەرکوک بەشێکی دانەبڕاو بووە لە ویلایەتی شارەزوور ئەگەر پایتەختی ویلایەتەکەش نەبووبێت و دواتریش بووەتە بەشێک لە ویلایەتی موسڵ لە کاتی عوسمانییەکاندا. بۆ نموونە، دکتۆر نوری تاڵەبانی کە هاوولاتییەکی کەرکوکەو زۆریشی لەسەر پرسی ئەو ناوچەیە نووسیوە، دەڵێت:
(کەرکوک شارێکی کوردی نییە، بەڵام بەشێکە لە کوردستان. سنوورەکانی کوردستان زۆر ئاشکران و سنووری ویلایەتی شارەزووره لە سەردەمی عوسمانییەکاندا. هەمیشە کەمینەی تێدا بووە. بەڵام هەردەم وەکو ویلایەتێکی کوردی ناسراوە.)
هەروەها کورد دەڵێت کە بە پێی سەرژمێری ١٩٥٧ کورد لە پارێزگای کەرکوک (بە بەراورد لەگەڵ شاری کەرکوک) زۆرینە بوون بەر لە دەست پێکردنی پرۆسەی تەعریب. هاوکات تورکمان بە تازە هاتوو و وەکیلی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی دەزانن وعەرەبە رەسەنەکانیش بە هۆزی گەڕۆک پێناسە دەکەن کە بەم دواییە لەوێ نیشتەجێ بوون. هاوکات ئەو دوو گروپە و کەمینە مەسیحییەکانیش بە دانیشتووی یاسایی دادەنێن کە دەبێ وەکو کەمینە لە کوردستاندا بپارێزرێت. لە بەرامبەریشدا داوا دەکەن عەرەبە هاوردەکان بگەڕێنەوە بۆ شوێنی راستەقینەی خۆیان. لە هەمان کاتدا دووپاتی دەکەنەوە کە هەڵبژاردنی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ و ریفراندۆمی دەستووری لە تشرینی یەکەمی ٢٠٠٥ ئەوەی بە روونی سەلماندووە کە کەرکوک خاوەن زۆرینەیەکی کوردە.
گەلی کورد دەڵێت کە خەباتێکی سەختیان کردووەو قوربانییەکی زۆریان لە پێناو کەرکوکدا داوە. هاوکات دەڵێن کە هەمیشە پێیان لەسەر داواکارییەکانیان داگرتووە لە کاتی گفتوگۆکانیان لەگەڵ رژێمەکانی پێشوو و هەمیشەش رەت کراونەتەوەو لە ئەنجامدا گفتوگۆکان بە دابڕانی خێرا گەیشتوون و ململانێی چەکداری دەستی پێکردۆتەوە. بە بۆچوونی ئەوەان، هیچ شتێک ناگاتە ئاستی مافەکانیان لە کەرکوک مەگەر هەوڵە چروپرەکانی دژ بە کورداندنی ناوچەکە نەبێت. هاوکات لەگەڵ ناوچەکانی تر کە دانیشتووانەکانیان تێکەڵن و ئەو هەڵمەتانەش بە هەڵمەتی ئەنفالکردنی گەرمیان و ناوچە گوندنیشنەکانی تری کەرکوک کە تێیاندا دەیان هەزار پیاو و ئافرەت و منداڵ راپێچ کران و گوللە باران کران و دواتریش لە گۆڕی بە کۆمەڵدا دوور لە کوردستان شاردرانەوە.
گەلی کورد دووپاتی مافی کەرکوکیە دەرکراوەکان دەکەنەوە (بە کورد و ئەوانی تریشەوە) لە گەڕانەوە بەو منداڵانەیشەوە کە دوور لە کەرکوک لە دایک بوون. هەروەها داوای ئەو

ناوچانە دەکەنەوە لە کەرکوک کە زۆربەی دانشتووانەکانیان کوردن و بە پارێزگاکانی ترەوە لکێنراون لە چوارچێوەی پرۆسەی تەعریب کردن، کە بگەڕێنرێنەوە سەر پارێزگای کەرکوک. لە کۆتاییشدا داوا دەکەن کەرکوک بکرێتە پایتەختی هەرێمی فیدراڵی کوردستان کە دەبێ ئەو ناوچانەش بگرێتەوە کە بە لای گەلی کوردەوە بەشێکن لە کوردستان و تووشی پرۆسەی تەعریب بوون.

داواکارییەکانی کورد لە بنەچەکەوە دژ بە یەکن. ئەوەتا لەلایەکەوە دووپاتی دەکەنەوە کە کەرکوک شارێک کوردی نییە، بەڵکو شارێکی کوردستانییەو، لەلایەکی تریشەوە ناتوانن روونی بکەنەوە کە بۆچی دەبێ کەرکوک ببێتە بەشێک لە هەرێمی کوردستان لەگەڵ ئەو راستییەدا شارێکی کوردی نییە، بەڵکو بە درێژایی مێژوو شارو ناوچەیەکی تێکەڵ بووە. هەروەها روونیش نییە کە پێویستە بوونی مێژوویی کورد لە کەرکوک بکرێتە داواکارییەکی سیاسی تایبەتمەند بە کورد لە ناوچەکەدا بە تایبەتیش کە لایەنە نەیارەکانی کوردیش هەمان داواکارییان لە شارەکەدا هەیە.

دیارە داواکاریی کورد بۆ پارێزگای کەرکوک وەکو هەندێک لە رۆشنبیرانی کورد خۆیانیش ئاماژەی پێ دەکەن، داواکارییەکی تازەیە و لە داواکاری لایەنەکانی تر بە هێزتر نییە (لە دوای سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی دەستی پێکردووەو تەنها لەسەرەتای شەستەکانی سەدەی رابردووەوە بووەتە بەشێک لە خەباتی رزگاریخوازی نەتەوەیی).

ئەڵبەتە نەوتی کەرکوک دەبێتە یاریدەدەر بۆ سەر بەخۆیی کورد هەرچەندە ئەم راستییە کە لەسەر بنەمای داواکاریی مێژووی لە بوونی بەردەوامی کورد و زۆرینەی دیموگرافی بونیاتنراوە، هەمیشە پشت گوێ خراوە. بێگومان خەونی سەربەخۆییش لە ناخی هەموو کوردێکدا چەقیوە کە دەزانن بە بێ کەرکوک، دەبێ وڵاتێکی هەژاریان هەبێت کە پێویستە پشت بە دراوسێکانی ببەستێت. بەڵام بڕوایان وایە کە بە بوونی کەرکوک و نەوتەکەی، هەرچەندە وڵاتێکی داخراویشیان هەبێت، دەتوانن ببنە خاوەن داهاتی ئابووری پێویست بۆ درێژەدان بە سەربەخۆیی سیاسییان. راستە بە پێی رێوشوێنی دەستووری، کورد بەشدار دەبێت لەگەڵ حکومەتی فیدراڵ لە داهاتی بیرە نەوتەکانی کەرکوک، بەڵام ئەگەر حکومەتێکی مەرکەزی بە هێز نەبێت و، یان شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسێت، ئەوا بە حوکمی نەمانی دەسەڵاتی حکومەتی ناوەند کۆنترۆڵی نەوتی کەرکوک دەکەوێتە دەست کورد.

هەروەها کورد دەڵێن ئەو ناوچانەی تر کە داوایان دەکەن (سنجار، تەلەعفەر، زوممار، شێخان، رۆژهەلاتی موسڵ، مەخمور، خورماتو، کفری، خانەقین، مەندەلی) و هەموویان یەدەکی نەوتین. لە هەردوو رووی مێژوویی و دیموگرافییەوە کوردیین و لەلایەن رژێمی پێشووەوە تەعریب کراون. لە کاتی گفتوگۆی دەستووری ساڵی (٢٠٠٥)دا، سەرکردەکانی

کورد نەخشەیەکیان پێشکەش کرد کە تێیدا سنوورەکانی هەرێمی کوردستان دیاری کراوە، ئەوەی کە خۆیان ئاواتی بۆ دەخوازن. ئەو نەخشەیە شارۆچکەی تەلەعفەریش دەگرێتەوە کە دەکەوێتە رۆژئاوای موسڵ و بەرپرسانی کورد بە ناوچەیەکی تێکەڵ لە رووی دانیشتووانەوە ناوزەدیان کردووە لە رووی مێژووییەوە دەکەوێتە ناو خاکی کورد سەرەڕای ئەوەی زۆرینەی دانیشتووانەکەی تورکمانن. ئەم ناوزەد کردنەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەوانەیە ببێتە ئاسانکاری بۆ داواکردنی سنجار.
کورد نایەوێت ئەو ناوچانە داگیر بکات، بەڵکو وەدەستیان بێنێتەوە یان بیانگەڕێنێتەوە. بۆ نموونە، رێککەوتنی تایبەت بە یەکگرتنەوەی هەردوو حکومەتی هەرێم لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٦ دەڵێت: ((پێویستە دەسکەوتە مێژووییەکانی گەلەکەمان زامن بکەین و تەواوی مافە رەواکانمان بسەلمێنرێن لە رێگای گەڕاندنەوەی کەرکوک و خانەقین و سنجار و مەخمور و ناوچە تەعریب کراوەکانی تر بۆ سەر هەرێمی کوردستان)).

## (ب) بۆچوونی تورکمان

بەلای تورکمانەکانەوە ویلایەتی موسڵ تورکمانی بووە، نەک کوردی یان عەرەبی و یان تێکەڵ. هەروەها کەرکوک و شارەکانی تر کە خاوەن تێکەڵەی دانیشتووانن وەکو کفری و خورماتوو و تازە خورماتوو و ئاڵتون کۆپری و تەلەعفەر بە شارو شارۆچکەی تورکمان لە قەڵەم دەدەن کە خەڵکی لە نەتەوەکانی تریش بەخۆوە دەگرێت. هەرچەند ژمارەیەک گوندی تورکمانی لەسەر ئەم هێڵەدا بە دی دەکرێن (وەکو گوندی بەشیر)، تورکمانەکان دان بەوەدا دەنێن کە گروپێکی شارنشینن و لەسەردەمی سلجوقی و عوسمانییەکاندا وەکو سەرباز، یان کارگێڕ و، یان خاوەن پیشە کۆچیان بۆ ئەو جێگایانە کردووە (هەرچەندە جار بە جار دەڵێن کەرکوک لە هەزاران ساڵ پێش ئێستاوە شارێکی تورکمانی بووە).
ئەوان بوونی بەهێزی کورد لە ناو شاری کەرکوک بۆ ئەو هەڵمەتی کۆچکردنی رووەو شارە، دەگەڕێننەوە کە لە دوای گەشە کردنی بازرگانی نەوت لە ساڵی ١٩٢٧ لە شارەکەدا روویدا، واتا بوونی کورد لەوێ تازەیەو، هەروەها دەڵێن کە تورکمانەکان بوونەتە یەکەمین قوربانی هەڵمەتی تەعریب و تێیدا رووبەرووی چەندین رێوشوێن بوونەتەوە وەکو دەست بەسەردا گرتنی زەویوزار و جیاوازی کردن لەگەڵیاندا سەبارەت بە دابین کردنی دەرفەتی کار. دوواتیشی دەکەنەوە کە تاکە رێگاچارە بۆ رزگاربوون لەو رێوشوێنانە بریتی بووە لە خۆتۆمار کردن بە عەرەب. هەروەها تورکمانەکان گاڵتەیان بەو بۆچوونانە دێت کە گوایا کورد یەکەمین قوربانی دەستی رژێمی پێشوو بوون و دەڵێت کە کورد دژ بە هەموو حکومەتە یاساییەکان راپەڕیوە لە ساڵانی بیستەکان بە سەرەوە لە سەردەمی پاشایەتی و

رژێمەکانی دواتر. هەروەها کورد بەوە تاوانبار دەکەن کە هەوڵیان بۆ کورداندنی کەرکوک داوە هەر لە دوای کۆتایی هاتنی فەرمانڕوایی پاشایەتییەوە.
لە دوای شەڕی ٢٠٠٣، تورکمان بە ئاشکرا بێزاریی خۆیان بەرامبەر گەڕانەوەی ئاوارە کوردەکان بۆ کەرکوک دەربڕی و گوتیان ژمارەی گەڕاوەکان لە ژمارەی ئەو کەسانە زیاترە کە دەرکرابوون و بگرە کوردی وڵاتانی دراوسێشیان تێدایە. هەروەها کورد بەوە تاوانبار دەکەن کە زەوی تورکمان داگیر دەکەن. لەو لاشەوە ئەمریکا بە هاوکاری کردنی کورد لەم بوارەدا تاوانبار دەکەن وەکو سزادانێک بۆ تورکیا بەرامبەر رازی نەبوونی ئەو وڵاتە بە تێپەڕبوونی هێزەکانی ئەمریکا بە ناو خاکەکەیدا بەرەو باکوری عێراق لە ئاداری (٢٠٠٣)دا. هاوکات داواکاری کورد لە شاری کەرکوک وەکو تەنها چاوچنۆکی بۆ نەوت رەت دەکەنەوە. ئەوان دەڵێن کە نابێ کەرکوک بخرێتە سەر هەرێمی کوردستان، چونکە (هەرگیز بەشێک نەبووە لە کوردستان). لە هەمان کاتدا نایانەوێ لە ژێرکۆنترۆڵی راستەوخۆی حکومەتی عێراقیشدا بمێننەوە، بەڵکو دەیانەوێ پارێزگای کەرکوک بکرێتە هەرێمی فیدراڵی جیاواز.
بێجگە لەوانەش، داواکاری کورد بۆ هەندێ ناوچەی تری وەکو تەلەعفەر رەت دەکەنەوە، چونکە بە ناوچەیەکی تورکمان نشین لە رووی مێژووییەوە دایدەنێن. لەم بارەیەوە موزەفەر ئەرسەلانی راوێژکاری سەرۆک جەلال تالەبانی بۆ کاروباری تورکمان گوتی: کورد دەیەوێ دیموگرافیای تەلەعفەر بگۆڕێت بۆ ئەوەی کۆنترۆڵی بازرگانییەکەی بکات و دەست بەسەر نەوت و سەرچاوە سروشتییەکانی تریدا بگرێت و، هەروەها رێڕەوێکیش بکاتەوە بەرەو سنجار و ناوچە کوردییەکانی سوریا. هەروەها گوتی:
((داواکاری کورد بۆ تەلەعفەر لەبەر هەمان هۆکارە کە بە هۆیەوە داوای کەرکوک وموسڵ و خورماتوو دەکەن، ئەوان دەیانەوێ زۆرترین خاک بخەنە سەر (وڵاتی خەونەکەیان) (ئەمەش ئاماژەیەکی تورکیا نییە بۆ هەرێمی کوردستان). دیارە رۆژێک دێت کە ببینین کورد داوایْ بەغداش بکات، چونکە ئێستا ئەوان فەرمانڕەوان لە بەغدادا)).

### (ج) بۆچوونی عەرەب

عەرەبەکانی ناوچەکە سەر بە سێ تیرەی کۆچبەرن: عوبێد، جبورو حەدید. ئەوان لە ناوچە گوندنشینەکانی رۆژئاوای شاری کەرکوکدا زۆرینەن (وەکو ناوچەی حەدید) و لە وەرگایان لەگەڵ ئەو گروپە نیشتەجێیانەدا هاوبەش بووە کە سەرقاڵی کشتوکاڵ بوون وەکو کورد. زۆربەشیان دیاردەی تەعریب و بگرە سروشتی جینۆسایدکارانەی ئەنفالیش رەت دەکەنەوە

و دەڵێن نزیکەی تەنها (١٠٠٠٠) کورد دەربەدەر کراون کە زۆربەیان لە نەوەتەکاندا لە شاری کەرکوک دەرکراون. بۆ نموونە، عەبدولرەحمان مونشد ئەلعاسی، کە سەرۆک هۆزێکی عەرەبە، گوتی: ئێمە دژ بە گەڕانەوەی ئەو کەسانە نین کە لەلایەن(سەدام)ەوە دەرکراون. بەڵام لە ١٩٩١ تا ٢٠٠٣، رژێم تەنها ١١٨٥٦ کوردی لە کەرکوک دەرکردووە، ئەم ژمارەیەش ناگونجێ لەگەڵ ئەو تەوژمی هاتنەی کورد بۆ کەرکوک لە دوای رووخانی رژێم.

بە بۆچوونی عەرەب، کەرکوک شارێکی تێکەڵە لە رووی دانیشتووانەوەو نابێ بکەوێتە دەست کوردستان، بەڵکو دەبێ یان لە ژێر کۆنترۆڵی راستەوخۆی حکومەتی مەرکەزیدا بێت ویان تایبەتمەندی خۆی هەبێت وەکو هەرێمێکی فیدراڵ. لەولاشەوە سەرکردەی یەکێک لە گروپە ئەتنیەکان دووپاتی رەنگاو رەنگی ئەتنی دانیشتوانی شارەکەی کردەوە: ژمارەیەک پەیوەندی و دۆستایەتی لە نێوان نەتەوەکاندا هەیە. سەیری من بکە. من عەرەبێکی سوننیم، چونکە باوکم عەرەبی سوننیە، بەڵام دایکم عەرەبی شیعەیە و ژنەکەم تورکمانەو لەلایەن ئافرەتێکی کوردەوە شیرم پێ دراوە. من بەر لە هەموو شتێک عێراقیم. ئەگەر کوردێک بکوژم، ئەوا مامی خۆم کوشتووە. ئەگەر شیعەیەک بکوژم، ئەوە مامێکی تری خۆم کوشتووە، ئەمە کەرکوکە. ئەو جیاوازییانەی ئێستا ئێوە لێرە دەیانبینن، بە شارەکە نامۆن. ئەوە دیاردەیەکی سیاسیە کە لە ماوەی ساڵێکدا لە ناو دەچێت.

(ئەحمەد حامد عوبێدی) ١٩/٤/٢٠٠٥ دەڵێت:

عەرەب لەلایەن رژێمەکانی پێشووەوە لە کەرکوک نیشتەجێ کران و زۆربەیان موسڵمانی شیعەن. لە زۆربەی حاڵەتەکاندا ددان بەوەدا دەنێن کە نیشتەجێ کراون و بگرە جار بە جاریش بە ئاشکرا رایدەگەیەنن (لەوانەیە لە ژێر پاڵەپەستۆی کورددا بێت) کە ئەگەر بە تەواوی قەرەبوو بکرێنەوە، ئەوا شارەکە بە جێ دێڵن. زۆربەشیان رەتی دەکەنەوە کە سیخوڕی رژێم بووبن، بەڵکو دەڵێن کە ئەوانیش قوربانی دەست کردەوەکانی رژێمن، چونکە لەسەر ماڵ و موڵکی خۆیان دەرکراون تا خزمەت بە پرۆسەی تەعریب بکەن. بەشێکی تریان دەڵێن کە لە چوارچێوەی کۆچکردن بە هۆی کارکردنەوە هاتوونەتە کەرکوک، چونکە دەرفەتی کاری تێدا بووە هەتاکو ئەگەر رژێمیش هاوکاری ئەو کۆچکردنەی کردبێت لە رێگای یارمەتی دانی ئەوانەوە. زۆرێکی تریش، بەتایبەتی نەوەی هاتووەکان دەڵێن کە جێگای بنەڕەتییان نییە تا بگەڕێنەوە بۆی و دەیانەوێ لە کەرکوک بمێننەوە لە ژێر کۆنترۆڵی راستەوخۆی حکومەتی مەرکەزیدا.

(عەبدولکەریم خەلیفە)ی مامۆستای زانکۆ لەم بارەیەوە دەڵێت:
کەرکوک ناوچەیەکە کە لیکی هەموو لایەکی بۆ دێتە خوارەوە، بەڵام چارەسەریشی ئاسانە، چونکە هەر کاتێ حکومەتی ناوەندی بڕیارێک بدات کە کەرکوک وەکو شارێکی عێراقی دەمێنێتەوە، ئەوا دەبێ ئەو حزبانەی نیازیان بەرامبەریان خراپە، دەمیان دابخەن.

## (د) بۆچوونی مەسیحییەکان

ئەو مەسیحییانەی بە زمانی ئاسوری قسە دەکەن بە ئاشووری و کلدان و ئاسوورییشەوە مێژووی بوونی خۆیان لە کەرکوک بۆ ئیمپراتۆریەتی ئاسووری پێش مەسیحییەت دەگەڕێننەوە. بە بۆچوونی ئەوان، هەموو نەتەوەکانی تر لە شارەکە مشەخۆرن. بەڵام ژمارەی مەسیحییەکان ئەوەندە کەمە لە شارەکەدا (نزیکەی ١٢ هەزار لە ساڵی ٢٠٠٦) کە بە گشتی داواکارییەکانیان پشت گوێ خراون و سکاڵای ئەوەیان هەیە کە لە کەرکوک و شوێنەکانی تریش لەلایەن کوردو عەرەبەوە دەست بەسەر موڵکیاندا گیراوە.
مەسیحییەکان لەوە نیگەرانن کە لە کاتێکدا ڕۆیشتنی ڕژێم دەرفەتی کاری خوڵقاندووە و هەروەها دەرفەتی خوێندنی بە زمانی سریانیش هێناوەتە ئاراوە، بێ سەروبەری و گروپە سەلەفییەکانیشی هێناوەتە کایەوە کە مەسیحییەکان بە کافر دەزانن و بۆچوونەکانیش دەڵێن کە هەر ئەوان گەیشتن تەقاندنەوەی کلێساکانیش پەیدا بوون.
مەسیحییەکان بە تایبەتی لەو گرژییە روو لە زیادبوونە دەترسن کە لە نێوان نەتەوەکان لەسەر کەرکوک دروست بووە، لەم بارەیەوە سەرکردەیەکی ئاشووری دەڵێت:
((ئەوەی تایبەت بێت بە ئێمە، گرفتمان نییە، پاڵەپەستۆشمان لەسەر نییە لە کەرکوکدا، بەڵام ئێمە نیگەرانین، چونکە تەنگژەیەک لە ئارادایەو هەموو لایەکیش باجەکەی دەدات.
بەرپرسێکی سیاسی نێوخۆیی ئاشووریش هوشیاری دا و گوتی:
هەموو لایەک خۆی چەکدار دەکات. ئێمە دەترسین. قسە لەسەر شەڕی ناوخۆ هەیە. هەر رووداوێک لەوانەیە ببێتە دەسپێکی ئەو شەڕە. جەلال تاڵەبانی گوتی: هەر کاتێ نەشتەرگەری بکەیت، پێویستە زۆر هوشیار بیت، بەڵام لە کەرکوک باسەکە دەربارەی نەشتەرگەری مێشکە. لەوانە کە پیاوێکی کورد دەست لە ئافرەتێکی عەرەب بدات، یان بە پێچەوانەوە، ببێتە یەکەم بریسکەی شەڕەکە. یان جوڵاندنی هەست، وەکو بەرز کردنەوەی ئاڵای کوردستان لە گەڕەکە عەرەب نیشنەکاندا. تا ئێستا خەڵکانێک هەبوون کە ئامادەبوون بۆ هێور کردنەوەی دۆخەکە. پێویستە ئەو خەڵکە دەسەڵات بە دەست بن، بەڵام ئێستا ئەوان وا نین.
(سەرگون لازار سلێوە)

### ٣- گۆڕانی سیاسی عێراق و کەرکوک

أ- بە کارهێنانی دەسەڵاتی تازەی کورد لە ئەنجامی رووخانی رژێمی پێشوو، هەردوو پارتە سەرەکییەکەی کورد، یەکێتی و پارتی وەکو بەهێزترین دوو ئەکتەری سیاسی دەرکەوتن. بە حوکمی ئەوەی باش رێکخرابوون و هەردوولایان خاوەن پێگەی جەماوەری هاوشێوە بوون بێجگە لە پشتیوانی کردنی ئەمریکا، باشترین کادیری خۆیان خستە ناو حکومەتی کاتی عێراق و بەمەش شێوازی ئەجێندای ئەو حکومەتەیان دارشت. هەردوو سەرکردەکەیان، مسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی پۆستەکانی خۆیان لە ئەنجومەنی حوکمی کاتی (٢٥) ئەندامیدا بە کار هێنا بۆ کاریگەری خستنە سەر دارشتنی دەستووری کاتی لە سەرەتای ٢٠٠٤دا کە ماددەی (٥٨)ی باس لە هەڵگەڕاندنەوەی دیاردەی تەعریب دەکات و ماددەی (٦١ج) دەسەڵاتی ڤیتۆ بە کورد دەدات لە دەستووری هەمیشەییدا.

لە قۆناغی خۆ ئامادە کردن بۆ هەڵبژاردنە گشتییەکانی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥، هێزی ئەو پارتانە بە شێوەیەک بوو کە نە دەکرا لە سەرکەوتنە دەمکیەکەدا نادیدە بگیرێت. ئەمەش هۆکارێک بوو بۆ دوودڵی حکومەتی کاتی لە بڕیاری دوا ساتەکاندا سەبارەت بە ملکەچ کردن بۆ ئەو داوایەی کە کوردە دەرکراوەکانی کەرکوک ئەوانەی لە سلێمانی و هەولێر نیشتەجێبوون رێگایان پێ بدرێت کە دەنگ بۆ ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک بدەن. هۆکاری ئەم ملکەچ کردنەش ئەوە بوو کە نەوەک کورد وەکو نەتەوە بایکۆتی هەڵبژاردنەکان بکات. لە ئەنجامیشدا عەرەبی سوننە بایکۆتی هەڵبژاردنەکانیان کرد. ئەمەش هەڵوێستی کوردی بە هێزتر کرد لە رێگای زیاد بوونی نوێنەرایەتیان لە هەردوو ئاستی نیشتمانی و پارێزگاییدا و دەرفەتێکی گەورەشی بۆ خوڵقاندن دەربارەی پرسی کەرکوک.

لە چەند چاوپێکەوتنێکدا لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٤دا چەند بەرپرسێکی باڵای یەکێتی و پارتی ددانیان بەوەدا نا کە پێویستە کورد پرسی خۆی لە چوارچێوەی سنووری دەوڵەتی عێراقدا چارەسەر بکات و ئامادەییشیان نیشان دا سەبارەت بە رێککەوتن لەسەر کەرکوک، بەڵام لە دوای هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥دا هەڵوێستەکان دەربارەی کەرکوک سەختگیر بوون ئەوە بوو مەسەلەی بارودۆخی تایبەت بەو پارێزگایە کە تا ئەو کاتە گفتوگۆی لەسەر دەکرا، تەنها بۆ ماوەی حکومەتی کاتی قبوڵ کرا و قبوڵ نەدەکرا کە ببێت بە بەشێک لە چارەسەری کۆتایی. هەروەها لە ئاداری ٢٠٠٥دا نەوشیروان ئەمین جێگری جەلال تاڵەبانی کە لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٤ گوتوبوی ئەو بارودۆخە تایبەتیەی سەبارەت بە کەرکوک وەکو ئەوەی برۆکسل لە حکومەتی بەلجیکا پێی

باشه، روونی کردەوە کە ئەو دۆخە تەنها لە چوارچێوەی هەرێمی کوردستاندا دەکرێت رووبدات. بە شێوازێکی تر بابەتی نوێ بریتی بوو لە سوور بوونی کورد لە تواندنەوەی کەرکوک لە ناو هەرێمی کوردستاندا، لەوانەیە وەکو پایتەخت نەبێت یان شێوازێکی پێناسە نەکراو لە رێوشوێنی هاوبەش کردنی دەسەڵاتدا. بەڵام بێ شک لە رێگای دۆخی تایبەت لە دەرەوەی هەرێم نییە جا چ جای ئەوەی لە ژێر کۆنترۆڵی راستەوخۆی حکومەتی مەرکەزیدا بێت.
بە پشت بەستن بەو هێزەی لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان وەدەستیان هێنا، سەرکردەکانی کورد دەستیان دایە فۆرمەڵە کردنی دەستوور لەساڵی (٢٠٠٥)دا کە دواتر لە دوو توێی ریفراندۆمێکی گشتیدا لە ئوکتۆبەر پەسەند کرا. پێشبینیشیان لە هەردوو ئاستی سیاسی و گفتوگۆی دەستووریدا بریتی بوو لە گەیشتن بە لووتکە سەبارەت بە ئەگەری جیابوونەوەیەکی ئاشتییانە لە رێگای بەربلاو کردنی سنوورەکانی هەرێمەکەیان و بەهێزکردنی دەسەڵاتەکانی و هەروەها وەدەست هێنانی سەرچاوە سروشتییەکان.
سەرکەوتنی ئەم ستراتیجیەتەش بە روونی لە ماددەی (١٤٠)ی دەستووردا رەنگی دایەوە کە خشتەیەکی کات بوو بۆ چارەسەر کردنی کێشەی کەرکوک. هەروەها، ماددەی (٥٨ج)ی دەستووری کاتی کە رێگا بە کەرکوک و بەغدا نادات بچنە پاڵ هیچ هەرێمێکی تر، لە ماددەی (١٤٠)دا دەرناکەوێت. ئەم گۆڕانکارییە بە ئەنقەستە دەرفەت دەخوڵقێنێ بۆ لکاندنی کەرکوک بە هەرێمی کوردستانەوە لە رێگای ریفراندۆمێکی جەماوەرییەوە.
دوای سەرکەوتنە نەتەوەییەکەیان لە هەڵبژاردندا، کورد کۆنترۆڵی هەڵبژاردنی پارێزگای کەرکوکی کرد و لە ئەنجامدا شێوازی سیاسەتی نێوخۆییان بە شێوەی دراماتیکی گۆڕی.
ئەوە بوو لیستی کورد (١٩ر٥١٪)ی دەنگەکانی وەدەست هێنا کە دەکات زۆرینەیەکی رەها بە ٢٦ کورسی لە کۆی ٤١ کورسی ئەنجومەنی ئەو شارە. لیستی سەرەکی تورکمانەکانیش، واتا بەرەی تورکمانی عێراقی بە پلەی دووەم هات بە کۆی (٨) کورسی. پێکهاتەی تێکەڵی لە سیاسەتوانانی عەرەبی سوننەش کە پێی دەوترێت گروپی کۆماری عێراق، تەنها (٥) کورسی بردەوە. دوو کورسیەکەی تریش بوون بە بەشی هەڤاڵبەندییەکی بچووکی تورکمانی بە ناوی (هاوپەیمانی ئیسلامی و تورکمانی).
جێگای سەرنجە کە هیچ پارتێک نەبوو لەسەر بنەمای ئەتنی نەبێت و دەسکەوتی وەدەست هێنا بێت.
ئەم سەرکەوتنەی کورد تەنگژەی لێ کەوتەوە نەک تواناو دەرفەت بۆ داڕشتنی سیاسەت.
ئەوە بوو هەر کە ئەندامەکان جێگای خۆیان گرت و ئەنجومەن یەکەم کۆبوونەوەی خۆی کرد،

گرژییە ئەتنییەکان کە هەڵمەتەکەی کورد زیاتر وروژاندی لە جێگای ئەوەی هێوری بکاتەوە، زیاتر پەرەی سەند. ئیتر سوور بوونی کوتلەی کوردی لەسەر بەکارهێنانی زمانی کوردی بە بێ وەرگێڕ، بوو بە هۆی دەرچوونی ئەندامانی تر، لە ئەنجامیشدا چەند پۆستێکی سەرەکی بە بەتاڵی مانەوە، چونکە سیاسەتوانانی عەرەب وتورکمان کە وازیان لە پۆستی پارێزگار هێنابوو بۆ کورد، سوور بوونی خۆیان نیشان دا لەسەر بایکۆت کردنی کۆبوونەوەکان ئەگەر بێت و پۆستەکانی جێگری پارێزگار و سەرۆکی ئەنجومەنیان پێ نەدرێت. تەنگژەکەش لە ساڵی (٢٠٠٦)دا درێژەی کێشا. دواتر عەرەب و تورکمان بە تەنها بە پۆستی جێگری پارێزگار رازی بوون، بەڵام رێک نەدەکەوتن لەسەر ئەوەی کێ لەو پۆستەدا دابنێن. لە کاتێکیشدا کە بەشداری لە گفتوگۆکانی ئەنجومەن دەکەن، لە کاتی دەنگداندا کۆبوونەوەکان بە جێ دێڵن تا شەرعیەت بە ئەنجامی ئەو دەنگدانانە نەدەن. بەمەش کورد بە تەنها بە هۆی نەبوونی ئەوانەوە بڕیار دەدەن و بەهۆی گرژی و توندوتیژی ئەتنییەوە، بە زەحمەت دەتوانن بڕیارەکانیان جێبەجێ بکەن، تەنها لە گەڕەکە کوردنشینەکان نەبێت.
لەم سەروبەندەدا، پارتە کوردییەکان کۆنترۆڵی هێزەکانی ئاسایشی کەرکوکیان کرد بە حوکمی زۆرینەیان لە سوپاو پۆلیسداو، هەروەها بەڕێوەبردنی هێزی ئاسایش و هەواڵگری تایبەت بەخۆیان. هەروەها کۆنترۆڵی خزمەتگوزاری مەدەنیشان کردووە، چونکە کەسانی سەر بە خۆیان لە پۆستە سەرەکییەکاندا داناوە کە مووچەکانیان لە هەردوو حکومەتی کوردستانی هەولێر و سلێمانی دابین دەکرێن. ئەم جۆرە رێوشوێنەش پێکدادانی جیددی لێکەوتۆتەوە لە نێوانیان و هەروەها لەگەڵ نەتەوەکانی تریش لە بارودۆخێکدا کە هەر لە بنەڕەتدا بە هۆی توندوتیژی چەکداری و گەشە کردنی تاوانەوە ئاڵۆز بوو.

بۆ پاڵەپەستۆ کردن لە داواکارییەکانیان سەبارەت بە کەرکوک، کورد ستراتیجیەتێکی فرە لایەنەیان پەیڕەو کرد کە ئەم خاڵانە دەگرێتەوە:
* بە کارهێنانی دەسەڵاتی سیاسی و دەستووری لەسەر ئاستی نیشتمانی لە رێگای ئەو بڕیارە ئیداری و یاساییانەی دەدرێن بە مەبەستی گەڕاندنەوەی کەرکوک بۆ سەر هەرێمی کوردستان. نوێنەرایەتی لەسەر ئاستی بەرزی حکومەتی نیشتمانی و لیژنەی دەستووری ئەوەیان زامن کردووە سیاسەت داڕێژەرانی کورد دەتوانن سوود لەو هۆکارە دەستوورییە وەربگرن کە پێشتر گفتوگۆیان لەسەر کراوە وەکو یاسای کاتیی ئیدارەی

دەوڵەت بۆ دروست کردنی دەزگای تازە وەکو لیژنەی ماددەی (٥٨) کە بەتایبەتی بۆ پێشخستنی پرسی کورد لە کەرکوک دامەزراوە. هەروەها هیوایان وایە ماددەی (١٤٠) لە دەستوور بە کاربێن بۆ ڕێکخستنی سەرژمێرییەک و ریفراندۆمێک لە کەرکوک و ئەو ناوچانەی تر کە داوایان دەکەن، بەر لە کۆتاییهاتنی ساڵی (٢٠٠٧).

* دەربڕینی بەرزترین ڕاددەی داواکاری لە سەرەتای گفتوگۆکاندا بە مەبەستی کەم کردنەوەی ئەگەری پاشەکشە کردن لە ئەنجامدا. لە مەسەلەی داڕشتنی دەستووردا، داواکارییەکان بریتین لە:

١- خاوەنداریێتی تەواوی کورد بەسەر سەرچاوەی نەوت و گاز لە ناو سنووری هەرێمەکەیان لەگەڵ مافی هەناردنە دەرەوە لە کاتێکدا کە مەسەلەی دابەش کردنی داهات بۆ گفتوگۆکان بە جێ دەهێڵن.
٢- ڕێژەیەکی دیاری کراو لە بودجەی عێراق (٢٥٪).
٣- کۆنترۆڵ کردنی سیاسەتی دارایی لە هەرێمەکەدا.
٤- چەند پۆستێکی سەرەکی وەکو پارێزگار و سەرکردەی پۆلیس.
٥- ڕێکخستنی سنوورەکانی هەرێم بۆ ئەوەی ئەو ناوچانەش بگرێتەوە کە ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتووانەکەیان کوردە.
٦- پاراستنی هێزە سەربازییەکانیان (واتە پێشمەرگە).
٧- مافی ڤیتۆ سەبارەت بە هاتنی سەربازانی عێراقی بۆ ناو هەرێمەکەیان.

هەندێ لەو داواکارییانە جێبەجێ کراون وەکو: خاوەنداریێتی بەسەر سەرچاوەی نەوت و غازەوە، دەسەڵاتی دامەزراندن و پاراستنی هێزی پێشمەرگە. بەڵام هەندێکی تریان هەموار کران ویان لادران. بۆ نموونە: ڕێژەی دیاری کراو بۆ کوردستان لە بودجەی خۆی بە ١٧٪ مایەوەو حکومەتی فیدراڵیش دەسەڵاتی بەسەر سیاسەتی داراییدا وەرگرتەوە. بەڵام مەسەلەی مافی ڤیتۆی هەرێم سەبارەت بە هاتنی سوپای عێراق بۆ ناو هەرێمی کوردستان وەکو خۆی بە چارەسەر نەکراوی ماوەتەوە. هەروەها داواکاری تایبەت بە داڕشتنەوەی سنوورەکان دواخراوە، بەڵام لە چوارچێوەی ماددەی (١٤٠)دا میکانیزم و خشتەیەکی کات بۆ چارەسەر کردنیان دانراوە.

* هەڕەشە کردن بەوەی ئەگەر داواکارییەکانی کورد جێبەجێ نەکرێت، ئەوا لەوانەیە جەماوەری کوردی پاڵەپەستۆ بە ئاراستەی سەربەخۆ بوون دروست بکەن. سەرکردەکانی کوردیش (بزووتنەوەی ریفراندۆم) وەکو بەڵگەیەک لەسەر راست و دروستی ئەو بۆچوونە باس دەکەن. بزووتنەوەکە لەلایەن پارتی و یەکێتییەوە بە

ئامانجی زامن کردنی هەرێمێکی فیدراڵی دامەزراوە لەسەر بنەمای ئەو فەلسەفەیەی کە بە وتەی ئازاد شاکەلی دەڵێت: (ئەگەر ١٠٠ دۆلارت پێویست بوو، داوای ٢٠٠ دۆلار بکە. شاکەلی هەروەها دەڵێت: (عەرەب تەنانەت بە فیدراڵیش رازی نین (وەکو کورد ئاماژەی پێ دەکات)، بۆیە پێویستە هەڕەشەی ریفراندۆم بۆ سەربەخۆیی هەر بمێنێت).

* بە دی هێنانی ئاشتی لە نێوان پارتی و یەکێتی و دووپات کردنەوەی بۆچوونی هاوبەشیان سەبارەت بە هەرێمی کوردستان لە چوارچێوەی عێراقێکی فیدراڵدا و هەوڵ و کۆششی زیاتر بۆ یەکگرتنەوەی تەواوی هەردوو حکومەتی هەرێم لە هەولێر و سلێمانی. لە گفتوگۆکانی تایبەت بە دەستوور سەرکردەکانی کورد دەرەکیان بەو راستییە کرد کە تەنها بەرەیەکی کوردی یەکگرتوو دەتوانێ رەزامەندی هەموولایەک لەسەر فیدراڵیزم مسۆگەر بکات وەکو هەنگاوێکی گرنگ بەرەو هێنانەوەی کەرکوک بۆ سەر کوردستان. ئەڵبەتە چەندین جار دواخستنی پرۆسەی یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارەی کوردی بیانووی تازەی بۆ غەیرە کوردەکان خوڵقاندووە کە دەڵێن ناکۆکی نێوان پارتی و یەکێتی دەیسەلمێنێ کە کورد شایستەی ئەوە نین هەرێمەکەی خۆیان بەڕێوە ببەن. یەکگرتنەوەی هەردوو ئیدارەکەش لە مایسی ٢٠٠٦ تەنها نیمچەیی بوو، بەڵام هەڵوێستی یەکگرتووی ئەو دوو پارتە لە کاتی گفتوگۆکانی تایبەت بە دەستووری عێراق ئەوەی سەلماند کە بەرژەوەندی و بایەخی هەردوولا چوون یەکە.
* بەردەوام بوون لە هاوپەیمانێتی نزیک لەگەڵ ئەمریکاو بەریتانیا لەسەر بنەمای ئەوەی کە ئەو جۆرە هەڵوێستە پاداشت دەدرێنەوەو، هەروەها لەسەر بنەمای ئەوەی کە بە کارکردن لەگەڵ هێزی ئەمریکا دژ بە تیرۆریستان (بە کار کردن لە کەرکوکیشەوە)، ئەمریکا بەوە رازی دەکەن کە تەنها کورد دەتوانێ ئاشتی لەوێ مسۆگەر بکات.
* رێکخستنی هەڵمەتێکی چڕوپڕ بە ئامانجی رازی کردنی نەتەوەکانی تر کە مافەکانیان وەکو کەمینە بە تەواوی دەپارێزرێت وەکو مافی تورکمان و مەسیحی و شەبەک و کەمینەکانی تر کە ئێستا لە هەرێمی کوردستاندا دەژین. سەبارەت بە تورکمان و مەسیحییەکانی کەرکوکیش، پێویستە لەوە دڵنیا بکرێنەوە کە بە شێوەیەکی باشتر دەپارێزرێن لەوەی کە لە ژێر کۆنترۆڵی حکومەتی مەرکەزدا بن. لەم بارەیەوە ئازاد شێخانی دەڵێت:

((ئەگەر بتوانین تورکمانەکان بەوە رازی بکەن کە لە ژێر کۆنترۆڵی کورددا دۆخیان باشتر دەبێت، ئەو کاتە دەکرێ کێشەی کەرکوک چارەسەر بکرێت. بەڵام ئەمەش

کارێکی زۆری دەوێت))، لەلایەکی ترەوە پیرۆت تاڵەبانی پارێزەری کەرکوکی دەڵێت: کە بە تێپەڕبوونی کات، کەمینەکانی تر رادێن لەگەڵ ژیان لەژێر دەسەڵاتی کورددا.

* دوا خاڵیش بریتییە لە بەگەڕ خستنی هەموو تواناکان بە ئاراستەی خێرایی کردن لە گەڕانەوە بۆ دۆخی پێشوو لە کەرکوک بەر لە ئەنجامدانی سەرژمێری و ریفراندۆم لە ساڵی (٢٠٠٧) دا.

**(ب) هەنگاوی ئاسایی کردنەوە**

پێکهاتەی سەرەکی لە ستراتیجیەتی کورد سەبارەت بە لکاندنی (بە بۆچوونی ئەوان) گەڕاندنەوەی کەرکوک و ناوچەکانی تر بە هەرێمی کوردستانەوە بریتییە لەپرۆسەیەک کە پێی دەڵێن (ئاسایی کردنەوە)و لە بنەڕەتدا بریتییە لە پێچەوانە کردنەوەی پرۆسەی تەعریب. ئەم پرۆسەیە لە ماددەی (٥٨)ی دەستووری کاتیدا باس کراوە کە ئەم خاڵانە بە خۆوە دەگرێت:

١- گەڕاندنەوەی دەرکراوەکان لەگەڵ گەڕاندنەوەی ماڵ و موڵکیان، یان قەرەبوو کردنەوەیان.

٢- ئەو کەسانەی رژێمی پێشوو لەو ناوچانە نیشتەجێی کردوون، دەکرێ بگوازرێنەوە، یان حکومەت قەرەبوویان بکاتەوە، یان زەوییان پێ بدرێت لە نزیک شوێنە کۆنەکانی خۆیان، یان خەرجی گواستنەوەیان بۆ شوێنە تازەکان پێ بدرێت.

٣- دروست کردنی دەرفەتی دامەزراندن بۆ یارمەتیدانی ئەو کەسانەی تووشی بێ کاری بوون لە ئەنجامی جیاوازی کردن لەگەڵیاندا لەسەر بنەمای ئەتنی.

٤- هەڵوەشاندنەوەی سیاسەتی (تصحيح القومية) کە لە کەرکوکدا بە کار هاتووە بۆ ناچارکردنی کورد کە خۆیان بە عەرەب ناونووس بکەن ئەگەر نیازی کڕینی زەویوزاریان هەبێت، خزمەتگوزارییان پێشکەش بکرێت ویان رێگایان پێ بدرێت لە کەرتەکانی کاری نەوت کار بکەن.

٥- داوای رێنمایی کردن لە ئەنجومەنی سەرۆکایەتی سەبارەت بە چۆنیەتی هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکانی رژێمی پێشوو تایبەتی بە سنوورە ئیدارییەکان.

٦- دواخستنی بڕیاری کۆتایی سەبارەت بە (ناوچە ململانێ لەسەرەکان) هەتاکو دوای پەسەند کردنی دەستووری هەمیشەیی.

دەستووریش کە لە ئۆکتۆبەری (٢٠٠٥) پەسەند کرا، ئەم مەرجانەی بەخۆوە گرت، بەڵام هاوکات باسیش لە پرۆسەیەک دەکات دەربارەی چارەسەر کردنی دۆخی ئەو ناوچانە.

ماددەی (١٤٠) برگەی (٢) دەڵێت:
ئەو بەرپرسیاریتییەی خراوەتە سەر دەسەلاتی جێبەجێ کردن لە حکومەتی کاتیدا و لە چواچێوەی ماددەی (٥٨)ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت بۆ ماوەی کاتی، درێژەی پێ دەدرێت و دەخرێتە ئەستۆی ئەو دەسەلاتە جێبەجێ کردنەی کە بە پێی دەستوور هەڵبژێردراوە بە مەرجێک ئاسایی کردنەوەو سەرژمێری و ریفراندۆم لە کەرکوک و شوێنە ململانێ لەسەر کراوەکانی تر بە ئەنجام بگەیەنێت بەر لە مانگی گانوونی یەکەمی ٢٠٠٧ بۆ ئەوەی رێز لە ئیرادەی هاوولاتییەکانی بگیرێت.
هەرچەندە ماددەی ١٤٠ وردەکاری دەربارەی شێوازی ریفراندۆم و شێوازی هاوولاتیان لە دەربڕینی ئیرادەیان ناخاتە روو، پێویستە بە پەیوەست بوون بە ماددەی (٥٨ج) بخوێنرێتەوە کە دەڵێت:
((چارەسەری کۆتایی بۆ ناوچە ململانێ لەسەرکان بە کەرکوکیشەوە.. هاوشانی پرەنسیپی دادوەریی دەبێت بە رەچاو کردنی ئیرادەی خەڵکەکەیان)). ئاماژەکەش لێرەدا ئەوەیە کە دانیشتووانی ئەو ناوچانە دەرفەتیان بۆ دەڕەخسێت، تا دەربارەی دۆخی ناوچەکانیان لە عێراقێکی فیدراڵ لە ئایندەدا دەنگ بدەن.
بە پشت بەستن بە ماددەکانی (٥٨)و (١٤٠) کورد داوا لە هاوتا سیاسییەکانی خۆی دەکات کە پرۆسەی (ئاسایی کردنەوە) لە کەرکوک و شوێنەکانی تر بە ئەنجام بگەیەنن.
ئەوان پێ لەسەر ماددەی (٥٨) دادەگرن، چونکە پێشبینی دەکەن کە زۆرینەیەکی دیموگرافی لەو ناوچانە پێک بێنن کە بە بۆچوونی ئەوان بە درێژایی مێژوو کوردنشین بوون و، هەروەها هەوڵ دەدەن ئەو ناوچانە بە کوردستانەوە بلکێنن لە رێگای وەدەست هێنانی زۆرینەی سادە لەو ریفراندۆمەی کە بە پێی ماددە (١٤٠) ئەنجام دەدرێت. لەم بارەیەوە رۆژبەیانی لە پارتی دیموکراتی کوردستان دەڵێت:
کاتێ ئەو ناوچانە بخرێتەوە سەر کوردستان، روون دەبێتەوە کە کورد لەوێدا زۆرینەن. ئینجا خەڵکی کەرکوک سەرپشک دەبن لەوەی شارەکەیان بخرێتە سەر کوردستان یان نا و، حکومەتی ناوەندیش پێویستە رێز لە بڕیاری ئەوان بگرێت.
بەڵام هەوڵەکانی کورد رووبەرووی بەربەرەکانێی توند بووەتەوە لەلایەن عەرەب و تورکمانەوە لە کەرکوک بێجگە لە بۆچوونی بەشێکی زۆری عەرەب لە سەرانسەری عێراقدا بەوانەشەوە کە رۆڵی سەرەکی دەگێڕن لە حکومەتی ناوەند لە بەغدا. هۆکاری رازی نەبوونی کوردیش بە دووبارە پالاوتنی ئیبراهیم جەعفەری بۆ پۆستی سەرۆک وەزیرانی عێراق لە ساڵی (٢٠٠٦) ئەوەی بوو کە ناوبراو لە خولی یەکەمی سەرۆکایەتی

وەزیرانی کاتیدا نەک هیچی نەکرد بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی ئاسایی کردنەوە لە کەرکوک، بەڵکو هەوڵی زۆریشی دا بۆ ڕێگا گرتن لە بەڕیوەچوونی ئەو پرۆسەیە.
زۆربەی ڕێنماییەکانی ماددەی (٥٨) گرفتی گەورە دروست دەکەن لە رووی لێکدانەوەوە، بێجگە لە مەسەلەی جێبەجێ کردنیان. بۆ نموونە، لە کاتێکدا نارەزاییەکی ئەوتۆ لە ئارادا نییە بەارمبەر گەڕانەوەی ئەوانەی لە کاتی پرۆسەی تەعریبدا دەرکراون، بەڵام ململانێیەکی زۆر بە هێز هەیە سەبارەت بە ژمارەی ئەو کوردانەو بە رادەیەکی کەمتریش ئەو تورکمانانەی کە رژێمی بەعس دەری کردوون. ئەوەتا سیاسەتمەدارانی عەرەب و تورکمانی بە تورەییەوە ئەو ژمارانە رەت دەکەنەوە کە کورد باسیان دەکات. عەلی مەهدی سدیق کە ئەندامێکی تورکمانە لە ئەنجومەنی هەڵبژێردراوی شاری کەرکوک دەڵێت:
ئەو کوردانەی لە کەرکوک دەرکراون مافی گەڕانەوەیان هەیە، بەڵام ئەوەتا ژمارەیەکی زۆرتر دێنەوە بۆ ناو شارەکە. لە ساڵی ٢٠٠٣دا ژمارەی دانیشتوانی پارێزگای کەرکوک ٨٥٠ هەزار کەس بووە کەچی ئێستا ١٥٠ر١ هەزار کەسە. ئەی ئەو ٣٠٠٠٠٠ کەسە زیادەیە لە کوێوە هاتوون؟. با وا دابنێین ئەو ژمارەیە دەکاتە ٥٠٠٠٠ خێزان، بەڵام تەنها ١٠٠٠٠ خێزان لەسەردەمی رژێمی پێشوودا دەرکراون. ئەی ئەو ٤٠٠٠٠ خێزانەکەی تر لە کوێوە هاتوون؟
ئەو بۆچوونانە باس لەوە دەکەن گوایە دیان هەزار کورد لە کەرکوک و دەوروبەری لە هەشتاکاندا لەلایەن رژێمی پێشووەوە دەرکراون یان کوژراون، بە هەند هەڵناگیرێن چونکە بەشێکی زۆر لە شارو شارۆچکەکانی دەوروبەری کەرکوک لە چوارچێوەی پرۆسەی تەعریبدا خراونەتە سەر پارێزگاکانی تر، کەواتە بە رەسمی بەشێک نین لە پارێزگای کەرکوک و، هەروەها بە هۆی لێکدانەوەی جۆراوجۆر بۆ رابردوو بۆچوونەکانی کورد سەبارەت بە کەرکوک رەت دەکرێنەوە. ماددەی ٥٨ سەبارەت بە عەرەبی نیشتەجێ کراو لە کەرکوک و ناوچە تێکەڵەکانی تر بە هەمان رادە جێگای مشتومڕن. لەم بارەیەوە (نەوشیروان ئەمین) لە یەکێتی نیشتمانی کوردستان بە گروپی تەنگژەکانی گوت:
(( عەرەبە تازە هێنراوەکان دەبێت بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان، ئەمەش بە ئاشکرا لە ماددەی (٥٨)ی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت باس کراوە، ئەوانەی رازین بەوەی کەرکوک بەشێک بێت لە کوردستان و، هەروەها رازین بە ناسنامەی نەتەوەیی کورد لە سنوورەکانی پارێزگاکەدا دەتوانن بمێننەوە)).
بەڵام سەرەڕای بۆچوونی هەندێ لە سەرکردەکانی کورد ماددەکە باس لەوە ناکات کە تازە هاتووەکان بگەڕێنەوە. لەم بارەیەوە ئەحمەد عەسکەری کە سیاسەتمەدارێکی کوردە لە

کەرکوک دان بەوەدا دەنێت کە یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت عەرەبە تازە هاتووەکان ناچار ناکات بگەڕێنەوە، بەڵام دەڵێت:
((ئەگەر بمێننەوە ئەوا گرفتەکە هەر بەردەوام دەبێت، بۆیە ئێمە هانیان دەدەین کە بگەڕێنەوە)).
ئەو عەرەبانە بە زۆری شیعەن و لە ناو شاری کەرکوک دادەنیشن کە تێیدا زەویوزاری زۆریان لە سایەی رژێمی بەعسدا وەدەست کەوتووە. ئەوان بە زۆری خەڵکی هەژارن و کرێکارن لە کەرتی نەوتدا وە هەروەها، بەشێکیان سیخوڕی پلە نزم بوون لە ئاژانسە ئەمنییەکانی رژێمی بەعسدا.
هەر بۆیەش بە ناوبانگ نین لە شارەکەدا هەتاکو لەلایەن غەیرە کوردەکانیشەوە کە دەڵێن پێویستە عەرەبی تازە هاتوو بگەڕێنەوە بۆ جێگای بنەڕەتی خۆیان. بۆ نموونە، ئیسماعیل حەدیدی کە عەرەبێکی رەسەنی کەرکوکەو لەسەر لیستی کورددایە، بڕوای بە گەڕانەوەی رێکوپێکی ئەوانە هەیە هاوکات لەگەڵ دابین کردنی جێگاو دەرفەتی کار بۆیان لە شوێنی تردا. بەڵام دەڵێت ئەوانەی کە ئارەزووی مانەوەیان هەیە پێویستە رێگایان بدرێت تا بمێننەوە بەوانەشەوە کە لە کۆمپانیای نەوتی باکور دامەزراون هەرچەندە بە هۆی جیاوازی کردن لە دامەزراندندا لە کاتی رژێمی پێشوو، پێویستە پۆستی تازە لە کۆمپانیای نەوت بۆ کورد دابین بکرێت.
بە پێچەوانەشەوە پارتەکانی عەرەب و تورکمان لە کەرکوک، هەروەها زۆربەی پارتە نەتەوەییەکان لە بوونی زۆرینەیەکی کورد لە کەرکوک دەترسن و سوورن لەسەر ئەوەی کە عەرەبی تازە هاتوو مافی مانەوەیان هەیە. کوردیش دەیانەوێت لە عەرەبی شیعە لە کەرکوک رزگاریان بێت بۆ ئەوەی ژمارەی غەیرە کوردەکان کەم بکەنەوە بەر لە ئەنجام دانی ریفراندۆمێکی گشتی دەربارەی چارەنووسی کۆتایی شاری کەرکوک، ئەمە بە وتەی سیاسەتمەدارێکی عەرەب.
پرسەکە لەلایەکی تریشەوە پڕ گرفتە، چونکە زۆرێک لە عەرەبی تازە هاتوو شوێنی بنەڕەتی خۆیان نییە تا بۆی بگەڕێنەوە. بەشێکی زۆریان بە درێژایی نەوەیەک، یان زیاتر لە کەرکوک ژیاون، بۆیە منداڵەکانیان هیچ زانیارییەکیان دەربارەی شوێنی تر نییە.
هەروەها زانراویشە کە زۆرێک لە عەرەبە هەژارەکان بۆیە هاتوونە بۆ کەرکوک، چونکە کۆمپانیای نەوت دەرفەتی کاری بۆیان رەخساندووە. لە کاتێکدا رژێمی پێشوو هانی دەدان بۆ کۆچکردن بۆ کەرکوک لە رێگای پێدانی ئیمتیازات و دەرکردنی کورد و ئەوانی تر لە کۆمپانیای نەوت، ئەو جۆرە کۆچکردنانە دەبوایە روو بدەن. ئەوانەش کە بە دوای بارودۆخێکی باشتردا کۆچیان دەکرد، ئامێر بوون بە دەستی رژێمێکی دڕندەوە، بەڵام

تاوانبار نەبوون تا پاکتاو بکرێن. ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە ماددەی (٥٨) داوا ناکات عەرەبە هاوردەکان لە کارەکانیان بێبەش بکرێن هەتاکو لە کەرتی نەوتیشدا، بەڵکو داوا لە حکومەت دەکات کاری تازە لە کەرکوک دابین بکات.
یەکێکی تر لە گرفتەکانی ماددەی (٥٨) ئەوەیە کە مەرجی ئەوە دادەنێت ئەنجومەنی سەرۆکایەتی ڕێنمایی سەبارەت بە هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکانی ڕژێمی پێشوو لەمەڕ سنوورە ئیدارییەکان پێشکەش بکات. هەرچەندە سەرۆکی عێراقیش لە ساڵی (٢٠٠٥)دا کورد بوو و ئارەزووی هەڵوەشاندنەوەی تەعریبی هەبوو، جەلال تالەبانی کە لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥ وەکو سەرۆک بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵبژێردرایەوە، بەڵام هیچ هەنگاوێک نەنراوە بۆ دانانی میکانیزمێک بە مەبەستی چارەسەر کردنی کێشەی سنوورەکانی کەرکوک. هەر وەکو بەرپرسێکی کورد گوتی، ئەم شارە زەردەواڵەیە: سنوورەکانی کەرکوک تاکە سنوور نین کە ڕژێمی پێشوو دەستکاریی کردوون. ئەوەتا هەتاکو پارێزگای ئەنبار کە خاوەن زۆرینەیەکی سوننیە، ئەویش کێشەی سنووری تێدایە. کردنەوەی دەرگای کێشەی کەرکوکیش مەترسی ئەوەی لێ دەکرێت کە دەرگای کێشەکانی تریش بکاتەوە. هەروەها سیاسەتمەدارێکی کوردیش دەپرسێت: کێ ئیمزا لەسەر گەڕاندنەوەی ناوچە بنەڕەتییەکانی کەرکوک دەکات؟
بێگومان ئەنجومەنی نوێنەران ئەو کارە ناکات، ئەگەر گرفتەکە وا ئاسان بووایە، ئەوا پێکهێنانی حکومەت ئەوەندە کاتی پێویست نەدەبوو (دوای هەڵبژاردنەکەی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥).
ئەڵبەتە ناکارامەیی لە پرۆسەی هەڵگەڕاندنەوەی دیاردەی تەعریب بە شێوەیەکی تایبەتی کوردی توڕەو نیگەران کرد. هەرچەندە لە ڕێککەوتنی نێوان هەردوو لیستی کوردو شیعە کە لە نیسانی ٢٠٠٥ مۆر کرا، هاتووە کە دوای یەک مانگ لە دروست بوونی حکومەت دەست دەکرێت بە جێبەجێ کردنی ئەو ڕێوشوێنانەی لە ماددەی (٥٨)دا هاتوون، بەڵام حکمەتی جەعفەری بودجەی بۆ ئەو کارە تەرخان نەکرد وهیچ گۆڕانکارییەک لەو کاتەوە رووی نەداوە. ئەنجومەنی باڵای ئاسایی کردنەوەی کەرکوکیش کە بە لیژنەی ماددەی ٥٨ ناسراوە، تەجمید کراوە بە پێی قسەی سەرکردەیەکی سیاسی کە دەڵێت: ئەو لیژنەیە هیچی نەکردووە و ناتوانیت هیچیش بکات، ئەگەر نیازیان هەبێت بڕیار لەسەر شتێکیش بدەن، ئەوا لە کۆتاییدا بڕیارەکە دەگەڕێتەوە بۆ کوتلە سیاسییەکان کە لە پشت پەردەوە بڕیار دەدەن. سەرۆکی لیژنەکە، حەمید مەجید موسا گوتی: کە پێویستە بایەخی یەکەم بۆ دروست کردنی دەرفەتی کار و ئابووری بێت بە مەبەستی کەم کردنەوەی ئاڵۆزییەکان، بەڵام گومانیشی دەربڕی لەوەی ئەو هەنگاوە بە ئەنجام بگات، بەڵام هێشتا هیوایەک ماوە

که لیژنەکە لە سایەی حکومەتی تازەدا زیندوو ببێتەوە کە لە مانگی مایسی ٢٠٠٦دا دامەزراوە.
هەروەها حەمید مەجید موساو زۆرێک لە چاودێرانی بێ لایەن لەوە نیگەرانن کە کاری کۆمسیۆنی کێشەی موڵکداری وەکو پێویست بەرەو پێش ناچێت. کۆمسیۆنەکە لەلایەن دەسەڵاتی کاتیی هاوپەیمانان لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٤ دامەزراوە بۆ کار کردن لە پێناو گەڕاندنەوەی زەویوزارە زەوت کراوەکان بۆ خاوەنەکانیان و چارەسەر کردنی ململانێکان لەم بارەیەوە بە درێژایی چارەکی یەکەم لە ساڵی ٢٠٠٦، کۆمسیۆنەکە بڕیاری لەسەر تەنها (٢١٠٠٠) کێشە داوە لە کۆی نزیکەی (١٣١٠٠٠) کێشە لەسەرانسەری عێراق. لەو (٢١٠٠٠) کێشەیەش تەنها (٤٠٠٠)یان تایبەتن بە پارێزگای کەرکوک. ئەو هەیئەتەش کە لە مانگی ئاداری ٢٠٠٦ ناوەکەی گۆڕا بۆ کۆمسیۆنی چارەسەر کردنی ململانێی موڵکە راستەقینەکان، بە دەست چەندین گرفتەوە دەناڵێنێت وەکو ململانێ لەسەر سەرۆکایەتی کۆمسیۆن، کەمی بودجە، کەم و کورتی یاسایی، بیرۆکراسیەت و کەمی کەرەستە، بۆیە کورد کە سوودمەندی ژمارە یەکن لە کاری ئەو کۆمسیۆنە، رەتیان کردۆتەوە.
لەم رووەوە، قوباد تاڵەبانی، نوێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ئەمریکا دەڵێت: ((نەبوونی پرۆسەیەکی رێکوپێک هەموو کارێکی راگرتووەو راستگۆییمانی لە بەرامبەر گەلەکەمان خستۆتە ژێر گومانەوە، ئێستا دەمانەوێ دووبارە پرۆسەی گەڕانەوە یاسایی بکەینەوە بەڵام نەک لە رێگای دەزگایەکی وەکو کۆمسیۆنی باڵای ئاسایی کردنەوەوە کە نە شەرعیەتی هەیە، نە پارەو نە ستاف.
زیاد لەوەش، گرفتی سەرەکی بەلای کوردەوە بریتی نییە لە وەدەست هێنانەوەی زەویوزارە داگیرکراوەکان، بەڵکو گرفتی گەورە خۆی لە گەڕاندنەوەی دەرکراوەکان دەبینێتەوە بۆ ئەو ماڵ و گوندانەی رژێمی پێشوو لەگەڵ خاکدا یەکسانی کردبوو. ئەمەش بە پلەی یەکەم گرفتێکی سیاسی و ئابوورییە نەک گرفتی یاسایی، هەر بۆیەش لە چوارچێوەی ئەرکی کۆمسیۆنی عێراقی بۆ کێشەی موڵکداریدا نییە.
بێجگە لە مانەش، کۆمسیۆنەکە دەسەڵاتی ئەوەی پێ نەدراوە قەرەبووی ئەوانە بکاتەوە کە ماڵەکانیان رووخێنراوە نەک ئەوانەی داگیر کراون یان فرۆشراون، ئەمانەش زۆربەی ئەو حاڵەتانە دەگرنەوە کە لە کەرکوکدا بە دی دەکرێن. لیژنەی ماددەی ٥٨ دەسەڵاتی مامەڵە کردنی لەگەڵ ئەو حاڵەتانەدا پێ دراوە، بەڵام تا ئێستا دەستەوەستانە.
لەبەر ئەوەی هیچ پێشەوە چوونێک لە رێگای دامەزراوە فەرمییەکانەوە روویان نەداوە، کورد هەموو هەوڵێک بۆ ئەوە دەدەن کە گۆڕانکاری لە گۆڕەپانی کەرکوکدا بە دی بێنن بە

بێ ئەوەی وا نیشان بدەن کە پێشێلی یاسای بەڕێوەبردنی دەوڵەت، یان دەستوور دەکەن. ئەوان تواناو بودجەی ئەوەیان هەیە کە ژمارەیەکی زۆر لە کوردە دەرکراوەکانی کەرکوک بگەڕێننەوە بۆ گوندەکانیان بە هاوکاری ئەو حکومەتە بیانییانەی کە پشتیوانی لە ئاوەدان کردنەوەی گوندەکان دەکەن.

هەر لەم بارەشەوە قوباد تاڵەبانی گوتی:

((ئێمە بە شێوەی غەیرە فەرمی هانی کەرکوکییەکانمان داوە کە بگەڕێنەوەو بودجە و خەرجی گواستنەوەمان بۆیان دابین کردووە بۆ ئەوەی کارەکە بە رێکوپێکی بەڕێوە بچێت. بەڵام پێویستیمان بە میکانیزمێکی کردەیی هەیە بۆ جێبەجێ کردنی مافی گەڕانەوەکە)).

ئەو دەرکراوانەی دەگەڕێنەوە بۆ ناو شاری کەرکوک، خراونەتە شوێنی نیشتەجێ بوونی کاتی لە دوو جێگادا: یەکەمیان بارەگای فەیلەقی دووی سوپای رژێمی پێشوو نزیک فرۆکەخانەی کەرکوک و دووەمیشیان لە ناوچەی پەنجا عەلی نزیک شارۆچکەی لەیلان کە دەکەوێتە رۆژهەلاتی کەرکوک و درێژەپێدەری ناوچەی فراوانی گەرمیانە. بە حوکمی باری سەختی ژیانیان، ئەم دەرکراوانە بوونەتە کەرەستەیەکی بە سوود بە دەست پارتە کوردییەکانەوە بۆ پاڵەپەستۆ خستنە سەر کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بە مەبەستی دابین کردنی ئاسانکاری بۆ دەرکراوەکان لە رێگای دابین کردنی خزمەتگوزاری بنەڕەتی و ژێرخانەوە. بەڵام بە هۆی هێواشی پرۆسەی بەنیاتنانەوەو زیاد بوونی ململانێ لە کەرکوک کە تا رادەیەک بە هۆی بوونی دەرکراوەکانەوەیە، سیاسەتمەداران بە گشتی گەیشتونەتە ئەو بڕوایەی کە چارەسەری ئیختیاری بریتییە لە هاندانی ئەو دەرکراوانە بۆ گەڕانەوە بۆ گوندەکان لە جێگای نیشتەجێ بوون لە ناو شاری کەرکوک.

بە پێی بۆچوونی حەمید مەجید موسا، پێویستە حکومەتی فیدراڵ گوندەکان ئاوەدان بکاتەوە وەکو چۆن حکومەتی هەرێمی کوردستان لە دوای ساڵی ١٩٩٢ گوندەکانی هەر سێ پارێزگاکەی هەرێمی سەرکەوتووانە ئاوەدان کردەوە. ئەندامێکی تورکمانی ئەنجومەنی کەرکوکیش هەمان بۆچوونی هەبوو کاتێ گوتی: ((ئەوانەی کە لە گوندەکان دەرکراون دەبێ بگەڕێنەوە بۆ ناوچەکانیان و گوندەکانیشیان بونیات بنرێتەوە. پێویستە حکومەت دەرفەتی کار بخولقێنێ، چونکە کاتێ گوندنشینە کوردەکان دێنە ناو کەرکوک، کێشەی بێ کاری زیاد دەبێت بێجگە لە دروست بوونی فیتنەو تاوان)). عەلی مەهدی سدیق.

لەوانەیە لە ساڵی (٢٠٠٣)وە نزیکەی (٣٠٠٠٠) کورد گەڕابنەوە بۆ کەرکوک و دەوروبەری، بەڵام دابین نەکردنی بودجە لەلایەن حکومەتی مەرکەزییەوە پرۆسەی گەڕاندنەوەی عەرەبە تازە هاتووەکانی لە رێگای قەرەبوو کردنەوەو نیشتەجێ کردنەوەیانەوە دواخستووە. سەرکردەکانی کوردیش بڕوایان وایە بە گەڕانەوەی ژمارەیەکی

تر له کورد دەتوانن له ریفراندۆمی کەرکوکدا سەرکەون لەسەر بنەمای زۆرینەی سادەی دەنگەکان بە پێی دەستوور. بەڵام وەکو ڕەوتی ئاسایی کردنەوەکە نیشانی داوە، لەوانەیە کارەکە واش ئاسان نەبێت.

## (٤) دەرفەتەکان و گرفتەکان

### أ- کورد

گەلی کورد کە ئێستا لە رووی سیاسی و سەربازییەوە بە هێزەو لە ئاشتییەکی نێوخۆییدا دەژێت و هەروەها پەیوەندیی بە هێزی لەگەڵ ئەمریکادا هەیە، جموجوڵێکی جیدییان ئەنجام داوە لە هەردوو رووی شەرعی و واقعییەوە لە چوارچێوەی چاوبڕین بە لکاندنی کەرکوک بە هەرێمە فیدراڵییەکەیانەوە. سەرکردایەتی کوردیش متمانەیەکی پۆڵایینی بە سەرکەوتنی سراتیجیەتەکەی هەیەو هاووڵاتیانی بەوە رازی کردووە کە سەرکەوتن زۆر نزیکەو تەنها بە کۆتا هاتنی ساڵی ٢٠٠٧ وەدەست دێت. لەبەر ئەوە پشت گوێ خستنی ئەو گرفتانەی دێتە رێگای کورد ئاسانە، بەڵام لە کاتەکانی بیر کردنەوەی هێوردا بە بیران دێتەوە ک ئەو جۆرە گرفتانە لە ئارادان.

**یەکەم:** لە کاتێکدا کورد دەسەڵاتێکی سیاسی هاوشێوەی حکومەتی مەرکەزییان هەیە، لەوانەیە ئەم دۆخە بەردەوام نەبێت. لەوانەیە عێراق سەقامگیر ببێت و دەسەڵات بۆ حکومەتی ناوەند بگەڕێتەوە. ئەگەر کوردیش بە یەکگرتوویی بمێننەوە، ئەوا گرفتی جیدییان دەبێت لە هەوڵەکانیان بۆ زامن کردنی یاسای بە سوود لە بەرژەوەندی خۆیان بە تایبەتیش کە سەبری زۆرێک لە هاوبەشەکانی خۆیان لە بەغدا تاقی کردۆتەوەو لەم شێوازەشدا بەردەام دەبن مادام خاوەن گەورەترین پۆستن لە بەغدا. هەروەها لەوانەیە کورد رووبەڕووی دژایەتی کردنی بەهێز ببنەوە لە هەوڵەکانیاندا بۆ دەرکردنی عەرەبە تازە هاتووەکان، نەک تەنها لە ناو سەرکردەکانی حکومەت و عەرەبە عێراقییەکان بەگشتی، بەڵکو لەلای چەندین ئەندامی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی کە باس لەوە دەکەن هەموو هاووڵاتییەکی عێراقی مافی ئەوەی هەیە لە هەر شوێنێکی عێراق نیشتەجێ ببێت بە کەرکوکیشەوە.

**دووەم:** هەروەها هێزی سەربازی کوردیش سنووردارە. هەرچەندە جەنگاوەری عەگیدن لە ناوچە سەختەکاندا، بەڵام بە درێژایی مێژوو سەلماندوویانە کە لاوازن لە کۆنترۆڵ کردنی ناوچە دەشتاییە شارستانییەکان بە تایبەتیش لەو ناوچانەی کە دانیشتووانەکانیان تێکەڵن وەکو کەرکوک. هەرچەندە کورد بە خێرایی هێزی رێکخراوی خۆیان بونیات دەنێن، بەڵام لەوانەیە حکومەتێکی بە هۆشداهاتوو لە

بەغدا پێشکەوتنەکانی کورد لە کەرکوک و شوێنەکانی تر ئاوەژوو بکات. بە واتایەکی تر، لەوانەیە کورد ستراتیجیەتیان هەبێت بۆ وەدەست هێنانەوەی کەرکوک، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە کە چۆن دەتوانن ئەو کارە بکەن؟

**سێیەم**: کورد ئەوە فێر بوون لە ئەنجامی چەند ئەزموونێکی تاڵ کە پشتیوانی کردنی ئەمریکا بۆ ئەوان جێگیر نییە، چونکە پێشتر ئەمریکا وەکو رەهن بە کاری هێناون. ئەمریکا بە حوکمی پەیوەندی لەگەڵ تورکیا و تا رادەیەک ئێستاش، پشتیوانی کردن لە حکومەتی مەرکەزی لە بەغدا، لەوانەیە دژایەتی پلانە پڕ لە ئومێدەکانی کورد بکات.

لەم بارەیەوە ئیلنۆر چەڤیک کە رۆژنامەنووس و بەڵێندەرێکی تورکە و پەیوەندی پتەوی لەگەڵ سەرکردەکانی کورددا هەیە، دەڵێت:

((سەرکردە گەورەکانی کورد بە باشی دەزانن کە لە کۆتاییدا ئەمریکا دیانفرۆشێت)).

**چوارەم**: ناکرێ سەقامگیری سیاسی نێوخۆیی بە هەند هەڵبگیرێت. سەرەڕای ململانێی خوێناوی ناوەڕاستی نەوەتەکان، پارتی و یەکێتی بۆچوونێکی هاوبەشیان سەبارەت بە پێگەی کورد لە عێراق دروست کردووەو یەکگرتنە سەرنج راکێشەکەیان و هەروەها پرەنسیپەکانیان لەماوەی سێ ساڵی رابردوودا سەرکەوتنی لە بەغدا بۆیان مسۆگەر کردووە. بەڵام هەوڵەکانی ئێستایان بۆ یەکخستنەوەی هەردوو حکومەتەکەیان کە لە ئەنجامی شەڕی ناوخۆ هاتنە کایەوە، بە خێرایی بەرەو پێش ناچێت بە هۆی نەبوونی متمانە لە هەردوولاوەو برینەکانی رابردوو.

هەردوو پارتەکەش بۆچوونی جیاوازیان هەیە سەبارەت بە گرنگی کار کردن لەگەڵ حکومەتی ناوەند. ئەوەتا مسعود بارزانی، سەرۆکی هەرێمی یەکگرتووی کوردستان قورسایی پارتی دەخاتە سەر هەرێمە کوردییەکە لە کاتێکدا جەلال تاڵەبانی، سەرۆک کۆماری عێراق و سەرکردەی یەکێتی ئایندەی پارتەکەی و هەرێمەکەی خستۆتە سەر گرنگی بەغدا و عێراق. لە کاتێکدا کە تەحەداکان و خاڵەکانی ناکۆکی دەردەکەون (وەکو باڵادەستی سیاسی لە کەرکوک و گەیشتن بە بیرە نەوتەکانی)، پرسیاری ئەوە دروست دەبێت کە ئایا سەرکردەکانی کورد بڕوایان بەوە هێناوە کە تەنها لە رێگای ستراتیجیەتێکی هاوبەشی یەکێتی و پارتییەوە دەتوانن ئامانجەکانیان وەدەست بێنن؟

جەلال تاڵەبانی لە کۆبوونەوە تایبەتەکان و چاوپێکەوتنەکانی میدیادا چەندین جار دووپاتی کردۆتەوە کە دەکرێ لە کەرکوکدا دەسەڵاتەکان هاوبەش بن. گرفتی تاڵەبانیش لەوەدایە کە هەر هەڵوێستێکی نەرم کە لەم رووەوە نیشانی بدات، لەوانەیە هانی بارزانی بدات کە هەڵوێستی خۆی توند بکات و پشتیوانی یەکێتیش وەدەست بێنێت بە تایبەتیش کە خودی ئەو سەرکردانە پێشبینی خەڵکیان زیاد کردووە سەبارەت بەوەی کە بەم نزیکانە کەرکوک دەکەوێتە دەستی کورد. لەم حاڵەتەدا، چارەسەری ئاشتییانەی پرسی کەرکوک بەندە بە ململانێی درێژخایەنی نێوان یەکێتی و پارتی.

**پێنجەم**: لە کاتێکدا لە دوای کشانەوەی هێزەکانی عێراق لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستان لە کۆتایی ساڵی (١٩٩١)دا، کورد نیمچە سەربەخۆییەکیان وەدەست هێناوە، بەڵام هەمیشە ئەو دۆخە لە ژێر مەترسیدا بووە بە هۆی پشت بەستنی کورد لە رووی ئابووری و ژێرخانەوە بە عێراق و وڵاتانی دراوسێ.

بۆ نموونە، کورد (١٧٪)ی بودجەی عێراق وەردەگرن کە دەکاتە (٧٠٪)ی داهاتەکانیان ودیناری عێراقی وەکو دراو بە کار دێنن و بۆ دابین کردنی بەشی زۆری وزەی کارەبایان پشت بە وزەی کارەبای نیشتمانی دەبەستن.

هەتاکو ئەگەر کورد بە تەنها کۆنترۆڵی نەوتی کەرکوک بکەن، ئەوا پێویستە بەشێک لەو نەوتە رەوانەی پاڵاوگای بێجی بکەن لە ناوچە سوننی نشینەکان بۆ پاڵاوتن و بەشەکەی تریش لە رێگای خاکی تورکیاوە بگاتە بەندەری جیهان لە سەر دەریای سپیی ناوڕاست بە مەبەستی ناردنی بۆ بازاڕەکانی جیهان. رووداوەکانی ئەم دواییەش نیشانیان داوە کە مەسەلەی راگرتنی هەناردنی نەوت بۆ دەرەوە چەند ئاسانە لە رێگای تەقاندنەوەی بۆرییەکان و تانکەرەکانی نەوتەوە.

**شەشەم**: هەرێمە کوردییەکە بەوشکانی دەورە دراوە، هەر بۆیەش پشت بە نیاز پاکی دراوسێکانی دەبەستێت کە هیچ یەکێکیان لەم قۆناغەدا ئامادە نییە چاوپۆشی لە مەسەلەی کۆنترۆڵ کردنی کەرکوک لەلایەن کوردەوە بکات، جا چ جای سەربەخۆیی. ئەگەری ئەوەش لە ئارادا نییە کە ئەم دۆخە بگۆڕێت و هەموو ئەو دراوسێیانەش توانای ئەوەیان هەیە کە زیان بە بەرژەوەندییەکانی کورد بگەیەنن.

لە راستیدا بارودۆخی یەکلانەبووەوەی هەرێمی کوردستان و داواکاری کورد بۆ چەند ناوچەیەکی تر بوونەتە رێگر لە بەردەم وەبەرهێنانی گەورەی بیانی لە هەرێمەکەدا.

**حەفتەم:** جێبەجێ کردنی ماددەی (١٤٠) کە تایبەت نییە تەنها بە کەرکوک، بەڵکو باسی هەموو ناوچە ململانێ لەسەرەکان دەکات، ئەرکێکی ئاڵۆزە و پێویستی بە هاوکاری حکومەتی مەرکەزی دەکات، بەڵام ئەو حکومەتە هاوکارییەکەی لەم رووەوە راگرتووە هەر وەکو چۆن پێشتر نەیتوانی ماددەی ٥٨ لە یاسای کاتی بەڕێوەبردنی دەوڵەت پیاد بکات. بێجگە لەوەش، شێوازی داڕشتنی ماددەی (١٤٠) خۆی لە خۆیدا تەم مژاوییە دەربارەی پرسە چارەنووس سازەکان. بۆ نموونە، کێ مافی دەنگدانی لە ریفراندۆمەکەی کەرکوکدا هەیە و کێ بڕیار لەسەر ئەو ناوچانە دەدات کە ریفراندۆمەکە دەیانگرێتەوە؟.. لەوانەیە نیازێکی سیاسی لە ئارادا نەبێت بۆ داڕشتنی یاسای پێویست.

هەروەها، وەکو ئاماژەشی پێکرا، گەڕاندنەوەی سنوورەکانی پێش ساڵی ١٩٦٨ وەکو دەست کردنە بە شاری زەردەواڵەدا و چەندین لق و پۆی تری لێ دەبێتەوە لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان و لەوانەیە هەوڵەکانی چارەسەر کردنی کێشەی کەرکوک ئاڵۆزتر بکات. لە کۆتاییشدا، داواکاری بۆ ئەنجامدانی سەرژمێری و ریفراندۆم لە کەرکوک زیانی دیمۆگرافی لێ دەکەوێتەوە، چونکە لەوانەیە پارتە سیاسییەکان ئەندامانی خۆیان لە دەرەوەی کەرکوک بێنن بە مەبەستی سەرژمێری کردنیان وەکو ئەوەی کوردەکان ئەنجامیان داو عەرەبەکانیش هەڕەشەی ئەوەیان دەدا کە ئەوانیش کاری لەو جۆرە دەکەن. لەوانەشە ئەنجامدانی سەرژمێری لە کەرکوک ببێتە هۆی بایکۆت کردنی ریفراندۆمەکە، چونکە ئەو کاتە نەتەوەیەک، یان زیاتر بۆیان دەردەکەوێت کە لەو ریفراندۆمەدا دەدۆڕێن.

**کۆتایی:** ئەو کردەوانەی لە کەرکوک ئەنجام دراون لەوەتای کورد لە نیسانی (٢٠٠٣)وە هاتۆتە ناو شارەکەوە (هەرچەندە پارتە کوردییەکان ئەنجامیان نەداوە) لە بەرژەوەندی کورد نەبوو، چونکە بیرۆکەی پێکەوە ژیانی ئاشتییانەیان لە بار برد. لە ئەنجامی ئەو چاوپێکەوتنانەی لە سێ ساڵی رابردوودا ئەنجام دراوە، کەرکوکییەکان هەمیشە ئاماژەیان بەوە کردووە کە شانازی بە پێکەوە ژیانی نێوان نەتەوەکان دەکەن. زۆرێک لەوانەش سکالایانە بەدەست پارتەکانی دەرەوەوە کە تەنها بە ناوی نوێنەرایەتی نەتەوەکانیان دەکەن و هەروەها نارازین بە خیتابی دەمارگیری و کردەوەی ئیستفزازی کە هەڕەشە لە ئاشتی دەکەن. دەکرێ ئەمەش سەبارەت بە زۆرێک لە کوردەکانی کەرکوک بگوترێت کە ئەگەر ئەم حاڵەتە نەبێت پشتیوانی لە داواکاری پارتە کوردییەکانی دەکەن بۆ گەڕاندنەوەی کەرکەک بۆ سەر کوردستان. بۆ نموونە، هەندێک کەس باس لەوە دەکەن کە ئەگەر پارتە کوردییەکان

لەو کاتەوە کە هتنە ناو کەرکوک میانەڕۆتر بووایەن و زیاتر بە ئاراستەی پێکەوە ژیان کاریان بکردایە، ئەوا باشتر پێشوازییان لێ دەکراو لەوانەیە کۆنترۆڵی کەرکوکیان بکردایە. هەروەها رەخنەی ئەوەیان لەو پارتانە هەیە کە نەیانتوانیوە پرۆژەی بە سوود ئەنجام بدەن. ئەوەتا هاووڵاتییەکی کەرکوکی کە بەم دواییە بۆ سەردان گەڕاوەتەوە بۆ شارەکە دەڵێت: ئێستا کەرکوک هیچ نییە و پارتە کوردییەکان هیچ ناکەن بۆ پێشخستنی و، هەروەها حکومەتی ناوەندیش بە دابین کردنی بودجە یارمەتی شارەکە نادات.
ئەمڕۆ دەرفەتەکە لە دەست چووەو هەڵمەت و داواکاری کورد بە شێوەیەکی گشتی بە ئاراستەی ئەوەیە کە کەرکوک موڵکی ئەوانە نەک بە ئاراستەی هەوڵدان بۆ رازی کردنی عەرەب و تورکمان بەوەی کە لە سایەی حوکمی کورددا بە ئاسوودەیی دەژین. بۆ نموونە دەتوانن ئەو هەوڵانە لە چوارچێوەی پرۆژە خزمەتگوزارییەکانەوە بدەن کە هەموو نەتەوەکانی ناو کەرکوک بگرێتەوەو هەروەها لە بواری دامەزراندن لە پۆستە خزمەتگوزارییە مەدەنییەکاندا دادپەروەرانە بن لە نێوان پێکهاتەکانی شارەکەدا.
لە ئەنجامیشدا، عەرەب و تورکمانی کەرکوک بە روونی رایانگەیاند کە لکاندنی کەرکوک بە هەرێمی کوردستانەوە هێڵی سوورەو هەندێکیان هەڕەشەی بە کارهێنانی توندوتیژییان کرد ئەگەر ئەو کارە روو بدات. هەرچەندە هێزی سەربازی ئەوتۆیان نییە کە رووبەرووی هێزی زەبەلاحی کورد ببێتەوە، بەڵام توانای ئەوەیان هەیە (بە پشتیوانی دەرەوە) کە باڵادەستی کورد لە کەرکوک تێک بدەن و ژیانی کورد لە شارەکەدا ئاڵۆز بکەن. ئەمەش گرفتێکی تر دەخاتە رێگای کوردە دەرکراوەکان لە گەڕانەوەیان بۆ شارەکە. بێجگە لەوانەش، لەوانەیە کوردی بەغدا بە دەست هەڵسوکەوتی پارتە کوردییەکانەوە لە کەرکوک و ئەو ناوچانەی تر کە داوای دەکەن بناڵێنن.
هەڕەشەکان ئەوە بوون کە لەوانەیە بەرامبەر دەرکردنی هەر خێزانێکی عەرەب لە کەرکوک، خێزانێکی کورد لە بەغدا دەربکرێت. لەوانەیە ئەم فاکتەرانە بە سەر یەکەوە کە باس لە کۆنترۆڵ کردنی کەرکوک لەلایەن کوردەوە دەکەن جا چ بە شێوەی یاسایی بێت یان بە هێز، ئەو شێوازە دابین نەکەن کە کورد پێشبینی دەکات.

**(ب) تورکمان**

تورکمان زۆرینەیان پێک دەهێنا لە ناو شاری کەرکوک (هەتاکو نیسانی ٢٠٠٣)، بەڵام لە پارێزگای کەرکوکدا کەمینەیەکی گەورەن و بە ناڕەزاییەوە سەیری گەڕانەوەی دەیان هەزار کوردیان بۆ ناو شاری کەرکوک دەکرد. هەرچەندە زۆرێکیان بە مەبەستی دەنگدان لە هەڵبژاردنەکەی کانوونی دووەم و کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥ و ریفراندۆمەکەی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٥ دەهاتن. بە بۆچوونی ئەوان، بوونی کورد لەوێ ناسنامەی تورکمانی شارەکە لاواز دەکات و ئەم پێشهاتەش بە ترسناک لە قەڵەم دەدەن بەتایبەتی کە ژمارەیان لە سەرانسەری عێراقدا کەمە.

لە بەر ئەمەش، تورکمانەکان چاویان بڕیبە یارمەتی دەرەکی بۆ پشتیوانی کردن لە دۆزەکەیان. ئەم پشتیوانیەشیان لە دوو سەرچاوەی جیاوازدا بینییەوە: تورکمانە ناسیۆنالیستەکان کە پەیوەندی توندو تۆڵیان لەگەڵ تورکیادا بەستووە. ئەو ڕێکخراوەش کە تەعبیر لەم پەیوەندییە دەکات، بریتییە لە بەرەی تورکمانی کە بریتییە لە هاوپەیمانییەکی ڕەهای نێوان پارتە تورکمانییەکان لەلایەن هێزە ئەمنییەکانی تورکیاوە لە نەوەتەکاندا دامەزراوەو پشتیوانی دەکرێت.

ئەم بەرەیە سێ کورسی لە ئەنجومەنی نیشتمانی کاتیدا وەدەست هێنا کە لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکەی کانوونی دووەمی ٢٠٠٥ هاتە کایەوە، بەڵام لەوەی کانوونی دووەمی (٢٠٠٥)دا تەنها یەک کورسی بە دەست هێنا. زۆربەی ئەندامەکانی بەرە سوننی مەزهەبن، بەڵام شیعەی علمانیش بە خۆوە دەگرێت. لەبەر ئەوەی زۆرێک لەو تورکمانانە لە پۆستە باڵاکانی ئاسایشی ڕژێمی پێشوودا کاریان کردووە، هەمیشە باس لە پەیوەندی ئەوانە لەگەڵ تیرۆریستەکاندا دەکرێت.

بە پێچەوانەشەوە، شیعە ئیسلامییەکان کە دژی ڕژێمی پێشوو بوون و لە ئەنجامی ئەوەشدا زۆریان چێشت، سەرنجیان، یان بەرەو لای یەکگرتووی ئیسلامی تورکمان، یان پارتە شیعییەکانی عێراق ڕاکێشراوە وەک پارتی دەعوە و ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لەعێراق. ئەوە بوو یەکگرتووی ئیسلامی تورکمان چووە پاڵ پارتی دەعوە و پارتە شیعییەکانی تر بە مەبەستی پێکهێنانی (هاوپەیمانی عێراقی یەکگرتوو) لە کۆتایی ساڵی (٢٠٠٤)دا. ئەو هاوپەیمانییەش (٤) کورسی لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بەخشی بە تورکمانەکان لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکەی کانوونی یەکەمی ٢٠٠٥ و ئەوانیش لە بەرامبەردا هێزی هەڵبژاردنی هاوپەیمانیەکەیان بە کار هێنا (کە دەگوترا ئێران پشتیوانی لێ دەکات) بۆ بەرگری کردن لە بەرژەوەندی تورکمان لە عێراق بە گشتی و بە تایبەتیش لە کەرکوک. لە مانگی نیسانی (٢٠٠٤)یشدا، ڕاپۆرتەکان باسیان لەوە دەکرد

کە ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە عێراق بوونی میلیشیای بەدری لە کەرکوک پتەوتر کردووە.
بەڵام چەند فاکتەرێک هەن کە توانای تورکمانەکان لە بەرەنگاری کردنی هێرشی ئاشکرای کورد ئاڵۆز دەکەن وەکو:
یەکەم: جیاوازی مەزهەبی نێوان شیعەو سوننەو زیادبوونی ژمارەی پارتە تورکمانەکان هەڵوێستی تورکمانەکانی لاواز کردووە. پارتە کوردییەکانیش هەر لە سەرەتاوە ژمارەیەک لە ئەندامە تورکمانەکانیان لە شاری کەرکوک بردۆتە ریزی خۆیانەوە وخستویانەتە سەر هاوپەیمانییەتەکەی خۆیان کە پێی دەڵێن (لیستی برایەتی کەرکوک). ئەگەر لە چوارچێوەی پەل هاویشتنی ئاشتییانەیاندا لە کەرکوک بایەخ بە پرسەکانی تورکمان بدەن و قازانجی بەرچاو بە هەموو دانیشتووان بگەیەنن، ئەوا دەتوانن چەند پارچەیەکی گرنگ لە لاشەی تورکمان بۆ ریزی خۆیان رازی بکەن.
لەولاشەوە، هەوڵەکانی تورکمان بۆ دووبارە یەکگرتنەوەو یان دروست کردنی پارتێک کە ببێتە خێر بۆ هەموو تورکمانەکان، تا ئێستا بە بێ بەرهەم ماوەتەوە.

دووەم: تورکمانەکان پەشیمانن لەوەی کە وەکو وەفادارییەک بۆ هاوپەیمانی یەکگرتووی تورکمان، بە دەستووری تازە رازی بوون، ئەو دەستوورەی بە شێوەیەک باس لە پرسی کەرکوک دەکات کە ئەوانی نیگەران کردووەو ئەوان رەتی دەکەنەوە. ئەگەر نیازی یاری کردنیان بە دەستووریش هەبێت، ئەوا پێویستە پشت بە توانای هاوپەیمانی یەکگرتووی کوردستان ببەستن لە هەوڵەکانیدا بۆ ئاڵۆز کردن و یان دواخستنی مەسەلەی جێبەجێ کردنی ماددەی (١٤٠).
سێیەم: هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠٠٥) سەلماندیان کە ژمارەی تورکمان لە عێراقدا لە یەک ملیۆن تێپەڕ ناکات، ئەمەش زۆر کەمترە لەو دوو، یان سێ میلۆنەی کە خۆیان بۆ خۆیان ئیدیعایان دەکرد. لە کاتێکدا تورکمانەکان دەست بە جێ تۆمەتی ساختەکردنیان دایە پاڵ هەڵبژاردنەکان، حکومەتی تورکیا تێبینی راستییەکانی کرد و چاوی بە هەڵوێستی خۆیدا خشاندەوە بەرامبەر دۆستەکانی لەعێراق بە بێ ئەوەی واز لە بەرەی تورکمانی بهێنێت، بەڵکو لە جێگای ئەوە هەوڵەکانی خۆی چڕتر کردەوە بۆ کاریگەریی خستنە سەر پێشکەوتنەکانی کوردستان لە رێگای گەیشتن بە هاوکاری ئابووری و پەیوەندی گەرم لەگەڵ سەرکردەکانی کورددا. هەر بۆیە کورد خۆیان بە سەرکەوتوو دادەنێن.

لەم رووەوە قوباد تالەبانی دەڵێت: ((هەڵبژاردنەکان بە روونی دەریانخست کە تورکمان زۆرینە نین لە کەرکوکدا. لە راستیدا، ئەوان تەنها ئەوەندەی ژمارەی کوردیش نین، ئەم راستییەش کەمەر شکێن بوو بۆ تورکیا)).
چوارەم: لە کۆتاییشدا تورکمانەکان کەمینەیەکی تا رادەیەک بچووکن کە هیچ پشتیوانێکی عێراقی، یان ناوچەیی ئامادە نییە لە پێناویاندا بچێت بۆ شەڕکردن. بۆ نموونە، ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە عێراق بایەخێکی کەمتری لە پارتە شیعییەکانی تر نیشان داوە بۆ پاراستنی دۆخی کەرکوک وەکو خۆی، بەهۆی ئامانجەکانی لە دروست کردنی هەرێمێکی بەهێزی شیعە لە باشووری عێراق کە کۆنترۆڵی بەشێکی زۆر لە نەوتی عێراق دەکات. لەوانەیە ئەنجومەنی ناوبراو نیازی فرۆشتنی کەرکوکی هەبێت (کە بیرە نەوتەکانی لەوانەی باشوور بچووکترە) لە بەرامبەر بەشداری کردنی کورد لە دابەشبوونی دیفاکتۆی عێراق. پارتە شیعییەکانی تریش کە ئەندامی تورکمانیان تێدایە، لەوانەیە زیاد لە پێویست لە ناو خۆدا ناکۆک بن و لە رووی سەربازییەوە زۆر لاواز بن و، یان نیازیان نەبێت کە هاوپەیمانێتی شیعە تێکبدەن لە رێگای شەڕ کردن لە پێناو تورکمانی کەرکوکدا.

## (ج) عەرەب

گەورەترین سەرچاوەی هێزی عەرەبی کەرکوک لەو راستیەدایە کە بەشێکن لە نەتەوەی عەرەب لە عێراق و لە دەرەوەی عێراقیش، هەر بۆیە خاوەنی گرنگیان هەیە. هەتاکو ئەو عەرەبانەی ددان بە مافی کورددا دەنێن و بە کوردستانێکی سەربەخۆ رازی نین کە کەرکوکیش بگرێتەوە. پرسی کەرکوک نەبووەتە پرسێک بۆ عەرەبی دەرەوەی عێراق، بەڵام گفتوگۆی نێوخۆیی عەرەب لەم بارەیەوە تێبینی دەکرێت.
بۆ نموونە، دەگوترێ کە تیرۆریستەکانی کەرکوک پەیوەندییان لەگەڵ سوریادا هەیە. ئەمەش تەفەهوم دەکرێ بە حوکمی بایەخدانی سوریا بە سەرکوت کردنی ئاواتەکانی کورد لە عێراق نەوەک ئەو کارە ببێتە نموونەیەک بۆ کوردەکانی سوریا.
مەقتەدا سەدری سەرکردەی تەیاری سەدری بووەتە پاڵەوانی پرسی عەرەبە تازە هاتووەکان و دووپاتی دەکاتەوە کە مافی مانەوەیان لە کەرکوکدا هەیەو هەروەها هەوڵ بۆ رێکخستنیان دەدات. ژمارەیەکی زۆر لەو عەرەبانە کەرکوکیان بە جێ هێشتووە، بەڵام هێشتا ناسنامەی کەرکوکیان هەیە و بەمەش لە رووی تیۆرییەوە دەتوانن دەنگ بدەن. هەروەها راپۆرتەکان باسیان لەوە کرد کە لە مانگی نیسانی (٢٠٠٦)دا چەکدارەکانی

سەدر هاتوونەتە کەرکوک بۆ ئەوەی بینە پاڵپشت بۆ عەرەبەکان و لە هەمان کاتدا پەیامێک ئاراستەی کورد بکەن کە نابێ پێشبینی بکەن کە کەرکوک دەبێتە شاری کوردستانی. هەرچەندە بەڵگەش لە ئارادا نییە سەبارەت بە گەیشتنی ژمارەیەکی زۆر لەو چەکدارانە، بەڵام پەیام و هەڕەشەکە روونە:
ئەگەر کورد لە کەرکوک جموجۆڵ بکەن، عەرەب رەت دەداتەوە.
ئەمەش هۆکارێکی ترە کە کورد دژایەتی هەڵبژاردنەوەی جەعفەرییان کرد بۆ پۆستی سەرۆک وەزیران، چونکە ئەو سوپاسی دەنگی تەیاری سەدری کرد، هەر چەندە جەعفەری ناچار کرا بە پاشەکشە کردن، بەڵام نوری مالیکی بە هەمان شێوە پاڵپشتی لە سەدرییەکان دەکات. ئەمەش مانای وایە کە کورد تووشی بەربەرەکانێ دەبن نەک تەنها سەبارەت بە سەرکردایەتی عێراق بۆ ماوەی چوار ساڵی تر کە دوودڵە لە پشتیوانی کردن لە پرۆسەی ئاسایی کردنەوە لە کەرکوک، بەڵکو سەبارەت بە بەربەرەکانێیەکی چالاک و رێکخراو بۆ هەوڵەکانیان لە پێناو جێبەجێ کردنی پرۆسەکە لە رێگای رازی کردنی عەرەبی تازە هاتوو بە گەڕانەوە.
زیاد لەوەش، لەوەتای پارتە کوردییەکان وپێشمەرگە گەیشتوونەتە کەرکوک لە نیسانی ۲۰۰۳ ، سەرکردەکانی حکومەت لە عەرەب وتورکمان ستراتیجیەتێکی رەهای یەکگرتنیان پەیرەو کردووە بە مەبەستی بەربەرکانێ کردنی پێشکەوتنەکانی کورد لە شارەکەدا. ئەمەش بە روونی هەستی پێ دەکرێت لە ئەنجومەنی پاریزگای کەرکوکدا کە تێیدا (۱٥) نوێنەرەکەیان لە کۆی (٤۱) نوێنەر بوونەتە رێگر لە بەردەم بەرێوەچوونی کاروباری کارگێڕی چالاک، ئەم بەرەی عەرەب و تورکمانە چەندین ناکۆکی نێوخۆیی هەیە، بەڵام بەربەرەکانێی پاڵەپەستۆی زۆر بووەتەوە کە لە ئەنجامی تەشەنە کردنی ململانێی مەزهەبی لە شوێنەکانی تری عێراق هاتووەتە ئاراوە. لەم بارەیەوە یەکێک لە سەرکردەکانیان (موزەفەر ئەرسەلان)، تورکمانەکان رۆڵی کاریگەر دەبینن، لەم بارەیەوە ئەرسەلان دەڵێت:
((ئەگەر تورکمان بڕیار بدەن کە لەگەڵ عەرەبدا بن، ئەوا عێراقێکی یەکگرتوو دروست دەبێت. بەڵام ئەگەر لەگەڵ کورددا بن، ئەوا جیابوونەوە روو دەدات)).
سەرەڕای زۆرینەی عەرەب لەسەرانسەری عێراق و هاوپەیمانی کردنیان لەگەڵ تورکمان، هەڵوێستی عەرەب لە کەرکوک بە هێز نییە لەبەر چەندین هۆ:
یەکەم: عەرەبی کەرکوک بە زۆری لە هەڵبژاردنەکانی کانوونی دووەمی (۲۰۰٥)دا خۆیان بە دوور گرت، بۆیە لە ئەنجامدا سونییەکان نەیانتوانی زیاتر لە (٦) کورسی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک وەدەست بێنن لە کاتێکدا شیعییەکانیان هیچ

کورسییەکیان پێ نەبرا. ئەمەش بە شێوەیەکی بەرفراوان توانای ئەوانی لە ئاراستەکردنی سیاسەت و بەربەرەکانێ کردنی هەنگاوەکانی کورد وەکو دامەزراندنی خەڵک لە پۆستی خزمەتگوزارییە گشتییەکاندا لاواز کرد.

دووەم: ململانێی نێوخۆییان کاریگەرە: ئەوەتا کەرکوکییە رەسەنەکان بە زۆری سوننین لە کاتێکدا تازە هاتووەکان بە زۆری شیعەن. بۆیە زۆرێک لە عەرەبە رەسەنەکانی کەرکوک خۆشحاڵ دەبن ئەگەر تازە هاتووەکان شارەکە بە جێ بێڵن، ئەگەر هەنگاوەکانی کورد لە ساڵی (٢٠٠٣)وە نەبووایەتە هۆی ئەوەی بیر لە راست کردنی بەرەی یەکگرتوو لە دژی کورد بکەنەوە.

سێیەم: عەرەبە رەسەنەکان لە دەرەوەی سنووری شارەکە بە هێزن بە تایبەتیش لە ناوچەکانی رۆژئاوای کەرکوک لە ناوچەی حەویجە. لەوانەیە کوردیش بە مەبەستی خۆ رزگارکردن لە کێشەی عەرەب، بە رێککەوتنێک رازی بن کە تێیدا حەویجە و ناوچەکانی تر کە زۆرینەی دانیشتووانەکانیان عەرەبن لە کەرکوک داببڕێن و بخرێنە سەر پارێزگاکانی موسڵ، یان سەلاحەدین. لەم بارەیەوە نەوشیروان مەستەفا ئەمین دەڵێت:

((لەوانەیە عەرەبەکان گرفتیان هەبێت لە بەربەرەکانێ کردنی ئەم جموجوڵە تاک لایەنەی کورد))

چوارەم: پابەند بوونی عەرەبی تازە هاتوو بە مانەوە لە کەرکوک لاوازە. لەوانەیە زۆربەیان بە قەرەبوو کردنەوە رازی بن ئەگەر حکومەتی ناوەند بودجەی پێویست بۆ ئەم کارە دابین بکات، لە جیاتی ئەوەی لە شارێکدا بمێننەوە کە رۆژ بە رۆژ زیاتر لەلایەن کوردەوە کۆنترۆڵ دەکرێت کە دژی مانەوەی ئەوانە لە شارەکەدا، ئەڵبەتە لەگەڵ رۆیشتنی ئەو عەرەبانەشدا، پرۆسەی هەڵگەڕاندنەوەی تەعریب وزەیەکی تری وەبەردا دێت و ئەرکی ئەو کەسانە زۆر دژوار دەکات کە نیازی مانەوەیان هەیە.

پێنجەم: سەرەڕای هەست کردن بە ئەرکی هاوبەش نێوان عەرەب و تورکمان لە رووبەڕووبوونەوەی کورددا، بەڵام عەرەب و تورکمان نەیانتوانی لەسەر ئەوە رێککەون کە کێ ئەو پۆستە باڵایە پڕ بکاتەوە کە لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٥دا کورد بۆ ئەوانی پێشنیار کردبوو، واتا پۆستی جێگری پارێزگار کە بە شێوەی کاتی لەلایەن کوردێکەوە پڕ کراوەتەوە، لەم بارەیەوە ریاز ساری کەهیەی سەرکردەی تورکمانی دەڵێت:

(( گەورەترین گرفت ئەوەیە کە تورکمان و عەرەب و کورد متمانەیان بە یەکتر نییە، ئێمە پەیوەندی باشمان لەگەڵ عەرەبدا هەیە، بەڵام بە بڕوای ئێمە پەیوەندییەکی کاتییەو ناکرێ پشتی پێ ببەسترێت. هەتاکو تورکمان و عەرەبیش متمانەیان بە یەکتر نییە )).
ئەگەر کورد کار لە پێشخستنی بەرژەوەندییەکان لە ڕێگای سیاسەتەوە بکەن نەک بە هێز، ئەوا دەتوانن زیاتر سوود لە جیاوازی و ناکۆکی نێوان عەرەب و تورکمان وەربگرن.

## (د) مەسیحییەکان

ئاشووری و کلدانی و سریانی و کەمینە مەسیحییەکانی تر لە کەرکوک ئەوەندە کەمن لە ژمارەدا، کە دەتوانن تەنها کاریگەرییەکی سیاسی لاوەکی دروست بکەن بە حوکمی ژمارەی دیمۆگرافی و هێزی سیاسییانەوە. تاکە پارتی بەرچاوی مەسیحییەکانیش کە بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشوورییە، نەیتوانی هیچ کورسییەک لە ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک وەدەست بێنێت لە ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠٥. (لە سەرانسەری عێراقیش تەنها یەک کورسی وەدەست هێنا). تاکە مەسیحیش کە لە ئەنجومەنی پارێزگاکەدا بێت، لەسەر لیستی کوردییە.
ئەو هەرایەی کە کلدانی و ئاشوورییەکانی هەندەران ئەنجامی دەدەن (بۆ نموونە لە ئەمریکا) لە بەرژەوەندی هاونەتەوەکانیان لە عێراقدا، لەلایەن مەسیحییەکانی ناوەوە بە نیگەرانییەوە وەردەگیرێن، چونکە ئەو مەسیحییانە حەز ناکەن زیاد لە پێویست سەرنج بۆ لای خۆیان رابکێشن. زۆرێک لە مەسیحییەکان کە ڕووبەڕووی ڕفاندن دەبنەوە لە پێناو وەرگرتنی پارە لە ئازاد کردنیان یان کوشتن بە هۆی هاوکاری کردنیان لەگەڵ ئەمریکییەکاندا، لە بەغداو موسڵ و کەرکوک هەڵهاتوون یان بۆ دەرەوە و یان بۆ هەرێمی کوردستان.
مەسیحییەکان وەکو کەمینە لە دۆخێکی وادا نین کە بەربەرەکانێی کورد بکەن، هاوکات ناتوانن ببنە هاوپەیمانی نەیارەکانی کورد لە ترسی ئەوەی دواتر تۆڵەیان لێ بکرێتەوە، لە ڕاستیدا بایەخی مێژوویی ئەوان بریتی بووە لە هاوپەیمانی کردن، یان ڕێککەوتن لەگەڵ هەر هێزێکدا کە بتوانێ سەقامگیری و مافە بنەڕەتییەکانیان بۆ مسۆگەر بکات. سەبارەت بە کەرکوکیش باشترین هاوپەیمان بۆ ئەم مەبەستە بریتییە لە حکومەتی هەرێمی کوردستان.

**(٥) فاکتەرە هەرێمی و نێودەوڵەتییەکان**

گەلی کورد کە بوونە قوربانی بونیاتنانی دەوڵەتان و دیاری کردنی سنوورەکان لە دوای رووخانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەلایەن هەردوو وڵاتی بەریتانیاو فەرنساوە، شەڕیان لە پێناو ئازادی زیاتردا کردووە ئەگەر نەڵێین سەربەخۆییش، لەو چوار دەوڵەتە سەرەکییەی کە خۆیانی تێدا وەکو کەمینە دەبینن، واتا تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا. لەم پێناوەشدا مامەڵەی تاکتیکییان لەگەڵ ئەو حکومەتە مەرکەزییانەدا کردووە کە لە سایەی کۆنترۆڵی چەوسێنەری ئەواندا کاریان کردووە، واتا حکومەتە دراوسێکان و بزووتنەوە کوردییەکان لە وڵاتانی نزیک ئەو حکومەتانەدا. ئەڵبەتە سنوورە دروست کراوەکان فاکتەری سەرەکی بوون لە رێگای پوچەڵ کردنەوەی ئومێدەکانی کورد.

ئەڵبەتە چەندین خاڵی ناکۆکی لە نێوان ئەو دەوڵەتانەدا هەیە، بەڵام لەیەک خاڵدا یەک دەگرنەوە، ئەویش بریتییە لە پێویستی رێگا گرتن لە کورد. هەرچەندە ئەم خاڵە سیاسەتی ناوخۆیی جیاوازی لێ کەوتۆتەوە، بەڵام هەموو ئەو وڵاتانە بە چاوی نیگەرانی و گومانەوە دەڕوانن دەرکەوتنی بزووتنەوەیەکی نێونەتەوەیی کوردی کە ئومێدەکانی سنووری ئەو وڵاتانە ببەزێنێت، چونکە لەوانەیە سەرکەوتنی ئەو بزووتنەوەیە لە یەکێک لە وڵاتەکاندا کوردی بەشەکانی تریش ببزوێنێت. مەترسی زۆریشیان لەو ناوچە ئارامە بوو کە لە ساڵی ١٩٩١ لە باکوری عێراق دروست کرا و دەرفەتی بۆ کورد خوڵقاند تا سەربەخۆیی لە حکومەتی عێراق وەدەست بێنن. هەروەها مەترسی دراوسێکان لە دوای رووخانی رژێمی سەدام لە ساڵی ٢٠٠٣ زیادی کرد، چونکە ئەو گۆڕانکارییە دەسەڵاتێکی بێ وێنەی بەخشی بە کورد هەم لە ناو هەرێمەکەی خۆیان و هەم لە پایتەختی عێراقیش.

لە ساڵی ١٩٩١، وەڵامدانەوەی راستەوخۆی ئەو وڵاتانە بریتی بوو لە باس کردن لە ستراتیجیەتی پێویست بۆ ئیحتیوا کردن، یان سەرکوت کردنی ئەزموونی کورد لە عێراقدا. لەم کارەشدا هاوپەیمانێکی لۆجیکیان لە حکومەتی ئەمریکادا دۆزییەوە کە کوردی وەکو داردەستێک لە دژی رژێمی بەغدا بەکار هێنا و حەزی دەکرد کورد لە بڕیار وەرگرتندا سەربەخۆ بن، بەڵام لەلایەنەکانی تردا بە لاوازیی بمێننەوەو بە تەواوی پشت بە خەڵکی تر ببەستن بۆ دابین کردنی پێداویستییەکانیان. لە نەوەتەکاندا هەڵمەتێکی پشتیوانی کردن لە کوردستانی عێراق و یارمەتیدانی پرۆسەی ئاوەدان کردنەوە بەڕێوەچوو، بەڵام هیچ هەنگاوێک هەڵنەهێنرایەوە کە هانی سەربەخۆیی کورد بدات. بە پێچەوانەوە، ئامانجی کورد هەمیشە بریتی بوو لە گونجاندنی ئۆتۆنۆمییە سیاسییە گەشەسەندووەکەیان لەگەڵ خود کەفایی ئابوورییان کە ئەویش روو لە گەشە کردنە. خاڵی سەرەکیش لەم ستراتیجیەتەدا بریتییە لە سوود وەرگرتن و پێشخستنی سەرچاوەکانی وزە. لە

نەوەتەکانیشدا ئیعتمادی تایبەتی کورد لەسەر تورکیا کە کۆنترۆڵی ڕێگای دابین کردنی شتومەکی کردبوو و بە تاکە خاڵی سنووری نێوان عێراق و تورکیادا تێپەڕ دەبوو لە خاپوور، هەوڵەکانیانی لاواز دەکرد. بەڵام شەڕی ساڵی ۲۰۰۳ دەرفەتی تازەی خوڵقاند نەک تەنها لە ڕاکێشانی سەرنجی سەرمایەدارانی لە بوارەکانی دۆزینەوەی نەوت و غاز، بەڵکو لەوەش گرنگتر، لە کۆنترۆڵ کردنی کێڵگە نەوتییەکانی کەرکوکدا.

**(أ) تورکیا**

کورد هەرچۆنێک قسە بکەن، بەلای وڵاتانی دراوسێوە هەر دەستیان لە داواکاری تایبەت بە سەربەخۆ بوون هەڵنەگرتووە. ئەو وڵاتانە وای بۆ دەچن کە کۆنترۆڵ کردنی کەرکوک لەلایەن کوردەوە قۆناغی یەکەمیانە بە ئاراستەی ئەو ئامانجە گەورەیە. بۆیە مەبەستی یەکەمی ئەو دەوڵەتانە بریتی بووە لە ڕێگا گرتن لە بەفەرمی بوونی ئەو دیفاکتۆیەی کە کورد لە کەرکوک دروستیان کردووە، بەڵام هەر وڵاتێک بە شێوازی خۆی هەنگاوی بەرەو ئەو مەبەستە ناوە.

ئێران و سوریا بەوە ڕازی بوون کە تورکیا بە ئەرکە زەحمەتەکە هەڵسێت. وڵاتی سوریا کە ڕووبەڕووی پاڵەپەستۆ و گۆشەگیر کردنێکی توند بووەوە لەلایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە بە تایبەتیش دوای کوژرانی ڕەفیق حەریری سەرۆک وەزیرانی پێشووتری لوبنان، نەیتوانیوە بە تەواوی کاریگەری لەسەر گۆڕانکارییەکان دروست بکات، یەکەمین سەرچاوەی هێزی ئەو وڵاتەش لە عێراقدا بریتییە لە تیرۆریستەکانی ناو کەرکوک کە دەتوانن ئاگری شەڕ لەوێدا خۆش بکەن.

ستراتیجیەتی ئێرانیش هەتاکو بەر لە ساڵی (۲۰۰۳)ش بریتی بوو لە هێشتنەوەی سەرکردەکانی کورد لە خانەی بەرگری کردندا، ئەویش لە ڕێگای پشتیوانی کردن لە چەند گروپێکی ئیسلامی و هەروەها چاندنی جاسوسەکانی خۆی لە هەرێمەکەدا. ئەوەتا باڵی ئەمنی پاسداران باکووری عێراقی داپۆشیوە، چونکە قەرارگای ڕەمەزان نووسینگەیەکی لەسلێمانی هەیە وەکو چۆن دەزگای ئیتلاعاتی ئێران بە هەمان شێوە نووسینگەیان هەیە.

لەولاشەوە سیخوڕەکانی ئێران بەوە تاوانبار دەکران کە پشتیوانی دارایی و، یان ئاسانکاری بۆ هێرش کردنە سەر سەرکردەکانی کورد دابین دەکەن.

بێجگە لەوانەش، ئێستا حکومەتێک لە بەغدادا حوکم دەکات کە شیعە ڕابەرایەتی دەکات و ئێرانیش ئومێدەوارە کە ئەو حکومەتە ئامانجەکانی کورد سەرکوت بکات یان ڕێگایان لێ بگرێت.

بەمەش تورکیا بووەتە بەرچاوترین یاریزان لە گۆڕەپانی کەرکوکدا.

هەرچەندە ئەنکەرە داوای خاکی عێراق ناکات، بەڵام هەرێمی کوردستان وەکو بەشێک لە ویلایەتی موسڵ، بەشێکی گرنگ بووە لەئیپراتۆریەتی عوسمانی، بۆیە تورکمانەکانی ئەو هەرێمە بە هاورەگەزی تورکەکان لە قەڵەم دەدرێن کە پێویستە بپارێزرێن. لە ساڵانی نەوەتەکاندا، حکومەتی تورکیا رووبەرووی رەخنەیەکی ئەوتۆی نێودەوڵەتی نەبووەوە بەهۆی هەوڵەکانی بۆ ئیحتوا کردنی ناسیۆنالیسزی کوردی لە عێراق لە رێگای خاڵی سنووری خاپوورەوە. بەڵام رووخانی رژێمی پێشوو هاوکێشەکەی بە شێوەیەکی دراماتیکی گۆری، تاکە سیناریۆش کە لە دروست بوونی کیانێکی بە هێزی کوردی بەلای تورکیاوە نەویستراوە، بریتییە لە ناسەقامگیریی لە عێراقدا، چونکە ئەو وڵاتە پاڵپشتێکی گرنگە بۆ ئێران و لەبەر یەک هەڵوەشانەوەش دەبێتە مایەی دەست تێوەردانی دراوسێکانی، لەوانەشە لە ئەنجامدا ناوچەیەک دروست ببیت، کە بۆ چەندین دەیەی داهاتوو بە نائارامی بمێنێتەوە.

لەم رووەوە بەرپرسێکی تورکی دەڵێت:
((پێویستە عێراق بە یەکگرتوویی بمێنێتەوە، چونکە ئەگەر ئەو وڵاتە هەڵبوەشێتەوە، هەموو سنوورەکانی ناوچەکە دادەرێژرێنەوە بە حوکمی ئەوەی هەموو ئەو سنوورانە دەستکردن. سنوورەکان وەکو دیوارن کە تێیدا ئەگەر خشتێک هەڵگریت، هەموو دیوارەکە دادەرمێت. لە حاڵەتی روودانی ئەم سیناریۆیەدا کوردستانێکی عێراقی بەهێز، دەبێتە لەمپەرێکی بەسوود لە نێوان تورکیاو بشێوییەکی گشتگیر لە عێراقدا)).
بەرپرسێکی تریش گوتی: ((با کیانێکی کوردی دروست ببێت، چونکە ئەمە پرسێکی لاوەکییە بە بەراورد لەگەڵ (کارەساتی) ناوچەکە، واتا دابەشبوونی عێراق)).
بە مەبەستی رێگا گرتن لە ناسەقامگیری لەسەر سنوورەکانی باشووری رۆژهەڵاتی وڵات کە پێشبینی دەرەنجامەکانی ناکرێت و تورکیا دەستی داوەتە لاواندنەوەی سەرکردایەتی کوردو بە شێوەیەکی کاریگەریش برەوی بە وەبەرهێنانی تورکی لە کوردستان و بازرگانی لەگەڵ هەرێمەکەدا داوە. هەرچەندە ئاماری ورد دەست ناکەویت، بەڵام بە پێی هەواڵەکان بری بازرگانی ساڵانە دەگاتە (٢) تا (٣) بلیۆن دۆلار. هەردوو فرۆکەخانەکانی هەولێر و سلێمانیش کە بوونەتە هۆکار بۆ ئەوەی کورد کەمتر پشت بە تورکیا ببەستێت، لە لایەن کۆمپانیاکانی تورکیاوە دروست کراون. ئێستاش تورکیا کار لەسەر کردنەوەی دووەمین خاڵی پەرینەوە دەکات و پلانیش بۆ راکێشانی بۆری نەوت و غاز بە شێوەی راستەوخۆ لە کوردستانەوە بۆ تورکیا لە ئارادایە تا بەسەر هەڵمەتەکانی عەرەبی سوننەدا زاڵ ببێت. هەتاکو باس لە کۆمپانیایەکی تازەی حکومەتی تورکیا هەیە گوایە سەرپەرشتی

پیشەسازی نەوتی کورد دەکات هەر لە دەرهێنانەوە هەتاکو دەگاتە هەناردن بۆ بازاڕەکانی جیهان.
بەم پێیەش، ئەگەر تورکیا پێویستی بە لەمپەرێکی بە هێزی کوردی هەیە دژ بە دارمانی عێراق، ئەوا دەبێ وەکو مامانێک ئەرکی لە دایک بوونی ئەو لەمپەرە ئاسان بکات و باشر وایە رێنماییەشی بکات. لەوانەیە ئەم هەنگاوەش ببێتە یاریدەدەر بۆ چارەسەر کردنی کێشەی پڕ لە دەردەسەری پەکەکە لە تورکیادا کە کوردستانی عێراقیان وەکو بنکەی پشتەوە بە کار هێناوە بە مەبەستی ئەنجامدانی ئۆپەراسیۆن لە هەرێمە کوردنشینەکانی تورکیادا.
بەڵام سەرەڕای ئەوەش تورکیا کیانێکی کوردی ناوێت ک کۆنترۆڵی تاک لایەنەی سەرچاوەکانی نەوتی کەرکوک بکات. لەبەر ئەوەی تا ئێستا ئومێدەکانی تورکیا بۆ چوونە ریزی یەکێتی ئەوروپا بە ئامانج نەگەیشتوون (لەوانەیە بۆ چەند ساڵێکی تریش بە ئامانج نەگەن)، تورکیا لەوە دەترسێت کە کوردەکانی ئەو وڵاتە ئیلهام و پشتیوانی لە براکانیان لەوبەری سنوور وەربگرن لە جێگای ئەو سوودانەی کە لە یەکێتی ئەوروپا پێشبینی دەکرێن. هەروەها تورکیا متمانەی یە سەرکردایەتی کورد نییە لە هەموویانیش خەراپتر، مسعود بارزانی کە بۆچوونەکانی دەربارەی کەرکوک بەلای تورکەکانەوە جێگای سازش لەسەر کردن نییەو گومانی ئەوەشی لێ دەکەن کە یارمەتی پەکەکە بدات. لەبەر ئەوانە کۆنترۆڵ کردنی کەرکوک بە یاسا بێت یان بە هێز و یان بەهەر شێوازێکی تر، بەلای تورکیاوە هێڵی سوورە.
تورکیا هەردەم چالاکانە کاری بۆ ئەوە کردووە گرفت بخاتە رێگای پرسی کورد لە رێگای دیپلۆماسییەتەوە بە مەبەستی رێگا گرتن لە روودانی خراپتر لەوەی ئێستا، تورکیا ئێستا پێشوازی لە بوونی ئەمریکا لە عێراق دەکات وەکو (چەسپێک کە عێراقییەکان ناچار بکات بە مانەوە بە یەکەوە)، هەر بۆیەش پشتیوانی لە پرۆسەی دەستووری کرد (سەرەڕای مەترسی لە ناوەڕۆکەکەی) و پشتیوانی لە حکومەتی تازەی عێراقیش دەکات. بەڵام هاوکات رۆڵێکی بە هێز بۆ تورکیا لەبەرچاو دەگیرێت بە حوکمی متمانە نەبوون بە ئامانجەکانی ئەمریکا و سەرسامی بەرامبەر بەو هەڵە زۆرانەی کە واشنتۆن لە ماوەی سێ ساڵی رابردوودا ئەنجامی داون و هەروەها لەبەر ئەوەی تورکیا بایەخێکی زۆر بەو رووداوانە دەدات کە لە کەرکوک روو دەدەن.
بێجگە لەوانەش، لۆبی ناسیۆنالیستی لەناو تورکیا داوای کردەوەی توندتر دەکات. لەم بارەیەوە (ئومێد ئۆزراگ)ی سیاسەتمەدار دەڵێت: ٢ بلیۆن دۆلار بازرگانی برێکی کەمە بۆ تورکیا بەڵام زۆر زۆرە بۆ کورد. ئێمە خاوەن پێگەیەکی جوگرافین کە بە کاری ناهێنین.

ئێمە دەتوانین سنوور دابخەین و بۆرییەکانی نەوتیش رابگرین. نابێت کۆمپانیاکانی تورکیا بەشداری لە کارەکانی کێڵگەی نەوتی تەق تەق بکەن. بەم شێوازەش کوردەکان ناتوانن درێژە بە سیاسەتە شێتانەکەیان بدەن.
تورکیا دەتوانێ ئازاری جیدی بە بەرژەوەندییەکانی کورد لە کەرکوک بگەیەنێت ئەگەر یاری بە وەرەقەی تورکمان بکات و ئاژاوە بنێتەوە. بە پێی قسەی ئەفسەرێکی پایەبەرزی خانەنشین کراو، دەرەنجامەکە ئەوەیە کە کورد ئایندەی نییە، چونکە هەر کاتێ هێزە بیانییەکان لە عیراق بکشێنەوە، ئەوا کورد روو دەکەنە تورکیا بۆ ئەوەی بیانپارێزێت وەکو چۆن لە رابردوودا روویدا. هەتاکو ئەو تورکانەی کە دۆستی کوردەکانی عێراقن هەمان بۆچوونیان هەیە. ئەوەتا لەم بارەیەوە ئیلنۆر چیقیک دەڵێت: ((هەر کاتێ ئەمریکا واز لە کورد بێنێت، ئەوا کورد پێویستییەکی زۆری بە تورکیا دەبێت)).
لەوانەیە هەر لەبەر ئەم هۆیەش بێت کە تورکیا تا ئێستا بێ دەنگە لە بەرامبەر کۆنترۆڵ کردنی هەنگاو بە هەنگاوی کەرکوک لەلایەن کوردەوە. وا دیارە تورکیا لەوە دڵنیایە کە رۆژێک دێت کورد بگاتە کۆتایی پێشبینی و دەسەڵاتەکانی. هەندێک کەسیش باس لەوە دەکەن کە ئیدارەی بوش ئەنکەرەی لەوە دڵنیا کردۆتەوە کە چارەسەری کێشەی کەرکوک دەکات و رێگا بە جموجوڵێکی تاک لایەنەی کورد لەوێ نادات. ئەوەتا پەیوەندیی چەقبەستووی ئەمریکا لەگەڵ هاوبەشە تورکیەکەیدا خەریکە ئاسایی دەبێتەوە دوای ئەوەی بە هۆی نارازی بوونی پەرلەمانی تورکیا بە رێگادان بە سەربازەکانی ئەمریکا لە ئاداری ٢٠٠٣ تا بە ناو خاکی تورکیادا تێپەڕن. ئەو گرفتەش لە رێگای تێگەیشتنی هەردوولاوە چارەسەر کراوە بەوەی کە هەردوولا پێویستییان بە یەکتر هەیە بۆ بەرەنگاربوونی نا سەقامگیری لە عێراق و بەرنامە ئەتۆمییەکەی ئێران. بۆ ئەم مەبەستەش وەزیری دەرەوەی ئەمریکا کوندالیزا رایس و وەزیری دەرەوەی تورکیا عەبدوڵڵا گول (بەیاننامەیەکی لێکگەیشتنیان) لە واشنتۆن مۆر کرد لە مانگی تەمووزی ٢٠٠٦ وەکو ئاماژەیەک بە پەیوەندی بە هێزو درێژ مەودای نێوان هەردوولا.

### (ب) ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەریکا

ئەمریکا بەزۆری لە کێشەی کەرکوک بێ لایەن بووە، چونکە زیاتر سەرقاڵی گۆڕانکاریەکانی ناوچەکانی تر بووە. لەرووی فەرمیشەوە رایگەیاند کە ئەو پرسە بۆ دەسەڵاتدارانی عێراق و پرۆسە دەستووری و یاساییەکە بە جێ دێڵێت. بەر لە ئەنجامدانی ریفراندۆمی مانگی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٥، ئەو هەڵوێستەی ئەمریکا بوو بە پشتیوانی بۆ پرۆسەی هەڵگەڕاندنەوەی تەعریب بە بێ دەرکردنی بە زۆری عەرەبە تازە هاتووەکان لە ناوچە تەعریب کراوەکان. هەروەها هەندێک لە بەرپرسانی ئەمریکا پێیان وابوو کە

پێویستە کەرکوک دۆخێکی تایبەتی کاتی هەبێت لەگەڵ پەیڕەو کردنی ڕێوشوێنی هاوبەش کردنی دەسەڵات کە تێیدا پێویستی بەو ریفراندۆمە ترسناکە ناکات. بەڵام ئەم بۆچوونە لە کاتی دارشتنی دەستووردا خۆی رانەگرت و کاری پێ نەکرا، بۆیە ئەمریکا ئێستا پشتیوانی لە ماددەی (١٤٠) دەکات بە خشتەی کات و سەرژمێری و ریفراندۆمیشەوە. ئەوەتا بەرپرسێکی ئەمریکی دەڵێت: ((ئێمە سیاسەتێکی تایبەتمان بە کەرکوک نییە، بەڵکە هەڵوێستمان بریتییە لە پاڵپشتی کردنی بڕیارەکانی حکومەتی عێراق)).
ئەمریکا کە نیازی نییە ئێستا دژ بە پڕمتمانەترین هاوپەیمانە عێراقییەکانی رابوەستێت، لەبەرامبەر پرۆسەی بە کورد کردنی کەرکوک بێ دەنگە، ئەمەش لە پێناو هێور کردنەوەی ئەو گرژییەی کە لە ئەنجامی هەڵمەتی هاتنەوەی کوردە دەرکراوەکان بۆ شارەکە، دەستی کردووە بە هەڵمەتێکی سەرانسەری ئاوەدان کردنەوە. هەروەها ئەمریکا پشتیوانی تەکنیکی و دارایی ناراستەوخۆ بۆ کۆمسیۆنی داواکاری موڵکداری دابین دەکات. کاتێکیش ئەمریکییەکان بە پشتیوانی کردن لە بە کوردی کردنی کەرکوک تۆمەتبار کرا، بەرپرسانی ئەو وڵاتە گوتیان کە نەتەوەکانی تریش دەتوانن خەڵکی خۆیان بێننە ناو شارەکە.
ئەو هێرشە تیرۆریستییانەی دەکرێنە سەر هێزەکانی کورد و ئەمریکا لە کەرکوک، بوونەتە هۆی بەهێز کردنی هاوپەیمانی ئەمنی لە نێوانیان و لە ئەنجامیشدا گواستنەوی گیراوە گومان لێ کراوەکان لە کەرکوکەوە بۆ زیندانەکانی ناو هەرێمی کوردستان. ئەم پرسەش ناڕەزاییەکی زۆری لە ناو عەرەب و تورکمانی کەرکوک دروست کرد کە زۆر بەو هەنگاوە نیگەران بوون. بەڵام گومان لەوە دەکرێت ئەمریکا بە رادەیەک پشتیوانی کورد بکات کە تورکیای هاوپەیمانی بەلاوە بنرێت. هەتاکو ئومێدیش بۆ سەقامگیر بوونی عێراق مابێت، ئەمریکا هەر بە دوای چارەسەرێکی ئاشتییانەدا دەگەڕێت لە کەرکوک کە بەژەوەندییەکانی کورد و تورکیا و بەغداش جێبەجێ بکات. ئەمەش بەرژەمەندییەکی باڵای ئەمریکایە لە کاتێکدا کە ئەو ئاژاوەیە لە ئەنجامی کۆنترۆڵ کردنی کەرکوک لەلایەن کوردەوە زیاتر هەوڵەکانی ئەمریکا بۆ بونیاتنانەوەی عێراق ئاڵۆز دەکات.
لەم بارەیەوە لێکۆڵەرەوەیەکی سیاسی لە ئەمریکا گوتی: ((ئەو مەسەلەیە لە ئەولەویاتی ئەمریکادا نییە و ئەمریکا تەنها ئاگای لەوە دەبێت کە نەگاتە رادەی تەقینەوە کە ناچاریان بکات بە گواستنەوەی ژمارەیەک لە سەربازەکانیان لە ناوچەکانی عەرەبی سوننەوە بۆ کەرکوک)).
بە هەر حاڵ، بە گوتەی هەمان لێکۆڵەرەوە، ئەگەر کورد هەوڵی زیاتر بۆ کۆنترۆڵ کردنی کەرکوک بدەن و عەرەبیش رەتیان بدەنەوە، لەوانەیە ئەمریکا ناچار بێت بە رێگا گرتن لە خوێن رژان.

بەڵام روون نییە کە بۆچوونی ئەمریکا سەبارەت بە کەرکوک چۆن دەگۆڕێت ئەگەر عێراق دابەش بوو. بێگومان لەوانەیە کۆنترۆڵ کردنی دیفاکتۆی کورد بۆ کەرکوک وەکو شێوازێک بۆ پاراستنی بیرە نەوتەکان، لەگەڵ گەرەنتیدان بە تورکیا کە کورد داوای سەربەخۆیی ناکەن، کردەیی ترین ئەلتەرناتیڤی ئەمریکا بێت.

بە هەر حاڵ، نەبوونی سیاسەتێکی تایبەت بە کەرکوک کارەساتی بەدواوە دەبێت و بیانووی پاراستنی سەروەریی عێراق تەنها بە هەڵەدا بردنە. ئەوەتا دەبینین ئەمریکا هەردەم لە گۆڕەپاندا بووە لە رووی دیپلۆماسی و دارایی و سەربازییەوەو تازەترین هەوڵی لەم چوارچێوەیەدا بریتی بوو لە رۆڵی سەرەکی لە وەدی هێنانی حکومەتی یەکێتی نیشتمانی لە مایسی (٢٠٠٦)دا. ئەمەش یەکەمین هەنگاوی گرنگ بوو لە مامەڵە کردن لەگەڵ بەپەلەترین تەنگژەدا، واتا ململانێی تایفەگەری روو لە زیاد بوون.
بەڵام کەرکوک یەکێکە لە کۆمەڵێک پرس کە ئەگەر چارەسەر نەکرێن، دەبنە مایەی رێگا گرتن لە سەقامگیری عێراق، ژمارەیەک لە لایەنەکانی عێراق بە ئاشکر ئاماژەیان بەوە کردووە کە کەرکوک پێویستی بە دیپلۆماسییەتێکی چالاکی ئەمریکا هەیەو دەبێ هەر ئێستاش ئەو دیپلۆماسیەتە دەست پێ بکات.

## (٦) مامەڵە کردن لەگەڵ بەرژەوەندییە بنەڕەتییەکانی کورددا

ئێستا کورد ئەکتەری باڵادەستن لە کەرکوک و کاریگەرییەکی بێ وێنەیان لە بەغداشدا هەیە، ئەوان لە چەندین رێگاوە دەسەڵاتی ئەوەیان هەیە کە کەرکوک بخەنە سەر هەرێمی کوردستان، بەڵام پرسیارەکە ئەوەیە کە ئایا هیچ لەم سیناریۆیانە لە کۆتاییدا خزمەتی بەرژەوندییە بنەڕەتییەکانی کورد دەکات ین نا ؟!.

### أ- سیناریۆکانی کۆنترۆڵ کردنی کەرکوک

کوردەکان بەرەو پتەو کردنی کۆنترۆڵی خۆیان بەسەر شاری کەرکوک و بە فەرمی کردنی ئەو کارە لە دوو ساڵی داهاتوودا هەنگاو دەنێن و دەتوانن بۆ گەیشتن بەو ئامانجە یەکێک لەم رێگایان بگرنە بەر:

* لە رێگای دەستوورەوە: ئەم سیناریۆیە کە لە ئەنجامی کاریگەریی کورد لەسەر پرۆسەی سیاسی عێراق هاتووەتە ئاراوە، بەلای سەرکردایەتی کوردەوە پەسەندترین سیناریۆیە. دەستووری عێراق داوا دەکات هەتاکو (٣١)ی ئاداری ٢٠٠٧ پرۆسەکانی ئاسایی کردنەوەو گەڕاندنەوەی عەرەبی تازە هاتوو و هەروەها گەڕاندنەوەی ئەو بەشانەی پارێزگای کەرکوک کە پێشتر لەسەر پارێزگاکە لادرابوون، بە ئەنجام بگات. ئینجا

پێویستە هەتاکو (٣١)ی تەمووزی ٢٠٠٧ پرۆسەی سەرژمێریی لە کەرکوک و ئەو ناوچانەی تر کە کورد داوایان دەکەن، ئەنجام بدرێت. دوا بە دوای ئەویش ریفراندۆمێک یان زیاتریش لەو ناوچانە رێک بخرێت بەر لە (٣٠)ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٧. لەبەر ئەوەی کە سەرکەوتن لە ریفراندۆمەکە زۆرینەیەکی سادەی پێویستە، کورد پێشبینی دەکات کە زۆرینەیەکی رەها وەدەست بێنێت (بە تایبەتی ئەگەر سنوورەکانی پارێزگای کەرکوک گەڕانەوە بۆ سەردەمی پێش سالی ١٩٦٨) هەتاکو بەر لەوەی کەرکوک بگەڕێتەوە سەر هەرێمی کوردستان. بەلای کوردەوە، کەرکوک بەم شێوازە بە یاسایی و بە شێوازی دیموکراتی دەگەڕێتەوە سەر هەرێمەکەیان. کێشەی ئەم پلانە لەوەدایە کە نەتەوەکانی تری کەرکوک رەتی دەکەنەوەو حکومەتی ناوەندیش بە نەوەدڵ لەگەڵی دایە. عەرەب و تورکمانەکانی کەرکوک دەڵێن ئەم پرۆسەیە کە دەستوور داڕشتووە دیموکراتی نییە چونکە عەرەبی سوننە و تورکمان بە زۆری بەشدارییان لە داڕشتنیدا نەکردووەو پرۆسەکە لە بەرژەوەندی کورد نووسراوە. سەرکردەی هەندێک لە گروپەکان دەڵێن ئەگەر ریفراندۆمیش بکرێت، ئەوان بایکۆتی دەکەن وەکو کارێکی نا یاسایی و دواتریش دەرئەنجامەکەی وەکو لاگیری کردن لە قەڵەم دەدەن و رەتی دەکەنەوە. وەکو ئاماژەشی پێ کرا هەندێ گروپ ئامادەییان دەربڕیوە بۆ بەربەرەکانی کردنی هەر هەوڵێکی کورد لە پێناو کۆنترۆڵ کردنی کەرکوک لە رێگای ریفراندۆمەوە.

لە کاتێکدا کە مرۆڤ ناتوانێت پێشبینی ئەوە بکات لە ئەنجامی جێبەجێ کردنی دەستوور شەڕی ناوخۆ لە کەرکوک هەڵدەگیرسێت، بەڵام دەکرێ بە دڵنیاییەوە بڵێین کە هەر هەوڵێک لەلایەن کوردەوە بۆ لکاندنی کەرکوک بە کوردستانەوە لە رێگای پرۆسەیەک کە نەتەوەکانی تر تێدا بەشدرا نەبن، رووبەرووی ئۆپۆسزیۆنێکی توند دەبێتەوە. ئەگەر ئەمەش رووی دا ئەوا کورد ناچار دەبن پەنا بۆ ئەگەری دووەمیان ببەن.

* لە رێگای هێزەوە: سەرکردەکانی کورد هەر کاتێک بکەونە ژێر پاڵەپەستۆوە، روونی دەکەنەوە کە کەرکوک مافی خۆیانەو هەر بەربەرەکانێیەک و، یان هاوکاری نەکردنێک لەلایەن نەتەوەکانی ترەوە ناچاریان دەکات بۆ پەنا بردن بۆ هێز.

لەم بارەیەوە، ناسح غەفور رەمەزان کە پەرلەمانتارێکی پارتییە دەڵێت: ((ئەگەر کاری توندوتیژی سەرهەڵبدات، ئەوا خەیاری کۆتاییمان بریتی دەبێت لە موساوەمە نەکردن لەسەر کەرکوک دوای ئەو هەموو رووداوە کە روو دەدەن، بەڵام هیوادارین کار نەگاتە ئەو ئاستە)).

ئەگەر خاڵە دەستوورییەکان جێبەجێ بکرێن و ڕەت بکرێنەوە یان هەر جێبەجێ نەکرێن لەبەر بەربەرەکانێ کردنی حکومەتی ناوەند یان مەترسی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ، ئەوا کورد رادەگەیەنن کە کەرکوک موڵکی خۆیانەو سنوورەکانی پارێزگاکە یەک لایەنانە دادەڕێژن (بۆ نموونە حەویجە دەردەکەن)و هێزی خۆپاراستن ئامادە دەکەن. لە ناخۆشترین دۆخیشدا کە دەگاتە شەڕی ناوخۆ، لەوانەیە ئەو ژمارە زۆرەی کورد کە لە بەغدا نیشتەجێن، لەلاین میلیشاکانەوە دەربکرێن. ئەگەر ئەم کارەش رووبدات، ئەوا لەوانەیە سەرکردەکانی کورد ناچار ببن بە دەرکردنی ئەو عەرەبە تازە هاتووانەی کە تا ئەو کاتە لە کەرکوک ماون و پێشکەش کردنی ماڵ و جێگاکانیان بە کوردە دەرکراوەکانی بەغدا.
بە حوکمی باڵادەستی سەربازی کورد لە کەرکوک و ئەگەری ڕێگا لێ نەگرتنیان لەلایەن ئەمریکاوە، کورد دەتوانن کۆنترۆڵی تەواوی پارێزگای کەرکوک بکەن بێجگە لە ناوچە عەرەب نشینەکان. هەروەها دەتوانن چەند ناوچەیەکی تریش ببەن کە داوایان دەکەن وەکو سنجار و تەلەعفەر و بەشی ڕۆژهەڵاتی موسڵ و مەخمور و خورماتوو و کفری و خانەقین و مەندلی.
گرفتی ئەم هەنگاوەش لەوەدایە کە کورد لەو شەعبیەتە بێ بەش دەکات کە پێویستی پێی هەیە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی کاریگەر حوکم بکەن و داواکارییەکانیان لەلایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتییەوە بە ڕەسمی بناسرێت.
ئەگەر نەیارەکان نەتوانن لەسەر مەودایەکی کورت تەحەدایەکی سەربازی گرنگ پێک بێنن، ئەوا دەتوانن لە ڕێگای ئاژاوەگێڕی و کاری توندو تیژییەوە ژیان لە شارەکەدا دژوار بکەن. ئەوەتا هەر ئێستا ژمارەیەکی زۆر لە کوردەکانی کەرکوک ڕازی نین بە گەڕانەوە لە ترسی تاوانکاریی هەڕەمەکی و توندو تیژیی سیاسی و بێ سەروبەری بێجگە لە نەبوونی رادەی پێویست لە خزمەتگوزاریی فێرکردن و تەندروستی و خزمەتگوزارییە بنەڕەتییەکانی تر.
ئەگەر تورکیاش هێزەکانی خۆی لەو دیوی سنوورەوە بهێڵێتەوە، ئەوا لە ڕێگای لۆبی تورکمانییەوە دەتوانێ هانی چالاکی یاخیبووانە لە دژی کورد لە کەرکوکدا بدات. دەرەنجامەکەش بریتی دەبێت لە کاری توندوتیژی و ناسەقامگیری درێژمەودا کە پێویستە کورد هەموو هەوڵێکی خۆیان بدەن بۆ خۆپاراستن لەو دەرەنجامە.

*** لە ڕێگای ئامادە نەبوونەوە:**
دەکرێ کەرکوک لە ڕێگای شێوازێکی ناوەند لە نێوان بە کارهێنانی یاساو بەکار هێنانی هێزەوە بکەوێتە دەستی کورد. لەم سیناریۆیەدا، کورد درێژە بە سیاستی ئێستایان دەدەن

که تێیدا کۆنترۆڵی سیاسی و دامەزراوەیی و سەربازی خۆیان لە پارێزگاکەدا بە هێز دەکەن و بارودۆخی (الامر الواقع) دروست دەکەن، کورد دەتوانن لە ڕێگای هەڵوێستی ژیرانەو دابەش کردن و بێ لایەن کردنی نەیارەکانیان، بۆ نموونە، وەکو رازی بوون بە ڕێوشوێنی هاوبەشی کردنێکی چالاکی دەسەڵات لەگەڵ نەتەوەکانی تر، هەڕەشەی ڕووداوی کاری توندو تیژی کەم بکەنەوە.

لەو ڕووەوە دکتۆر ناسح غەفور رەمەزانی دەڵێت: ((ئێمە ناتوانین لە جێگای ئەوان هەڵبژاردەنەکان ببەینەوە، بەڵام دەتوانین چەند پۆستێکی حکومی و ئیدارییان پێ بدەین. بەربەرەکانێ کردنی ئەوان لە بەرژەوەندیماندا نییە چونکە ئێمە لە دۆخێکی نائاساییدایین)).

لەوانەیە ئەم شێوازە ڕێگایەکی پڕ لە ئومێد بێت بۆ کورد، چونکە کۆنترۆڵ کردنی کەرکوکیان بە کەمترین رادەی زیان بۆ مسۆگەر دەکات. بەڵام هێشتنەوەی بارودۆخەکە بە چارەسەر نەکراوی و هێشتنەوەی پاڵەپەستۆی بەردەوام دەرەنجامی ناسەقامگیری بە دواوە دەبێت. لەوانەیە سەرکردایەتی کوردی کە پاڵپشتی نێوخۆیی لەگەڵدایە، هەست بە پێویستی هەڵهێنانی هەنگاوی تاک لایەنە بکات بۆ لکاندنی کەرکوک.

### (ب) مسۆگەر کردنی بەرژەوەندییەکانی کورد

ئەگەر سەرکردایەتی کورد نیازی چارەسەر کردنی ئاشتییانەی کێشەی کەرکوکی هەبێت، پێویستە دەست لە بەرزترین رادەی داواکاری لەم بارەیەوە هەڵگرێ. بەڵگەش هەیە لەسەر ئەوەی ئەم کارە دەکەن چونکە لە بەرژەوەندییە بنەڕەتییەکانیانە.

پرسیاری سەرەکیش کە ڕووبەڕووی کورد دەبێتەوە لەو چوارچێوەیەدا بریتییە لەوەی کە ئایا دەیانەوێ وەکو بەشێک لە عێراق بمێننەوە یان نا؟ ئەگەر وەڵامەکە ئەرێنی بێت، ئەوا گرنگی پرسی کەرکوک بە شێوەیەکی دراماتیکی کەم دەبێتەوەو دەکرێ لە ڕێگای گفتوگۆوە چارەسەر بکرێت.

لەو حاڵەتەشدا هێشتا هەر کورد داوای دەست بەسەردا گرتنی سەرچاوە سروشتییەکانی کەرکوک دەکات بێجگە لە زامن کردنی هەموو مافەکانی کورد لە شارەکەدا و پاراستنیشیان. بەڵام ئەم پرسانە دەکرێ لە ڕێگای دابین کردنی سەقامگیری سیاسی و دەستووری هەموار کراو و گەرەنتی نێودەوڵەتییەوە مسۆگەر بن. بە هەر حاڵ، کورد بە گرنگیدان بە مەسەلەی لکاندنی کەرکوک بە هەرێمەکەیانەوە (کە تەنها کارێ بە سوود دەبێت کە بیر لە جیابوونەوە بکرێت) گومانی ئەوە لەلای خەڵکانی تر دروست دەکەن کە ئەوان بە قسە دەڵێن (بەڵێ) بەڵام لە ڕاستیدا بیر لە (نەخێر) دەکەنەوە.

ئەگەر مەبەستی کورد لە داواکردنی کەرکوک تەنها لەبەر ئەوەیە کە لە دێرزەمانەوە لەوێ ژیاون و زۆرینەی دانیشتووانی پارێزگاکە پێک دێنن، ئەوا دژ بە نەتەوەکانی تر دەکەونە ململانێ کە ئەوانیش بیانووەکانیان بۆ داوا کردنی شارەکە لەوانەی کورد کەمتر نین.
ئەگەر مەبەستیشیان لەو داوایە ڕێگا گرتن بێت لە دووبارە بوونەوەی ستەمەکانی پێشوو، ئەوا پاراستنی پێویست لە کاتی لکاندنی کەرکوک بە کوردستانەوە زامن نابێ، لێرەشدا دوو دەرەنجام دەردەکەون:

یەکەم: کورد داواکارییەکی بە هێزیان بۆ سەربەخۆبوون هەیە کە لەسەر بنەڕەتەکانی ئەتنی و زمان و کلتور و هەروەها خەبات و مەینەتییەکانی ڕابردوو بونیات نراوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون لە پێشکەش کردنی بیانوویەکی ڕەزامەند بەخش بۆ باڵادەستییەکی تاک لایەنە لە کەرکوکدا.

دووەم: سوور بوونیان لەسەر وەدەست هێنانی کەرکوک تەنها بە ئارەزووی سەربەخۆبوون لێک دەدرێتەوە.

بێگومان ئەوان گریمانەی ڕاگەیاندنی سەربەخۆییان لەبەر دەستدایە لە چوارچێوەی سنوورەکانی کوردستان بە بێ کەرکوک. لەم گریمانەشدا دەتوانن پشت بە لاگیری کردنی ژمارەیەکی زۆر لە عێراقییەکان ببەستن. بەڵام ئەم گریمانە دەستکەوتێکی ئەوتۆ ناگەیەنێت بەلای گەلی کوردەوە چونکە لەم حاڵەتەدا دەکەونە دۆخێکی ئەوەند لاواز لە ڕووی ئابوورییەوە کە ناتوانن لە ڕووی هیچ پاڵپەستۆیەکی بیانی خۆیان بگرن.

کەواتە هەموو ئاماژەکان بەو ئاراستەیەن کە کورد ناتوانن کەرکوک وەدەست بێنن، جا چ بە ڕێگای یاسایی بێت یان بە هێز، بەڵێ ئەوەی کاری توندوتیژی بەربڵاوی لێ بکەوێتەوە، هەروەها هۆکاری بەهێزیش لە ئارادایە بۆ بڕوا کردن بەوەی کە دوای کۆنترۆڵ کردنی کەرکوکیش، ئەوان ناتوانن بیپارێزن بە بێ ئەوەی ڕووبەڕووی ناسەقامگیریی درێژخایەن و تەحەدی بەردەوام ببنەوە.

ئینجا هەرچی ئامانجێک لە ناخی کورددا بێت، (زۆربەی چاودێرانیش بڕوایان وایە کە کورد شایستەی ئەو داواکارییانەن)، پرسیارەکە ئەوەیە کە ئایا هەوڵدان بۆ وەدەست هێنانی سەربەخۆیی کارێکی لۆجیکییە لە کاتێکدا کورد لە دۆخێکدا نییە کە سەرچاوەی ئابووری گرنگ و یان پشتیوانی عێراقی و هەرێمایەتی و بگرە نێودەوڵەتیش وەدەست بێنێت کە پێویستە بۆ بە شەرعی کردنی دەسەڵاتەکەیان و بەردەوام بوونی.

**(٧) ئەلتەرناتیڤ:** حاڵەتی فیدراڵییەتێکی تایبەت و کاتی و هاوبەشی کردنی دەسەڵات ئەگەر چارەسەر کردنێکی ئاشتییانەی دۆخی کەرکوک کە بگونجێت لەگەڵ بۆچوونی کورددا، کارێکی مەحاڵ بێت، پێویستە پەنا بۆ ئەلتەرناتیڤی تر ببرێت. لەوانەیە ئەم ئەلتەرناتیڤانەش ببنە مایەی چارەسەر کردنی کێشەی هەموو ناوچە ململانێ لەسەرەکان کە ماددەی (١٤٠) دەیانگرێتەوە، پێویستە حکومەت بە هەردوو لقی یاسادانان و راپەڕاندنیشەوەو هەروەها نوێنەرانی نەتەوەکانی کەرکوک و نوێنەرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان گفتوگۆ دەربارەی چارەسەری سیاسی کێشەکە لەم رێگایانەی خوارەوە بکەن:

* کەرکوک وەکو هەرێمێک: بە پێی ماددەی (١١٩)ی دەستوور، "هەر پارێزگایەک یان زیاتر مافی ئەوەی هەیە کە هەرێم دروست بکات"، "هەر هەرێمێکیش دەستوورو دەسەڵاتی خۆی هەبێت وەکو چۆن لە دەستوورو تەشریعەکانی ئایندەدا باس دەکرێت".
  ئینجا بۆ ئەوەی بەرژەوەندییە بنەڕەتییەکانی هەموو لایەک لە شارەکەدا جێبەجێ بکرێت و هێڵی سووری هیچ لایەکیش نەبەزێنرێت، دەکرێ پارێزگای کەرکوک بکرێتە هەرێمێکی فیدراڵ. بەمەش کەرکوک ناکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی راستەوخۆی هەرێمی فیدراڵی کوردستان (کە هێڵی سووری عەرەب و تورکمانە)و، هەروەها ناکەوێتە ژێر کۆنترۆڵێ حکومەتی ناوەندی لە بەغدا کە ئەمەش هێڵی سووری کوردە.
* پەسەند کردن بە یاسا: بۆ حاڵەتی کەرکوک، دەبێ ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بیرۆکەی ریفراندۆم وەلاوە بنێت و لە جێگای ئەوە یاسایەک دەربکات کە بەو پێیە حاڵەتی هەرێمی فیدراڵی بەو پارێزگایە ببەخشێت.
  ئەوەتا دەستووریش ئەو دەسەڵاتە بە ئەنجومەنی نوێنەران دەدات و ماددەی (١١٨) دەڵێت: "ئەنجومەنی نوێنەران دەتوانێ لە ماوەیەکدا کە زیاتر نەبێت لە (٦) مانگ لە دوای یەکەمین دانیشتنی خۆی، یاسایەک دەربکات وتێیدا رێوشوێنی تایبەتی دەسنیشان بکات بۆ دروست کردنی هەرێم لە رێگای زۆرینەی ئاسایی دەنگی ئەندامە ئامادەبووەکانەوە".
  هەرچەندە کاتی یەکەمین دانیشتنی ئەنجومەنی نوێنەران جێگای مشت و مڕە، بەڵام نوێنەرە هەڵبژێردراوەکان لە (٢٠٠٦/٣/١٦)دا سوێندی یاسایی خوارد. ئەم یاسایەش لە جێگای ئەو ریفراندۆمە دەبێت کە لە ماددەی (١٤٠)د ئاماژەی پێ کراوە.
* بۆ ماوەیەکی کاتی:
  بۆ ئەوەی ئەم چارەسەرەش بەلای کوردەوە پەسەند بێت، پێویستە دۆخی کەرکوک وەکو هەرێمێکی فیدراڵ تەنها بۆ ماوەیەکی کاتی بێت.

ئەگەر ماوەی کاتی بە شێوەیەکی دروست بەڕێوە ببرێت، ئەوا دەرفەت بە نەتەوەکانی کەرکوک دەدات کە متمانەیان بۆ بگەڕێتەوە سەبارەت بە پاراستنی مافە بنەڕەتییەکانیان و بەرگری کردن لە بەرژەوەندییەکان کە لە ئەنجامدا دەکاتە زامن کردنی ئایندەیان. ئەمەش هۆکارێک دەبێت بۆ هێور کردنەوەی مەترسییەکان و کەمکردنەوەی گرژییەکان و (بەو هیوایەی) پێکەوە ژیان نێوان نەتەوەکانیش بگەڕێنێتەوە. پێویستە یاسای هەرێمی کەرکوک هەم خشتەیەکی کاتی تێدا بێت (بۆ نموونە ١٠ساڵ) و هەم میکانیزمیش بۆ چارەسەر کردنی کۆتایی دۆخی پارێزگاکە.

*** هاوبەشی کردنی دەسەڵات:**

ئەڵبەتە بەخشینی حاڵەتی هەرێم تەنها بە پارێزگای کەرکوک بەس نییە، بەڵکو پێویستە لە ماوە کاتییەکەدا دەسەڵات هاوبەش بێت لە نێوان چوار پێکهاتە سەرەکییەکەدا. هەندێ بۆچوونیش باس لەوە دەکەن کە هەر یەک لە پێکهاتەکان (١/٤)ی دەسەڵاتی یاسادانانی پێ بدرێت.

ئەم ڕێوشوێنەش دەرکەوت و کاریشی لەسەر کرا لەسەر ئاستی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوک لە نێوان مایسی ٢٠٠٣ و کانوونی دووەمی ٢٠٠٥.

پیشنیاری تریش دەڵێت کە پێویستە ڕێژەیەکی زیاتر لەوەی کەمینە مەسیحییەکان کە بدرێت بە سێ پێکهاتەکەی تر وەکو ڕێژەی ٣٠-٣٠-٣٠-١٠٪، بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتداو پێویستە کەرکوکییەکان لە شێوازی هاوبەشی کردنی دەسەڵات لەسەر بنەمای ئەتنی دوور بکەونەوە.

*** لە ڕێگای ناوبژیوانی کردنی نێودەوڵەتی:**

پێویستە ئەنجومەنی ئاسایش نێردراوێکی تایبەت بۆ کەرکوک دەستنیشان بکات کە بە پشتیوانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، کار بکات بۆ سەقامگیر کردنی هەرێمی فیدراڵی کەرکوک و چارەسەر کردنی دۆخی ناوچە ململانێ لەسەرەکانی تر.

ئەرکە سەرەکییەکانی ئەو نێردراوە بریتی دەبن لە ڕێگا خۆشکردن بۆ گفتوگۆ کردن دەربارەی شێوازەکانی حاڵەتی کاتی کەرکوک، یارمەتی دان لە دامەزراندنی ڕێوشوێنی هاوبەشی کردنی دەسەڵات کە تێیدا هەموو نەتەوەکان کەرکوک نوێنەرایەتیان هەبێت، دانانی میکانیزمێک کە تێیدا پۆستە گەورەکانی حکومەتی هەرێمی کەرکوک و هەروەها کۆمپانیای نەوتی باکور لەسەر بنەمای توانایی و شارەزایی بێت بە بێ جیاوازی کردن لە دژی هیچ نەتەوەیەک، دابین کردنی پارە لە وڵاتە بەخشندەکانەوە بۆ ئاوەدان کردنەوەی کەرکوک هاوکات لەگەڵ دڵنیابوون لە بە کار هێنانی بە پێی پێویست نەک بە پێی ئەتنی، چاودێری کردنی مەسەلەی پابەند بوون بە ڕێککەوتنەکانەوەو هەروەها بەرزکردنەوەی ڕاپۆرتی دەوری بۆ ئەنجەمەنی ئاسایش.

نەتەوە یەکگرتووەکانیش هەروەها دەتوانێ بیر لە بەستنی کۆنفرانسێکی نێودەوڵەتی بکاتەوە سەبارەت بە کەرکوک.

*** بڕیاردان لەسەر مەرجەکان:**

پێویستە مەرجە وردەکانی ئەو جۆرە ڕێوشوێنە لەلایەن خودی کەرکوکییەکانەوە بڕیاری لەسەر بدرێت بە هەماهەنگی لەگەڵ حکومەتی ناوەند و حکومەتی هەرێمی کوردستان. لەمەشدا پرۆسەی بڕیاردان سوود لە گشتگیری و شەفافیەت وەردەگرێت: پێویستە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنی وەکو سەندیکاکان و ڕێکخراوە قازانج نەویستەکان و ڕێکخراوەکانی ئافرەتان بە تایبەتیش لە کەرکوک بەشدار بکرێن بە مەبەستی کەم کردنەوەی مەترسی ناڕەزاییەکی گشتی بەرامبەر بە ڕێگا چارەکە.

*** هەڵگەڕاندنەوەی ناڕەواییەکانی رابردوو:**

پێویستە لە ماوە کاتییەکەدا، پرۆسەی هەڵگەڕاندنەوەو هەڵوەشاندنەوەی ناڕەزاییەکانی پێشوو بەردەام بێت لەگەڵ گەڕانەوەیەکی ڕێکخراو بۆ ئەو کەسانەی کە بە زۆر دەرکراون لەلایەن ڕژێمەکانی پێشووەوە، ئاسانکاری کردن بۆ گەڕانەوەی ئەو کەسانەی لەلایەن ڕژێمی پێشووەوە هێنراون و قەرەبوو کردنەوەیان بە تایبەتیش ئەوانەی رازین بە ڕۆیشتن، چارەسەر کردنی کێشەی موڵکداری لە ڕێگای میکانیزمە دانراوەکەوەو، هەروەها ڕێکخستنی پرۆسەیەک کە تێیدا ناوچەکانی پێشووی پارێزگای کەرکوک بگەڕێنەوە بۆ سەر پارێزگاکە و یان لەسەر شوێنەکانی ئێستایان بمێننەوە.

*** هەموار کردنی دەستوور:**

لە کاتی پێداچوونەوە بە دەستووردا، پێویستە یاسادانەران ماددەی (١٤٠) بگۆڕن بە ماددەیەکی تر کە تێیدا پرەنسیپی هەڵوەشانەوەی ناڕەزاییەکانی پێشوو (ماددەی ٥٨ لە یاسای کاتی) بپارێزرێت و دۆخی جیاوازی کەرکوک وەکو هەرێمێکی فیدراڵی بۆ ماوەیەکی کاتی بە فەرمی بناسرێت.

ئەو شێوازەی لێرەدا باس کراوە لەلایەن هیچ کەسێک لە نوێنەرانی چوار نەتەوە سەرەکییەکەی کەرکوکەوە ئاماژەی پێ نەکراوە کە لە ماوەی دوو ساڵی رابردوودا چاوپێکەوتنیان لەگەڵدا ساز کراوە، بەڵام هەموو ئەو کەسانە باسیان لەو سیناریۆیانە کرد کە لەلایەن نەتەوەکانیانەوە ئەگەری ڕەت کردنەوەیان هەیە. بە مانایەکی تر، ئەم سیناریۆیە لەلایەن هیچ کەسێکەوە پەسەند نەکراوە، بەڵام هەوڵ دەدات چارەسەری بابەخە گرنگەکانی هەموو لایەک بکات بە بێ بەزاندنی هێڵە سوورەکان.

مولکی نەوەکانی ئایندەشمانە، دەبێت زۆر بە وریایی مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت و هەر جۆرە نەرمیی و سازشکارییەک لەگەڵ پەرژەوەندییە بیانییەکان بەند بێت بە ماف و چارەنووسی نەتەوەکەمانەوە.

**هاولاتی: چ لەمیدیاکان و چ لە بەغدایش باس لەوە دەکرێت کە پرۆژەی یاسای نەوت و غاز دەرگای لەسەر پشت کردوەتەوە بۆ کۆمپانیا بیانییەکان، باس لە گرێبەستی (مشارکة الانتاج) دەکەن، ئەمانە تاچەند راستن؟**

**جەوهەر نامیق:** پرۆژەی یاساکە بە تەواوی دەرگای والاکردووە بۆ خصخصەکردنی کەرتی نەوت. راستە لەمادەو برگەیەکی زۆریدا رۆڵێکی گەورەو فەزایەکی باشی داوە بە (کۆمپانیای نیشتمانی نەوتی عێراق) هەروەها بۆ هەر کۆمپانیایەکی خۆماڵی، بەلام بەهەمان مەرجی تەکنیکی و سەرمایەو ئەزموونی بێگانەکان یان ئەو کێڵگانەی کە تەرخانکراون بۆ کۆمپانیا بیانییەکان خۆی لەسنوری زیاتر ٦٢٪ی کێڵگەکانی نەوتی عێراقی ئەدات. دیارە لەپرۆژەکەشدا جەخت لەجۆری گرێبەستی (مشارکة الانتاج)کراوە، کە هەر وەکو ئاماژەم بۆ کرد ئەم جۆرە گرێبەستانە کۆنن و باویان نەماوە، دژ بە بەرژەوەندی ولاتەکەن، لەدوای پەنجاکان هیچ ولاتێکی نەوتی لەسەری ناڕوات، ئەگەر هەبێت ئەوە بۆ هەندێ ناوچەیە کە ئەگەری دۆزینەوەی نەوتی زۆر کەم بێت و کولفەی زۆرگران بێت...هتد، بۆ ئەوەی گرێبەستی (مشارکة الانتاج) روونتر بکەینەوە زۆر بەسادەیی ئەڵێین: ئەگەر عێراق لەگەڵ کۆمپانیاکانی بیانیی پێک بێت بەگرێبەستی (مشارکة الانتاج) بەرهەمی رۆژانەی سێ ملیۆن بەرمیل بێت و نرخی یەک بەرمیل ٦٠ دۆلار بێت ئەوە:

* ٣×٦٠= ١٨٠ ملیۆن دۆلار رۆژانە داهاتی عێراق.
* (ریع الانتاج) بەپێی پرۆژەی یاسای نەوت و غاز (١٢,٥)ـە لەکۆی گشتی داهات: (١٨٠ملیون دۆلار× ١٢,٥ = ٢٢,٥)ملیۆن دۆلار، ئەمە ئەدرێت بە حکومەت. (ریع الانتاج) ئەو برە پارەیەیە کە کۆمپانیاکان دەبێت بیدەنە حکومەتی عێراق یان لە جیاتی ئەو برە پارەیە (نەوت) .
* کلفەی یەک بەرمیل(٣) دۆلار= ٣×٣=٩ ملیۆن دولار. ئەمە دەڕوات بۆ کۆمپانیا بیانییەکان.

ئەوەی دەمێنێتەوە: (١٨٠) - ( ٢٢,٥+ ٩) = ( ١٤٨,٥ ) ملیۆن دۆلارە (رۆژانە)و، دابەش دەکرێت لەنێوان حکومەت و کۆمپانیاکاندا بەشی هەر یەک= (٧٤,٢) ملیۆن دۆلارە (رۆژانە).

داهاتی حکومەتی عێراق (گشتی) = ( ربع الانتاج +نیوەی داهات)= (٢٢,٥+٧٤,٢)= (٩٦,٧)ملیۆن دۆلار رۆژانە.
داهاتی کۆمپانیاکان = ٩+ ٧٤,٢ = (٨٣,٢) ملیۆن دۆلار رۆژانە.
جیاوازییەکان لەهەردوو حاڵەتەکەدا:
ئەگەر حکومەتی عێراق خۆی هەڵسێت بە بەرهەمهێنانی نەوت ئەوە داهاتی گشتی= (١٨٠) ملیۆن دۆلاری رۆژانە = ٦٤,٨ ملیار دۆلار ساڵانە.
بە هاوکاری کۆمپانیاکان = ٩٦,٨ ملیۆن دۆلار رۆژانە = ٣٤,٨ ملیار دۆلار ساڵانە.
داهاتی کۆمپانیاکان = ٨٣,٢ ملیۆن دۆلار رۆژانە =( ٣٠) ملیار دۆلار ساڵانە.
بودجەی ئەمسالی عێراق (٢٠٠٧) = ٤٢,٥ ملیار دۆلارە .
ئەگەر گرێبەستەکە بۆماوەی ٤٠ ساڵیش بێت ئەوە داهاتی کۆمپانیاکان = ٤٠×٣٠=(١٢٠٠) ملیار دۆلار = (١,٢) ترلیۆن دۆلار واتە (١,٢) هەزار ملیۆن دۆلار....!

# ناوەڕۆک

ئەمە ئەزموونێکی ڕابردوومان بیر دێنێتەوە کە زۆر جار لە بازنە جیاجیاکانی کۆمەڵگای کوردەواریمان ئاماژە بە وتەیەکی بە نرخی بارزانیی نەمر دەکرێت کە لە دوای مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ ئاراستەی وەزیر و لێپرسراوانی ئەو دەمی کردبوو، کە بەنوێنەرایەتی کورد لە بەغدا دەست بەکاربوون: «بۆمبا و تۆپ و تانکی دوژمن نەیشکاندین هۆشتان هەبێ بە ترۆمبێل و کۆشک و کورسی و پلەوپایە دوژمن کێستان لێ نەهێنێ، با ئەوەی بە خوێن دەستمان کەوت بە دینار لێمان نەسێنێ».

وا لەم هەرێمەدا دووچینی لەیەک جودا بەدی دەکرێت و، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ شێوە و شێوازی ژیان و بیر کردنەوە و هەڵوێستیان بەرامبەر بەیەک و ڕووداوەکان لە یەکتر دەترازێن و، پانتایی و قولایی لە نێوانیاندا فراوان و زەقتر دەبن و، شان بەشانی ئەمەش وا چینێکی مشەخۆر و فرسەت تەڵەب بەسوود وەرگرتن لە بازانەی تەسکی دەسەڵات و نەبوونی بەدواداچوون و چاودێرییەکی یاسایی و ئیداری، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە پەرەسەندندایە و دۆخەکەش تەشەنە دەکات، گومان لەوەدا نییە کە واقیعی کوردستان و کێشەی کورد، کە خودی ئەم دیاردەیە لەسەر دواڕۆژی ئەزموونەکە دەبێتە مەترسییەکی دیکە.

نووسەر

چاپخانەی دەزگای

هەولێر - کوردستان
Aras Press
Kurdistan - Erbil